# وته درهوشاوهكان

(وته بەنرخەکانی ناو زۆرێك لە بەرهەمەکانی نوسەرو بیریاری کورد مامۆستا عەلی باپیر)




ئامادەکردنی
عەبدوڵڵا عەبدولکەریم

بسم الله الرحمن الرحيم



# وته دره‌وشاوه‌كان

وته به‌نرخه‌كانی ناو زۆرێك له‌به‌رهه‌مه‌كانی نوسه‌رو بیریاری كورد ماموٚستا عه‌لی باپیر



ئاماده‌كردنی:

عه‌بدوڵلا عه‌بدولكه‌ریم

## ناسنامەی کتێب


❖ ناوی کتێب : وتە درەوشاوەکان

❖ بابەتی کتێب: وتە بەنرخەکانی ناو زۆرێك لەبەرهەمەکانی نوسەرو بیریاری کورد مامۆستا عەلی باپیر

❖ ئامادەکردنی:عەبدوڵلا عەبدولکەریم

❖ نەخشەسازی بەرگ: عیرفان عوسمان

❖ نەخشەسازی ناوەوە: ئەکرەم فەرەیدون

❖ ژمارەی سپاردن: ٢٠٤١ ساڵی ٢٠٠٨ی وەزارەتی رۆشنبیری پێدراوە

❖ تیراژ : (١٠٠٠)دانە

❖ نۆبەی چاپ: چاپی یەکەم ٢٠٠٨ز

❖ چاپ: چاپخانەی ژێنەر

❖ نرخ: (٤٥٠٠)دینار

# پێشکەشە بە

- بە دایك و باوکی زیندە بە ڕێز و خۆشەویستم .
- بە هەموو ئەوانەی دۆستی ڕاستین و بەبێ لێکۆڵینەوە لە هیچ شتێك نادوێن .
- بەهەموو ئەوانەی خاوەنی وتەی جوان و بەنرخ و پرواتان.
- بەسەرجەم خوێنەرانی بەرهەمەکانی مامۆستا عەلی باپیر.
- بە خوشکە بەڕێز و خۆشەویستەکانم.




# سوپاس و پێزانین

لـە ژێـر ڕۆشـنایی ئـەو فەرموودەیـەی پێغەمبـەر (ﷺ) کەدەفـەمیٚ(هەرکەسـێك سوپاسی خەڵکی نەکات سوپاسی خواش ناکات) لێرەوە سوپاس و دەست خۆشی خۆم ئاراستەی سەرجەم ئەو بەڕێزانە دەکەم کە هاوکارییان کردووم لـەم بەرهەمـەدا بەهـەر جۆرێـك بێـت بەتایبـەت بـرای ڕۆژنامـەنووس و خۆشەویـست کـاك (دانـا موحەممـەد) کـەزۆر مانـدوو بـووە و هاوکـاری زۆری کـردووم لـەم بەرهەمـەدا خـوای گـەورە باشـترین پاداشـتی بداتـەوە وە پاشـان ئـەم بەڕێزانـە(( م.شـەریف وەرزێـر م.کامل عـەزیز- ڕۆژنامـەنوس کاك موحەممەد جـەمال-کاك ڕێبـوار موحەممـەد - کاك مەهدی -کاك عیرفان عوسمان -کاك صەلاح سیامێوی - پارێزەر دانا جوامێر چیمەن عەبدولکەریم -شەهلا رەحمان)).



# پێشەکی

**بەپێنوسی مامۆستا شەریف وەرزێر**

زمان پاراوی و وتەو دەربڕینی کورت و مانادار، جگە لەوەی نیشانەی گەورەیی و تواناو سەلیقەی ئەو کەسەن کە لێیەوە سەرچاوەیان گرتووە ، مایەی سەنگینی و دەوڵەمەندنی ئەدەبی میللەتەکەیی و بگرە تێگڕای فرۆڤایەتیشن، ئەو وتەو دەربڕینانەی وەك بەشێکی گرنگی ئەدەبی فرۆڤایەتی کە لەزمان ئەدیب و نوسەران و زاناو بیرمەندان و سیاسەتمەداران و دنیادیدانەوە یاخود وەك پەندی پێشینان دەربڕاون و هەن و لە زیاد بوونیشدان، دەبینین بەردەوام بەسەر زمانی خەڵکەوەن و دەگوترێنەوە و دەنووسرێنەوە و دەکرێنە هەوێنی مەبەست و دەربڕینەکان.

بێگومان ئەو وتەو دەربڕینانە کە لەسۆنگەو دەرەنجامی بیرکردنەوەو لێدوان و توێژینەوە، یاخود هەڵوێستی گەرماو گەرمی رووداوە جۆراو جۆرەکانەوە پەیدابوون ، خاوەنی تام چێژی تایبەتین و هەرگیز لەگەڵ قسەو گوفتاری ئاسایی دا ناچنە تەرازوویەکەوە .

**دیارە گەلی کوردیش وەك سەرجەم گەلانی جیهان، خاوەنی گەلێك لەو جۆرە وتەو دەربڕینە جوانانەیە کە لەلایەن کە سەدیارو جۆربەجۆرەکانەوە، یاخود پێشینانیەوە لە شێوەی نووسین یاخود زارەکی یەوە دەربڕدراون.**

جا یەکێك لەو کەسایەتی یە دیارانەی ئەمڕۆی نەتەوەکەمان کە پانتایی یەکی بەرچاوی لە گۆڕەپانی فیکری و سیاسی بەهۆی نوسین و لێدوان و وتار و شرۆڤەو هەڵسەنگاندنی بابەتە هەنوکەیی یەکان و هەڵوێست و هەڵوەستە لە هەمبەر رووداوو گۆڕانگارییەکاندا هەیە، مامۆستا (عەلی باپیر) ە، ئەو لەمانەی بەرهەم و هەڵوێستەکانیەوە بۆتە خاوەنی گەلێك وتەو دەربڕینی جۆراو جۆری ئەو تۆ کە راستەو خۆ سەرنجی خوێنەر و بیسەر بەلای خۆیاندا رادەکێشن و لەبارانیاندا هەیە بچنە ریزی وتەو دەربڕینەکانی ناودران و بیرمەندانەوە.

بێگومان بۆ هەر خاوەن بەهرەیەك ( نوسەر، وتار بێژ ، شاعیر ، هونەرمەند .... ) شێواز و رەچەیەك لەدەربڕین هەیە و ، ئەوەی لای مامۆستا عەلی باپیریش هەر لەسەرتای نووسین و

دەربڕینەکانی یەوە بەدی دەکرێ، زمان پاراوی و ڕۆشنی و دەوڵەمەندی یە لە وشەو دارشتن و ئەداکردندا .

کاتێکیش ئەم خەسلەتە سەرنجی کاك (عبداللە ) ی ئامادەکاری ئەم بەرهەمەی ڕاکێشاوە، هەستاوە بەجیاکرنەوەی زۆرێك لەو وتەو دەربڕینانەی مامۆستا عەلی باپیر کەلە دووتوێ ی بەرهەمەکانیدا هاتوون و بە گوێرەی وێکچوونیان ڕیزی کردون و پەراوێزی بۆ داناون.

دیارە لەم هەوڵەی نابراودا لانیکەم بۆ خوێنەرو بەتایبەت نەوەی نوێ ، خوێندنەوەیەکی خێرا بۆ خودی مامۆستا عەلی باپیر و وتەو دەربڕیەکانی مەیسەر دەبێ.

هیوادارم کاك عبداللە کە خۆی داوای نوسینی ئەم پێشەکیەشی لێکردم ئەم بەرهەمەی ببێتە سەرەتای کرانەوەی بیرو ئەندێشەیی و زمانی فکر و قەڵەمی بەڕووی بەرهەمی تریش دا بپژێ و ئایندەی گەشداربێ .

**شەریف وەرزێر**
**٢٠٠٨/٧/١١**



بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەکی

ئەو دەمەی ڕووم کردە دونیا فراوانەکەی کتێب، بەکتێبە دەروون نناسیی و کۆمەلآیەتی یەکان دەستم پێکرد، دواتر دەستم کرد بەخوێندنەوەی ئەو کتێبانەی لەسەر ئیسلام و فکرەکانی دەرەوەی فکری ئیسلامیی نوسراون، یەکەم کتێبێك لەو بوارەدا خوێندمەوە کتێبی (چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم) بوو لەسەرەتادا ئەم کتێبە بۆ من ئاسان نەبوو، چونکە سەرەتای دەست کردنم بوو بەخوێندنەوەی کتێب، بەلآم سوپاس بۆ خوا دواتر بۆم ئاسان بوو لەدوای ئەم کتێبە کەوتەمە خوێندنەوەی بەهەمەکانی مامۆستا عەلی باپیرو لەگەلَ ئەو کتێبانە دا بوومە هاوڕێ.

کاتێکیش دەستم کرد بەخوێندنەوەی بەرهەمەکانی مامۆستا عەلی باپیر شتێك کە زۆر سەرنجی ڕاکێشام لەهەموو بەرهەمێکی دا بەڕوونی بەرچاو دەکەوێت ئەویش بەکارهێنانی ووشەکاری و ڕستە سازی و دەربڕینی قوڵە لەنوسیندا بۆیە هەرکاتێك بەرهەمەکانی مامۆستام بخوێندایەوە قەڵەمێکم دەگرت بەدەستەوەو ئەوەی مەبەستم بوایە لەنێو دووکەوانەدا دیاریم دەکرد.

لەسەرەتادا ئەم کتێبە جگە لە ئەندێشەك هیچی تر نەبوو، بەلآم خوای گەورە کارەکەی بۆ ئاسان کردم و دەستی گرتم.ئێستاش کەبیر لەسەرەتای ئەم ئەندێشەیە دەکەمەوە و دەبینم بۆتە کتێبێك جگە لە ڕەحمەت و بەرەکەتی خوای گەورە بەهیچی تری نازانم هیوادام لەم ڕێگەیەوە توانیبێتم خزمەتێك بە ئیسلام بکەم و زۆرتر بە گەلەکەمی ئاشنا بکەم.

مامۆستا عەلی باپیر وەك سەرجەم نوسەرە ڕەسەنەکانی تر لەنوسیندا◆ شێوازی تایبەت بەخۆی هەیەو لە هیچ بەرهەمێکی مامۆستا نابینی مامۆستا بەرەمبەرکەی زەڕبی هیچ بکات

---

◆ هەروەها لە ئاخاوتن و وتارو گفتو گۆدا

و هیچ حسابێکی بۆ نەکات لەدیدی مامۆستادا هەموو شتێك بەئەندازەی خۆی نرخی هەیە و هیچ شتێك بەبێ بایەخ سەیر ناکات ڕەنگە ئەم وتەیە و هاوشێوەکانی باشترین بەڵگەبن لەو بارەیەوە کەدەڵێ "هیچ کەسێك نی یە هیچ شتێکی بە کەڵك نەیەت و، هیچ فکرەیەك نی یە هیچ شتێکی باشی تێدا نە بێت"[(١)]

یاخود لە گۆڤاری (ئاڵای ئیسلام) لەبابەتی (چەند خەمێکی کاری ئیسلامیی لەگەڵ مامۆستا عەلی باپیر)دا ئامادەکاری بابەتەکە دەڵێ (پرسیارکردن و گفتوگۆ لەگەڵ مامۆستا (عەلی باپیر) تام و چێژێکی تایبەتی هەیە ... تەماشا دەکەی هێمن و سینە فراوانە بەرامبەر هەر بیروڕایەکی تایبەت کە جیاواز بێ لەگەڵ بیروڕای ئەو لەگەڵ دیاریکردنی بیرو بۆ چوونی خۆیشی زەردەخەنە لەسەر رووی جیا نابێتەوە و ئەگەر کارەکەت هەرچەند کەمیش بێت ئەو نرخ داری دەکات)[(٢)]

شێوازێکی تری نوسین کە لەبەرهەمەکانی مامۆستادا[(٣)] بەرِوونی دەردەکەوێ بەجۆرێك هیچ بەرهەمێکی مامۆستا نابینی لەم شێوازە خاڵی بێت ئەویش بەکارهێنانی ووشەکاری و ڕستەسازی یە لە نوسیندا وەك لەسەرەتادا ئاماژەم پێدا، کە تەواوی ئەم بەرهەمە راستی ئەو خاڵەی سەرەوە دەخاتە ڕوو، خاڵێکی گرنگ هەیە کە جێگەی ئاماژە پێدانە ئەوەیش ئەوەیە، ئەوە هەر منیم کە باس لەو ڕاستییە بکەم لێردا تەنها ئاماژە بەچەند قسەیەکی (نیازی حمە عزیز ) [(٤)] سەرۆکی ڕۆشنبیری ئاسۆس دەکەم لەبابەتی (ئەوەندەی من مامۆستا عەلی باپیر بناسم ) [(٥)] لە شوێنێکدا دەنوسێ "عەلی باپیر زمانێکی کوردی تەڕو پاراوی ڕەسەن دەزانێ .. شارەزایی لە وشەی کوردیدا بەقەوارەی قاموسێکی گەورەی

---

(١) چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم سەنجێکی واقیعیانەو هەڵسەنگاندنێکی شەرعییانە –چاپی چوارەم –لا-٢٣٣

(٢) گۆڤاری (ئاڵای ئیسلام) ژمارە (یەک) بابەتی (چەند خەمێکی کاری ئیسلامیی) لەگەڵ مامۆستا عەلی باپیر –لا-٢٢

(٣) لێرەدا قسەلەسەر شێوازەکان، یاخود تایبەتمەندیەکانی نوسین لەبەرهەمەکانی مامۆستا ناکەم، ئەگەر تەمەن باقی بوو إنشاالله ئەوە هەڵدەگرین بۆ جێگایەکی تر.

(٤) یەکێکە لە ڕۆشنبیرە عەلمانی یەکان جیاوازی فکری گەورە لە نێوان ئەو مامۆستا هەیە، بەڵام وەك خۆی لەبابەتی ناوبراو دا دەڵی "خۆم گەواهی دە دەم بیرڕای منی قبوڵ نەبووە، بەڵام هەستم نەکر دووە قینی لێم بێ و بم بوغزێنێ. دیارە ئە خەسڵەتەش لەکەسانی وەك ئەودا دەگمەنە .

(٥) ڕۆژنامەی کۆمەڵ –ژمارە (٨٢)

کوردی یە .."

پاشان بەردەوام دەبێت و دەنوسێت " شارەزاییەکی باشی لە کەلەپورو زمان و ئەدەب و فۆلکۆلۆری کوردی ئیدیۆم و ڕستە سازی زمانی کوریدا هەیە، دڵنیام ئەم مرۆڤە ئەگەر خۆی بۆ گوتار و کتێبی ئیسلامیی تەرخان نەکردبا یەکێك دەبوو لەوانەی باشترین توێژەرەوەن لەبواری زانستەکانی زمان و ئەدەب دا".

## چەند تێبینی یەکی گرنگ

١.لە ژێر ڕۆشنایی ئەو دەقە شەرعییەی کەدەڵێ (أقوال العلماء يستدل لها ولايستدل بها) واتە:(قسەی زانایان بەبەڵگە ناهێندرێتەوە بەڵکو بەڵگەی بۆ دەهێندرێتەوە) دەڵێم "تەواوی ئەم ووتانەی لەم کتێبەدا هاتوون تێگەیشتنی مامۆستا (عەلی باپیرە) بۆ ئیسلام نەك خودی ئیسلام"، لەبەر ئەوە با هیچ کەس لەخۆی نەکات بەدەقێکی شەرعی و بەموو لێی لانەدات، چونکە ئەوکات م.عەلی باپیر گوتەنی "توشی دەردی دین لێ گچکە بونەوە دەبین" ئەو کاتیش عەقڵمان لەبری فراوان بوون، لەمەودایەکی کورت دا کە تەنها تێگەیشتنی کەسێکە بۆ ئیسلام کورت هەڵدێنین.

٢.زۆرێك لەوتەکانی نێو ئەم کتێبە تاڕادەیەك درێژن، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەودەقەی من مەبەستم بووە بەوشێوەیە لەو کتێبەدا هاتووە هەر بەوشێوەیە گواستومەتەوە و هیچ دەستکاری یەکم نەکردووە جگە لەچەند جێگایەك کەلەشوێنی خۆیاندا ئاماژەی بۆ کراوە .

٣.لەهەندێ وتەدا سێ پیتی (ش، یش) لابراون کەئەم لابردنە لەماناو نێوەرۆکی وتەکانی نەگۆڕیوەو تەنها بۆ جوانکاری یە.

٤. بۆ تێگەیشتنی هەر وتەیەك و بەرچاوڕوونی زیاتر لەوتەکانی نێو ئەم کتێبە ، خوێنەری بەڕێز: دەتوانی بگەڕێتەوە بۆ ئەو سەرچاوەیەی کەلە پەراوێزەکاندا ئاماژەیان بۆ کراوە، بۆ ئەوەی وتەکان وەك ئەوی هەیە وەربگیرێ نەك وەك ئەوەی کەخەڵکێك پێی خۆش بێت و بەئارەزووی خۆی تەفسیری جیاواز بۆ وتەکان بکات، لەبەر ئەوە مامەڵەی ڕاستەو خۆ بۆ زۆرێك لەوتەکانی نێو ئەم کتێبە تاڕادەیەك نەگونجاوە و جۆرێکە لەخۆ هەڵخەڵەتاندن.

٥. وتەکانی نێو ئەم کتێبە جگە لە بەرهەمەکانی مامۆستا خۆی لە هەندێ دیداری

ڕۆژنامەنووسی وتاری نوسراو چاو پێکەوتن وەرگیراون هەڵبەتە تەنها ئەوانەی کەبەر دەست کەوتن و زۆر بەدوایان دا نەگەڕاوم کە بەدڵنیایی یەوە زۆر لەوەی کەبەرهەم هاتووە زیاتر دەبوو، ئەمە جگە لەوەی کە مامۆستا خاوەنی چەندین ووتاری ترە کە تا ئێستا نە خراونەتە سەر کاخەز کە زۆر ینەیان لێوان لێون لەوتەی دەروشاوەو پڕ ووشەکاری و ڕستەسازی.

٦. ئەودابەشکردنەی بۆ وتەکان کراوە بەپێی تێگەیشتنی خۆم بووە بۆ وتەکان، بۆیە هەرکەسێك تێبنی و پێشنیاری لەسەر ئەم بەرهەمە و شێوازی دابەشکردنی وتەکان هەبوو دەتوانێت لەڕێی ئەو ئیمێڵەی لەخوارەوە ئاماژەی بۆ کراوە تێبینی و پێشنیارەکانی ڕەوانە بکات بەسوپاسەوە وەری دەگرم و بەپێی شیاویان کاری لەسەر دەکەم.

٧.ئەم بەرهەمە کەهەوڵێکە بەئاراستەی خزمەتکردن بەبەرهەمەکانی مامۆستا عەلی باپیر هیواخوازم زۆرتر هانی مامۆستا بدات لەنوسینەکانیدا قوڵتر ببێتەوەو لەبەرهەمەکانی داهاتویدا داهێنانی جوانترو باشتر بکات، وەهەروەها هەڵهێنجان(إستنباط)ی ورد و ڕون و فراوانتر لەدەقەکانی قورئان و سوننەتدا بکات.

لەکۆتایدا لە خوای گەورە و باڵادەست داواکارم ئەم بەرهەمە بکاتە هۆکارێك بۆ زیاتر ناساندی ئیسلام و ڕوونکردنەوەی ڕاستییەکانی، وە داوای دوعای خێر لەو کەسانە دەکەم کە لەم کتێبە بەهرەمەند دەبن وەخوای گەورە لەهەموومان خۆش بێت و بەبەهەشتی بەرین و نەبڕاوەی خۆی شادمان بکات أمین.

**عبدالله عبدالكريم**

٢٠٠٨/٦/٢٦

**سلێمانی**

a89a59@yah



١.وەدی هێنراوەکـان تێکـڕا هـەروەك چـۆن بـۆ وەدی هاتنیـان پێویـستیان بـە خـوا هەیـە، بـۆ بەڕێوەچوون و بەردەوامیشیان بەهەمان شێوە ![1]

******************************

٢.مرۆڤێك کە جێ نشینی خوا و سەرقافڵەی کاروانی بونەوەر و سەرتۆپی کائینات و هەڵبـژێردراوی خوایە، دەبێ بەرهەڵدای وڵاتی کرابێ و خەمی لێ نەخورابێ و هیچ حیسابی بۆ نەکرابێ؟![2]

******************************

٣.ئایا ماقووڵە خوای میهرەبان و خاوەن سۆز بەڕێزترین خوڵقێنراوو جێ نشینی خۆی بـەجۆرێکی وا بخولقێنێ کە نەیناسێ؟![3]

******************************

٤. لە دروستکرانی بوونەوەردا لەخوا بەولاوە کەس پەرێزی دیار نیەو لە بینـای بوونـەوەردا غـەیری پەروەردگار هیچ وەستایەك چەکوچی خولْقانی نەوەشاندوە ![4]

******************************

٥.جـوولآنی بەتـەنێ بـۆ ئـەنجام درانـی شـتێکی ویـستراوو سـوود بـەخش، بـەس نیـە و پێویـستی بەکەسێك هەیە ڕێنمایی بکاو ڕێڕەوێکی ڕاستی بۆ دیاری بکات![5]

******************************

٦.هەر کاتێك لەهەر جێ یەکدا ڕێك و پێکی و وردەکاری لەشتێك دا بەدی کرا ناچار دەبین وەسـتاو نەخشەدانەر و سەرپەرشتی کەرێك بۆ هاتنەدی ئەو شتە بڕیار بدەین![6]

******************************

٧.فەرز نیە لەسەر بەندەکان کە سوپاسی خواوەندی مەزن بکەن کە بەڕێوەبردنی ئەم جیهانەی بە ئینسانی بیر کورت و نەزان نەسپاردوە و هەر بۆ خۆی سەر پەرشتی دەکات؟![7]♦

---

[1] پوختەیەك دەربارەی ئیسلام لەژێر ڕۆشنایی سورەتی فاتیحە دا –چاپی دووەم –ساڵی ٢٠٠٦ زلا–١٠

[2] سەرچاوەی پێشوو لا–١٢

[3] سەرچاوەی پێشوو لا– ٤٧

[4] سەرچاوەی پێشوو لا–٥١

[5] سەرچاوەی پێشوو لا–٥٥

[6] سەرچاوەی پێشوو لا–٦٥

[7] سەرچاوەی پێشوو لا–٦٩

٨. بەعزە کەسێکی بیر کورت و ساولکە دەڵێن: ئێمە وەختێك بڕوا بەخوای میهرەبان دێنین کە بتوانین بی هێنینە بەر خەیاڵ و بزانین چۆنە ! ! بەڵام ئەوانە وادیارە نە خۆیان دەناسن و نەموڵکی خوا، دەنا ئەوانە ئەگەر بزانن مێشکی وان چەند چووکەڵەیە و موڵکی خوا چەند پان و بەرینە کە بەهیچ کلوجێك ناتوانن تەنانەت بەشێکی موڵکی خوا بەخەیاڵی خۆیان دابنێن چ جای هەمووی بەهیچ ڕەنگێك هێندە خۆیان لێ نەدەگۆڕا کەلافی والێ بدەن و ئیددیعای وابکەن ![1]

*******************************

٩. هەروەك چۆن مەحاڵە نە ڕەگ و ڕیشە بەبێ لق و پۆپ و نەلق و پۆپ بەبێ ڕیشەو ڕەگ وجوودیان ببێ هەر بەو تەرزەش نەبیروبڕوا بەبێ کردارو نەکردارو ڕەفتار بێ بیروبڕوا نایەنەدی![2]

*******************************

١٠. لەسۆنگەی تێوە ڕامانێکی نا ئیسلامیانەی هەڵەوە لە ژیان و بوونەوەر، مرۆڤە ڕەش بینەکان دووچاری ڕەش بینی دەبن و دنیایان لەپێش چاوان تاریك دەبێ، واتە هەروەك چۆن بابای میزاج تێك چوو ئاوی شیرین و زوڵاڵی بەزاری تاڵە بابای بیروبڕوا تێك چووش بەهۆی لاملی لەئیسلام ژیانی دنیای – کە گەورەترین بەهرەی خوایە – لەبەر نیگا دەبێتە دێوەزمە و بەجارێکی سەری دنیایەی لێ وێك دێتەوە ![3]

*******************************

١١. هەر بیروباوەڕێك پەیوەندی نێوان خوا و ئینسان بەغەیری ئەو شێوەیە دیاری بکات کەئیسلام دەیلێ بیروباوەڕێکی پووچ و هەڵەیە و لەگەڵ واقیع دا ناسازێ، جائەو پووچی و هەڵەیی و لەگەڵ واقیع دانەسازانەش بەڵگەی ئەوەیە کەخوا نەی ناردوە با لەنێو خەڵکیش دا بەناوی ئاییني خواوە ناسرابێ![4]**

---

* ئەم ووتەیە لەدوای هێنانەوەی چەند نمونەدێ لە گەردوون دا کە ئاماژە بە گەورەیی دەسەڵات و ڕێکوپێکی دروستکراوەکانی خوای گەورە دەکات، کەمرۆڤ سەری سوڕدەمێنێ لەو ڕێکو پێکی یە لەڕادەبەدەرەی لەبوونەوەرو باقی دروستکراوەکانی خوای گەورەو باڵا دەستدا بەدی دەکرێت. ئامادەکار

[1] سەرچاوەی پێشوو لا-٧٣

[2] سەرچاوەی پێشوو لا-١١٣

[3] سەرچاوەی پێشوو لا-١٤٢

[4] سەرچاوەی پێشوو لا-١٥١

** لێرەدا مەبەستم لەو ئاین و مەزەبانەیە کەئینسان دەسکاری کردوون و شێواندوونی و وای لێ کردوون کەلەگەڵ واقیع دا نەسازێن وەك: جوولە کایەتی و مەسیحایەتی.

١٢. ههر گهل و نهتهوهیهك بروا بهقیامهت و زیندوو بوونهوهى لهنێودا نهبوو وهك زهوى یهكى شۆرهك و سوێر و بێ تام هیچ جۆره درهختێكى ڕهوشت بهرزى و پیاوهتى و فیداكارى وخزمهت كردن و ... هتدى تێدا ناڕوێ، چونكه ئهم خهسڵهته مهعنهوى یه بهرزانه كوڵاڵك نین لهسهر زبڵى بڕوێن و زهمینهیهكى پاك و پڕتام و چێژیان گهرهكه، ئهویش بروا بهخوابوون و بروا بهدواڕۆژ و ههست كردنه به بهرپرسیارى! [1]

*******************************

١٣. مهرج نیه ههتا نوێژ بۆ یهكێك نهكهى و ڕۆژووى بۆنهگرى و كڕنووشى بۆ نهبهى به پهرستراوت نهژمێررێ با لهههموو كاروبار و ههستان و دانیشتنێكى ژیانیشت دا پابهندى بهرنامهو گوێ لهمستى قسهو ڕێ نموونى یهكانى بى!! [2]

*******************************

١٤. ڕهگ و ڕیشهى عهقیدهى ئیسلامى و خواپهرستى ههبوونى مهحاڵه بهبێ لق و پۆپ وچرۆى كردهوه و ئیلتیزام! [3]

*******************************

١٥. نهمامى بیر و بروا و عهقیده و ئیمانى ئیسلامى له زهمینهى ههردڵێك دا ڕواو چهقهرهى كرد و ڕهگ و ڕیشهى داكوتان یهكسهر بۆ چهسپاندن و سهلماندنى ههبوونى لهو شوێنهدا لق و پۆپ و چرۆ و گهڵاى ئاكار و ڕهوشت و كردهوهى بڕوادارانه دهكاته ههویهو شایهتى بوونى لهوێ دا! [4]

*******************************

١٦. ههروهك چۆن لهههر جێیهك ڕهگ و ڕیشه و بنهماى دار و درهختان دیتران و لهگهڵیان دا قهد و لق و پۆپ و گهڵا نهدیتران بهڵگهى بێ خێرى و وشك و برینگى ڕهگ و ڕیشهكانه بهههمان شێوهش له ههرئینسانێك دا ئیدیعاكردنى ههبوونى ئیمان و بروا دیترا و كردار و ڕهفتارى موسڵمانانه و بڕوادارانه نهدیترا بهڵگهیه بۆ قرپۆكى و بێ خێرى و بێ گیانى ئهو ئیمان و بڕوایه! [5]

---

[1] سهرچاوهى پێشوو لا-١٨٩

[2] سهرچاوهى پێشوو لا-٢٠١

[3] سهرچاوهى پێشوو لا-٢٢٢

[4] سهرچاوهى پێشوو لا-٢٢٣

[5] سهرچاوهى پێشوو لا-٢٢٣

١٧.کەسێك لەبیرو باوەڕەکەی دڵنیا بێ و قەناعەتی تەواوی بەڕاستی یەتی هەبێ، بێ باکانە دەچێتە نێو دەریای بیرو ڕێبازەکانی دیکەو هەوڵی ناسینیان دەدات، بەڵێ خاوەن بیروباوەڕی ڕاست وەك نەڕەشێر دەچێتە نێو دارستان و جەنگەڵی پڕ جەنجاڵی بیردۆزەکان، بێ ئەوەی لەهیچ شتێك بسەڵمێتەوە، چونکە وەك نەڕەشێرەکە توانا و هێزی خۆی هی خەڵکیشی ناسیوە و دەزانێ هەتا کوێ بڕدەکا![1]

*******************************

١٨.ئێمە مادام هەر ناچارین پەنا بەرینە بەر شتێکی ئەزەلی تاکو دروست کرانی ئەم بوو نەوەرەی پاڵ دەینەلا، ئایا ماقووڵ تر وێ چووتر نیە لەباتی ماددەیەکی بێ گیانی کەڕی بێ ئیرادەی بێ عەقڵی کوێری لاڵی ناتوانا، بڕوا بە پەروەردگارێکی خاوەن ژیان و ئیرادە و زانا و بەدەسەڵات و بیسەر و بیناو گۆیاو کاربەجێ و بەبەزەیی بێنین؟!واتە ئایا کامیان – لەخوا و ماددە– لێوە شاوەترن بۆ بەدی هێنەرایەتی ویەروەردگارائیتی؟![2]

*******************************

١٩.ئیمان عەقیدە لە ئیسلام دا دەوری بناغە(أساس ) دەبینێ و بێگومان بەبێ بناغەش دیوار دانانرێ و ئەگەر داشبنرێ بێ هێز و لەرزۆك دەبێ و بەزوویی دەڕوخێ و هەرەس دێنێ، هەروەها هەتا بناغە مەحکەمتر و دامەزراوتر بێت ئەو دیوارەش کە لەسەری هەڵدەچنرێ قایمترو نە لەخشاو تر دەبێ![3]

*******************************

---

[1] سەرچاوەی پێشوو لا–٤١

[2] سەرچاوەی پێشوو لا–٥٨

[3] خواناسیی ئایین ئیمان –ڕاستییەکان ئیسلام دەدرەوشێنەوە ئەفسانەکانی ڕێچکان دەپووچێنەوە–چاپی یەکەم ساڵی ٢٠٠٠ ز–لا–١٤

تێبینی: ئەم کتێبە واتە:–خواناسی ئایین ئیمان – لەسەرەتادا ناوی (گەورەترین ڕاستی) بووە ، وەساڵی ١٩٨٨ز نوسراوە، بەڵام بەهۆی وون بوونی بەشێك لەو کتێبە لە سوتانی ماڵی مامۆستا لەساڵی ١٩٩٣ز ئەو بەشانەی کەمابون کۆکراونەتەوەو ئەو کتێبەیان لێپێك هاتووە لە پێشەکی کتێبی ناوبراوەوە وەرگیراوە ئامادەکار.

٢٠.(ئیمان) دژی (ستەمە)، بەڵام (کوفر) و (ستەم) دوو کاڵەکی برکێکن![1]

******************************

٢١.(ئیمان ) و (زانیاری) و (کوفر) و (نەزانی) پێکەوە جۆش دراون نەك بەپێچەوانەوە ![2]

******************************

٢٢.بڕوا بەخوا بوون و خواناسیی خەسڵەتێکی ڕەسەن و بنچینەیی یە لەژیانی مرۆڤداو یەکێکە لەپێکهێنەرە بنچینەییەکانی سروشت و کەسایەتی ئینسان و خەسڵەتێکی فیطری و خوارسکە و سروشتی پاك و عەقڵی ساغ دا خوازی دەکەن![3]

******************************

٢٣.ڕێبازی تێڕوانین و بیرکردنەوەی هەر بیروباوەڕ(ئیدۆلۆژی)ێك بەردی بناغەی ئەو بیروباوەڕەیە: کەواتە: هەر مەترسییەك ڕوو بکاتە ئەو بنچینەو بناغەیە، ڕووشی کردوّتە سەر لەبەری بەشەکانی دیکەی ئەو بیروباوەڕە، ئاخر ئاشکرایە بەڕاتەکێنران و لەقێنرانی بناغە، دیواریش ڕادەتەکێ و دەلەقێ و، بەڕووخانیشی دەڕووخێ![4]

******************************

٢٤.بڕوابوون بەیاسای هۆکاری=(گەڕان و پشکنین ⟵ وەدەست هێنانی زانیاری دروست بوونی ژیار و شارستانەتی![5]*

******************************

٢٥.مادام هەموو پەیدا بووێك پەیداکەرێکی هەبێ و هیچ شتێك کەخاوەنی بوونێکی زاتیی نەبێ بەبێ بەدیهێنەر دروست نەبێ ئەم بونەوەرە چونکە هەبوو نیە و پەیدابوویە، حەتمەن دەبێ پەیداکەر و بەدیهێنەرێکی هەبێ، ئەویش خوای پەروەردگارە ![6]

---

[1] سەرچاوەی پێشوو لا-١٨

[2] سەرچاوەی پێشوو لا-١٨

[3] سەرچاوەی پێشوو لا-٢٤

[4] سەرچاوەی پێشوو لا-٧٢

[5] سەرچاوەی پێشوو لا-٩١

[6] سەرچاوەی پێشوو لا-٩٦

*دەقی یاسەکە (هەر پەیدا بووێك پێویستی بەپەیدا کەرێك هەیە و هیچ پەیداکراوێك بەبێ پەیداکەر نابێ )

تێبینی: چەند دەقێك بۆ پێناسەی یاسای هۆکاری هەیە، کە هەموویان لەناوەرۆکدا یەك شت دەگرنەوە..ئامادەکار

٢٦. ڕاستی یاسای ڕێك و پێکی[١] +هەبوونی ڕێکوپێکی لەبوونەوەردا= سەلماندنی هەبوونی خوای پەروەردگار![٢]

*******************************

٢٧. لە ڕاستیدا من هەر جارێکی هەڵوێستی بێبڕوایان سەبارەت بەخوای میهرەبان دەبینم، هەڵوێستی سپڵە و بێ نمەکانەی کۆمەڵە ڕووەك و درەختێك دێتە بەرچاوی خەیاڵ کە بەوپەڕی بێ شەرمییەوە، بێ منەتی و بێ باکیی خۆیان بەرامبەر بەو خۆرە پیشان دەدەن – کە بەبێ تیشکی وی زەرد هەڵدەگەڕێن و ئیشك دەبن– دەڵێن: ڕۆژێك لە ڕۆژان شتێکی وەك خۆر ئێمەی نەژیاندووە و خۆراك و تیشکی نەداوینێ !!

وە هەڵوێستی کۆمەڵە گلۆپێکم دێتە بەر چاوی خەیاڵ کە دەربارەی بوونی ئەو دینەمۆیەی ڕووناکی لێوە وەردەگرن، لا موجیمی و سەرەخەرییەکی بەدفەڕانە دەکەن و خۆ هەڵدەکێشن و دەڵێن: جا ئێمە کەنگێ حەوجێی غەیری خۆمان بووین! ئەگەر گریمان هەر حەوجێش بووین حەوجێی [٣] ئەو پلاك و وایارە بووین کە پێمانەوە پەیوەسن و هیچی دیکە !!

وە هەڵوێستی منداڵێکی سپڵە و لاسار و نا لەبارم دێتە بەرچاو، کە لەڕووی بابی– ئەو بابەی هۆی پەیدا بوون و بەخێو کران و فراژوو بوونیەتی – هەڵ دەگەڕێتەوە و بێ شەرمانە بەڕوویدا هەڵدەشاخێ و وەك نێرە قەلێك خۆی فش دەکاتەوە و دەڵێ: کوا تۆچت بۆ من کردووە؟!ئەگەر تۆش نەبای هەردەبووم و دەژیام و هیچ منەتم بە تۆ نیە!

وە هەڵوێستی ئەو قوتابی یە پێ نەزان و بێ وەفایەم دێتە بەرچاو، کە پاش ئەوەی مامۆستایەکەی بەو پەڕی دڵسۆزی و میهرەبانی و خزمەتگوزاری یەوە فێری دەکاو باری دێنێ و لە گۆمی نەزانی دەری دێنێ، بەڕوو قاییمیەوە لووتی لە عاسمانی دەکا و خۆی پۆز دەکاو بەمامۆستایەکەی دەڵێ: ئەوەی کە دەیزانم فێری بووم هیچی لە تۆ نازانم و بۆ خۆم بەهەوڵ و ڕەنجی خۆم فێری بووم و بێ ئەوەی تۆ هیچ دەورت بێ ئەم کورە دەرچووم!!

---

[١] دەقی یاساکە ڕێکو پێکی بەبێ ڕێکخەر نایەتەدی .

[٢] سەرچاوەی پێشوو لا–١٦٠

[٣] بیروبڕواو لەخوا یاخیبوانیش وەك ئەو گلۆپانە هێندە بیر کورت و دڵ کوێرن لە جیاتی خوا، سوپاسی ئەو ڕۆژە و زەوی و ئاو و هەوایە دەکەن کە ڕۆزی وبژێویان بۆ دابین دەکەن! نازان کەدەستی بەزەیی و میهرەبانی خوا لەو دیو ئەو ڕۆزی و بژێوەوەیە و ئەو ڕۆژو زەوی و ئاو و هەوایە کە دەیانبینین وەك کارەبا بەس ئامراز و هۆی گەیاندنن!!

بـه‌ڵكو هه‌ڵوێـستی بێبڕوایـان وه‌ك هه‌ڵوێـستی هـه‌موو ئه‌وانـه وێكـڕا و خـراپتر به‌دفه‌ڕانـه و بـێ وه‌فایانه‌تریشه و گه‌لێك له‌و لاوه تریشه![1]

******************************

٢٨.هه‌روه‌ك چۆن ئه‌و نه‌مامه‌ی ڕه‌گ و ڕیشه‌كانی به‌ناخی زه‌ویدا ڕۆده‌چن دوایی قه‌د و لق و پـۆپی په‌یدا ده‌بن و، قه‌دو لق پۆ په‌كانی ده‌بنـه شایه‌دیه و به‌ڵگـه‌ی سـه‌لماندنی بـوونی، هـه‌ر كـاتێكیش خواپه‌رستی و خوا به‌یه‌كگرتن ڕه‌گ و ڕیشه‌ی لـه زه‌وی دڵ و ده‌روونـی كۆمه‌ڵـه مرۆڤێكدا داكوتـا، وه‌ك ئه‌نجام و به‌رهه‌مێكی حه‌تمی و سروشتی، ئه‌و بیروبـاوه‌ڕه خواییـه هـه‌وڵی سـه‌لماندنی بـوونی خۆی ده‌دات له ڕێی ئه‌و كرده‌وه و ئاكار و چالاكی یه گیانی و سیاسی و كۆمه‌لآیه‌تییانه‌وه كـه ئـه‌و كۆمه‌ڵه ئینسانه ئه‌نجامیان ده‌ده‌ن و، ده‌بنه لق و پۆپ و واقیعێكی زیندوو به‌رچاوی ئه‌و تێڕوانین و بیروباوه‌ڕه‌ی كه له‌دڵ و ده‌روونآندا بۆته ڕه‌گ و ڕیشه‌یه‌كی ڕۆچوو ودامه‌زراو![2]

******************************

٢٩.ئایینی ئیسلام وه‌ك دره‌ختێك وایـه كـه له‌دووبه‌شـان پێـك دێ، یه‌كـه‌م: ڕه‌گ و ڕیـشه، دووه‌م: قه‌دو لق و پۆپ، جا بیروباوه‌ڕ (عقیده) له جێی ڕه‌گ و ڕیشانه و یاسـاو ده‌ستوره‌كانیش لـه جێـی قه‌د و لق و پۆپانن![3]

******************************

٣٠.هـه‌روه‌ك چـۆن شـتێكی نـاواقیعی و نـه‌گونجاوه، كـه بناغه‌یـه‌كی خـوارو خـێچ و ڕزیـو بتـوانێ دیوارێكی پته‌و و به‌رز هه‌ڵچووی ڕێك ڕاگیربكا، یان ڕه‌گ و ڕیشه‌یه‌كی بێ هێـز و كـه‌م تـین، بتـوانێ قه‌د و لق و پۆپێكی به‌رز و چڕ و پڕ هه‌ڵگرێ، مه‌حاڵ و نه‌گونجاویشه كه بڕوایه‌كی سه‌ركێڵ و خـوار و ناته‌وا و، بتوانێ جۆره پابه‌ندی و گه‌ردنگه‌چی و جموجووڵ و چالاكییه‌كی تێر و تـه‌واو بـه‌رفراوان به‌رهه‌م بێنێ، چونكه (كاریته له‌كفری هه‌ڵناكه‌وێ) و (گۆزه‌چی تێدا بێ هه‌ر ئه‌وه‌ی لێ ده‌ڕژێ)![4]

******************************



[1] سه‌رچاوه‌ی پێشوو لا-١٦٣-١٦٤

[2] سه‌رچاوه‌ی پێشوو لا-١٩٤

[3] سه‌رچاوه‌ی پێشوو لا-٣٠٦

[4] سه‌رچاوه‌ی پێشوو لا-٣٠٦-٣٠٧

٣١.هەروەك چۆن دارتووێکی بێ بەر (توو) ئەگر بەدرەختێکی (زڕ) و بێ خێر دادەنرێ، بڕوایەکی بێ کردار و ڕەفتاری بڕوادارانەش، بە بڕوایەکی زڕو (هەر بە ناو بڕوا ) دا دەنرێ![1]

********************************

٣٢. دەتوانین بڕوا بەخوا بوون وەك دینەمۆو سەرچاوەیەکی کارەبایی بچوێنین، وە یاساو دەستورەکانی ئیسلامیش بەو گڵۆپانە بچوێنین کە بەهۆی ئەو دینەمۆیەوە رووناك دادێن و، بەبێ وی خامۆش دەبن و تاریك دادێن![2]

********************************

٣٣.هەروەك چۆن ئینسانێکی تێرو تەواو و واقیعی و زیندوو لە گیان و جەستە پێك دێ، ئیسلامێکی کامڵ و تەواو و واقیعی و زیندووش لەبڕواو کردەوە( الأيمان والعمل) پێك دێ![3]◆

********************************

٣٤.بڕوایەك نەبێتە هۆی هێنانەدی کردەوان و خاوەنەکەی بەرە و خوا نەجوولێنێ ، بە بڕوایەکی (هەر بەناو بڕوا) دادەندرێ و لە تەرازوی بەرنامەی خوادا سەنگ و کێشی نیە![4]

********************************

٣٥.بڕوا بەخوا بونێك مرۆڤ ڕانەتەکێنێ و، لە خەوی هەڵخزاوی و بێ ئاگایی وەخەبەری نەهێنێ و، لەبیابانی گەرم و ئیشکی تاوانباری و لە دەشتی قاڕو بێروونی بەد ئاکاری دەری نەهێنێ و، بە لەباری دەستی نەگرێ و بەرەو کانیاوو سەرچاوەی روون و سازگاری گوێڕایەڵیی و فەرمانبەریی نەیهێنێ، هەر بەناو و بە ڕواڵەت بڕوا بەخوا بوونەو لەواقیعدا نەبوو (معدوم) ێکی هەڵگری دروشمی بوونە![5]

********************************




[1] سەرچاوەی پێشوو لا-٣١٩

[2] سەرچاوەی پێشوو لا-٣٤٠

[3] سەرچاوەی پێشوو لا-٣٤٢

◆ هەر بۆیەش لە زۆربەی ئایەتەکانی قورئانی بەڕێزدا هەرجارێك باسی بڕوا کرابێ بە دوایدا باسی کردەوەش کراوە، وە ئەو ئایەتانەی کەدەقی وشەی (بڕوا وکردەوەی چاك ( الآيمان والعمل الصالح ) یان پێکەوە تێدا باس کراوە دەری (٦٨) ئا یەتن.

[4] سەرچاوەی پێشوو لا-٣٤٦

[5] سەرچاوەی پێشوو لا-٣٤٨

٣٦.ئـەو بـڕوا و خواناسـییەی کـە بـەس لـەڕێی دڵ و دەروونـەوە دەسـتگیر دەبـێ و، ژێـری و بەڵگەهێنانەوە دەوری تێدا نابینێ، لە جوغزێکی تەسکی کەسیدا کورت هەڵدێ و ناتوانرێ بخرێتە بەرچاوی خەڵکی دیکە ![1]

******************************

٣٧.بڕوا بەخوابوون بولبولێکی ئازادە و ئامادەنیە لە قەفەزی دیلی و کۆیلەییدا بژی، کەسێکیش ڕیشمەی نەفسی بەدەست شەیتان بێ و گیرۆدەی خراپە و تاوان بێ و، بەندەی ئارەزووەکانی بێ، قەد ناگونجێ و ڕێ ی تێ ناچێ بڕوا و خواناسیی میوان بێ![2]

******************************

٣٨.بڕوا بەخوابوون باڵندەیەکی دەنگ خۆشە و لەنیو گوڵ و گوڵزاری کردەوە و ئاکارە جوانەکاندا نەبێ و، لەسەر درەختی خەسڵەتە بەرزەکان نەبێ نانیشێ و ناچریکێنێ![3]

******************************

٣٩.بڕوا بەخوا بوون گوڵێکە لە زەوییە بڵیند و رەق و ئیشکەڕۆیەکاندا سەر هەڵناداو، تایبەتە بەو جۆرە زەوییانەی کەنزم و گەردن کەچ و نەرم و نیان و شێدارن![4]

******************************

٤٠.بڕوا بە خوابوون ماسییەکی سروشت پاك و چاو ڕووناکە و قایل نابێ لە ئاوی گۆڕاوی زۆنگەکاندا ژیان بەرێتە سەرو، دایم و دەرەم بەدوای ئەو سەرچاوە و ڕووبارە پاکانەدا وێڵە کە ئاویان شیرین و سازگارەو، ڕوون وەك چاوی قرژاڵە ![5]

******************************

٤١.بڕوا بە خوابوون میوانێکی خانەدان و شەرم بەخۆ و نەفس بەرزە و، بێزی نایەت میوانی هەموو ماڵێکی ناکەس بەچەو ڕژد و چرووك و چاو لەنان بێ![6]

---

[1] سەرچاوەی پێشوو لا-٣٧٤

[2] سەرچاوەی پێشوو لا-٤٢٤

[3] سەرچاوەی پێشوو لا-٤٢٥

[4] سەرچاوەی پێشوو لا-٤٢٥

[5] سەرچاوەی پێشوو لا-٤٢٥

[6] سەرچاوەی پێشوو لا-٤٢٥

٤٢.بڕوا به‌ خوا بوون مێشه ڕه‌شه‌یه‌كی پیس نیه‌، به‌سه‌ر دڵ و ده‌روونانه‌وه‌ بنیشێ كه‌ پڕ له‌ ده‌یان خوو و خه‌سڵه‌تی پیستر له‌چڵم و به‌ڵغه‌من، به‌ڵكو مێشه هه‌نگوینه‌یه‌كی بێگه‌رده‌، عه‌ودالی ئه‌و دڵ و ده‌روونه‌ پاكانه‌یه‌ كه‌پڕ پڕن له‌ خوو خه‌سڵه‌تی په‌سه‌ندی وه‌ك گوڵ و گیای بۆن خۆش و دره‌ختی خاوه‌ن میوه‌ی به‌تام و شیله‌ و تام و بۆنیان ده‌مژێ![1]

******************************

٤٣.پێویسته‌ هه‌ركه‌م و كوڕی و ناته‌واوی یه‌ك له‌ هه‌ر كه‌سێك دا به‌دی بكه‌ین بۆ ڕه‌گ و ڕیشه‌و هۆی په‌یدابوونی له‌ عه‌قیده‌و بیروباوه‌ڕه‌كه‌ی دا بۆی بگه‌ڕێین و به‌م لاو لادا نه‌چین، چونكه‌ مه‌گه‌ر چۆن ده‌نا خواریی و لاریی دیوار له‌ سۆنگه‌ی لاریی بناغه‌وه‌یه‌ و لێڵی جۆگاش به‌رهه‌می لێڵی سه‌رچاوه‌كه‌یه‌تی![2]

******************************

٤٤.قه‌ده‌ری خوا وه‌ك ئاسمان وایه‌ كه‌ هه‌موو شتێك چ خێر بێ چ شه‌ڕ ده‌خاته‌ ژێر سایه‌ی خۆیه‌وه‌ و هه‌رچی بكرێ و نه‌كرێ هه‌ر به‌پێ ی نه‌خشه‌و ئه‌ندازه‌گیری خوای بالاده‌سته‌ ![3]

******************************

٤٥.له‌به‌ر ئه‌وه‌ی خودا به‌دیهێنه‌ر و په‌روه‌ردگاری هه‌موو شتێكه‌ ناگونجێ هیچ شتێك به‌بێ ویست و توانای وی دروست بێ: كه‌واته‌ هه‌رچی په‌یدا ده‌بێ چاك و خراپ هه‌ر به‌پێی ویست و توانای وی یه‌وه‌یه‌، به‌ڵام مه‌رج نیه‌ هه‌رچی به‌پێی ویستی خودا په‌یدا بوو، ◆خودا لێی ڕازی بێ تاكو ئێمه‌ش ناچاربین ملی بۆ كه‌چ بكه‌ین و پێی ڕازی بین![4]

******************************

---

[1] سه‌رچاوه‌ی پێشوو لا-٤٢٥

[2] ڕێگای صالح بوون و به‌ره‌و خواچوون -نوسینگه‌ی ته‌فسیر ساڵی-٢٠٠٥-چاپی سێیه‌م -لا- ٨١
تێبینی- ئه‌م كتێبه‌ سێ جار چاپ كراوه‌ چاپی یه‌كه‌می ١٩٩٠-چاپی دووه‌م ١٩٩٦-چاپی سێیه‌م ٢٠٠١-به‌م چاپه‌ی نوسینگه‌ی ته‌فسیره‌وه‌ ده‌بێته‌ چواره‌ م چاپ، هه‌ڵبه‌ته‌ ئه‌م چاپه‌ی نوسینگه‌ی ته‌فسیر له‌ هه‌موو چاپه‌كانی تر ته‌واو تره‌، چونكه‌ زۆربه‌شی بۆ زیادكراوه‌ كه‌ له‌چاپه‌كانی تردانی یه‌ وه‌ك مامۆستا خۆیشی ئاماژه‌ی پێداوه‌. ئاماده‌كار .

[3] سه‌رچاوه‌ی پێشوو لا-٢١٠

◆ (ویستی خوداش له‌و یاساو ده‌ستورانه‌دا به‌ڕێوه‌ده‌چێ كه‌له‌بوونه‌وه‌رو ژیانی ئینساندا له‌كاردان )

[4] مسوڵمانی كامل - به‌شی یه‌كه‌م -بیروباوه‌ڕی مسوڵمان چاپی یه‌كه‌م -ساڵی١٩٩٧ز-لا-٢٩

٤٦.نە بڕوا بەخوا بوون بێ ئیحتیاجمان دەکات لە بڕوا هێنان بە یاساو دەستوورەکانی بوونەوەر، وە نەناسین و دۆزینەوەی ڕازو نهێنیی ویاساکانی بوونەوەرو پەی بردن بە چۆنیەتی کاکردن و بەڕێوە چوونی بێ ئیحتیاجمان دەکات لە بڕوا بەخوا هێنان![1]

******************************

٤٧.ژیانی دنیا بێ دوارۆژ ڕۆمانێکی بێ ئاکام و چیرۆکێکی بێ تامە![2]

******************************

٤٨.حەتمەن دەبێ ڕۆژێك هەبێ تەرازوی دادگەری خوای تێدا دابنرێ و چاکان و خراپان بە پاداشت و سزای خۆیان بگەن و ویژدانی مرۆڤایەتیش ئاسوودە بێ و دڵی دابمرکێ و، ڕۆمانە بێ ئاکامەکانیش چاکترین ئاکامیان پەیدا بێ و، چیرۆکەبێ تامەکانیش خۆشترین تامیان تێدابێ، ئەو ڕۆژەش ڕۆژی سزا و پاداشت (یوم الدین)ە![3]

******************************

٤٩.هاتنی ڕۆژی دوایی گفت و بەڵێنی خوای لەسەرەو، خوداش هیچ شتێکی پێ زەحمەت نیەو، مرۆڤیش تینووی دادگەری یەو، ژیانی دنیاش بێ دوارۆژ وەك ڕۆمانێکی بێ ئەنجام و چیرۆکێکی بێتام وایە و لە دوارۆژیشدا نەبێ دادگەریی تەواو نایەتەدی، کەواتە: حەتمەن دەبێ ڕۆژی دوایی هەبێ، بۆ ئەوەی دادگەریی بچەسپێ و، ژیانی دنیا مانای هەبێ و، مرۆڤ تینووایەتی بشکێ و گفت و بەڵێنی خوداش ڕاست دەربچێ![4]

******************************

٥٠.قەدەر ناوی ئەو نەخشەو بەرنامەیەیە کە خودا لە ئەزەلەوە بۆ بوونەوەری داناوەو، قەزاش یانی جێبەجێکردنی ئەو بەرنامەیە بۆ هەرشتێك لە کات و شوێنی دیاری کراوی دا![5]

******************************



[1] سەرچاوەی پێشوو لا-٤٨

[2] سەرچاوەی پێشوو لا-١٩٨

[3] سەرچاوەی پێشوو لا-١٩٩

[4] سەرچاوەی پێشوو لا-٢٠٠

[5] سەرچاوەی پێشوو لا-٢٠٦

٥١.هەروەك چۆن بەبێ خوا (جل جلالە) پەیدا بوونی ئینسان و ژیان و بوونەوەر مەحاڵ و چاوەڕوان نەكراوە، سەرەڕایی ئەوەش ئەگەر گریمان پەیدابوون (إیجاد) یشیان بەبێ خوا تەفسیر بكرێ ئەوا خودی بوون (وجود)ە كەیان دەبێتە شتێكی پووچ و بێ حیكمەت و بێ مەعنا ![1]

*******************************

٥٢.ئەگەر ئیسلام دابنێین بە كۆشكێك بێ گومان بناغەكەی ئیمان و عەقیدەیە، وە ئەگەر دینداری و مسوڵمانەتی دابنێین بە درەختێك ڕەگ و ڕیشەكەی ئیمان و عەقیدەیە، وە ئەگەر دینداریی و مسوڵمانەتی وەكو جەستەی ئینسانێك سەیر بكەین ڕووحەكەی بریتیە لە ئیمان عەقیدەكەی ![2]

*******************************

٥٣.هەروەك چۆن درەخت هەتا ڕەگ و ڕیشەی نەبێ، قەدو لق و پۆپی نابێ، وە هەتا ڕەگ و ڕیشە و قەدو لق و پۆپی نەبێ، نا توانێ بەرو میوە دەربكات، مسوڵمانەتیش هەتا ئیمان و عەقیدەی نەبێ، عیبادەت و تاعەت و فەرمان بەریی و گەردن كەچی نابێ، وە هەتا ئیمان و عەقیدەو عیبادەت و فەرمانبەری نەبێ، ڕەوشتی بەرز و خەسڵە تە پەسەندەكان لە ئینساندا نایەنەدی![3]

*******************************

٥٤.ئێمەی مسوڵمان ئەگەر بمانەوێ خاوەنی دینداریيەكی باش و مسوڵمانەتیی یەكی پوخت بین، وە خاوەنی ئیسلامەتی و بەندایەتیەك بین بۆ خوا كەلای خوا جێگەی قبوڵ و پەسەند بێ، دەبێ بەر لە هەموو شتێك خەمی ئیمان و عەقیدەكەی بخۆین وەك چۆن كەسێك بیەوێ كۆشكێك دروست بكات، بەر لە هەموو شتێك خەم لە بناغەكەی دەخوات و لە جێگایەكی باش و زەوییەكی پتە و بناغەیەكی قووڵ و مەحكەمی بۆ دادەڕێژێ و هەڵدەكەنێ، بێ گومان بناغەی مسوڵمانەتی و دینداری و بەندایەتیش بۆ خوا بریتیە لە ئیمان و عەقیدە ![4]

*******************************

---

[1] سەرچاوەی پێشوو لا-٢٤٥

[2] زنجیرە دەرسی ئیمان و عەقیدەی ئیسلامی لەژێر ڕۆشنایی قورئان و سوننەت دا بەرگی یەكەم /ئیمان و عەقیدەی ئیسلامی چی یەو چۆنە؟!- چاپی یەكەم ساڵی ٢٠٠٧ز لا-٢٨

[3] سەرچاوەی پێشوو لا-٣٠-٣١

[4] سەرچاوەی پێشوو لا-٣١

٥٥.دەگونجێ ئینسان کردەوەی ڕواڵەتی هەبێت، بەڵام ئیمانی لەدڵ دا نەبێت، بەڵام هەرگیز ناگونجێ ئیمانی لە دڵدا هەبێت و کردەوەی نەبێت بۆیە سەرەتا ئیمان دێت پاشان ئیسلام دێت! [١]

******************************

٥٦.دەگونجێ ئیسلام هەبێت و ئیمان نەبێت، بەڵام ناگونجێ ئیمان هەبێت و ئیسلام نەبێت! [٢]

******************************

٥٧.ئەگەر ئینسان دەرونەکەی ئاوەدان بێ ڕواڵەتەکەی دەڕازێتەوە، بەڵام دەگونجێ ڕواڵەتەکەی بڕازێتەوەو دەروونەکەی وێران بێ وەك مونافیقەکان، هەرگیز ناگونجێ دەروونەکەی پڕبێت لە ئیمان و ڕواڵەتەکەی وێران بێ! [٣]

******************************

٥٨.(مؤمن ) (مسلم) ە،واتە هەرکەسێك ئیمانی پێ بوو ئیسلامی پێیە، بەڵام مەرج نیە هەر کەسێك ئیسلامی پێ بوو ئیمانیشی پێ بێ ! [٤]

******************************

٥٩.گەورەترین دەستکەوت و بەرهەمی ئیمان ئەوەیە کە ئینسان واڵێ دەکات شایستەی ئەوە بێ خوا لێی خۆش بێ و بەدیداری خوا (سبحانه وتعالى ) شاد بێت، وە لە دۆزەخی بەتین ڕزگاری بێت و لە بەهەشتی بەرین دانیشتەجێ بێت! [٥]

******************************

٦٠.بەداخەوە لەم ڕۆژگارەدا زۆرێك لەوانەی باسی خوا بەیەکگرتن دەکەن لە بواری پەرستندا تەنیا باسی لایەنی دروشمەکان (شعائر ) دەکەن، وە پێشیان وایە کە هاوبەش (شريك) بۆ خوا دانان تەنیا ئەوەیە کە لە دروشمەکاندا هاوبەش بۆ خوا دابنێی و واش دەزانن کە کێشەو گرفتی گەورە تەنیا لەگەڵ خاوەن گۆڕەکان (اصحاب القبور )ە، بەڵام بە پێچەوانەوە لە ڕاستی دا کێشەو گرفتی

---

(١)سەرچاوەی پێشوو لا-٥٤

[٢] سەرچاوەی پێشوو لا-٥٤-٥٥

[٣] سەرچاوەی پێشوو لا-٥٥

[٤] سەرچاوەی پێشوو لا-١١٥

[٥] سەرچاوەی پێشوو لا-٢٩٢

گەورە لەگەڵ خاوەن کۆشکەکان (اصحاب القصور)ە، لەڕاستیدا ئێستا خاوەنی قەسرەکان و ئەوانەی لە نێو قەسرو تەلارەکاندان زیاتر دەپەسترێن، هەتا ئەوانەی لە نێو قەبرەکاندان ![1]

*******************************

٦١.عەقیدە لە ئیسلام دا یەکێکە و سەلەفی و خەلەفی و ئەشعەری و صۆفی تێدا نیە وە تەنیا عەقیدە ئیسلامی یە ![2]

*******************************

٦٢.زۆر سەیرە ئێمە بەناوی "توحید"و "شرك" ەوە باسی حەرامی و گوناهو تاوانی (موو هەڵکێشان) بکەین، بەڵام باسی حوکمی (مل هەڵکێشان) نەکەین، بەتایبەتیش کە لەسەر دینداریی و مسوڵمانەتی ملیان هەڵبکێشریٚ! . وەباسی حەرامی و گوناهو تاوانی (خاڵ کوتان ) دەکەین، بەڵام باسی (خەڵك کوتان) ناکەین! وەباسی لە (خاوەن قەبر) پاڕانەوە دەکەین، بەڵام باسی بۆ (خاوەن قەصر) توانەوە ناکەین، چونکە کەسانی واهەن کە بوون بە کۆیلە و بەندەی خاوەن قەصرەکان و بۆیان تواونەوە ![3]

*******************************

٦٣.هەتا بەهۆی پەرسترانی خاوەن قەبرێکەوە سەد کەس تووشی شیرك دێن، بەهۆی پەرسترانی خۆسەپێن و خاوەن قەصرێکەوە ملێۆنان کەس گیرۆدەی شیرك و لە دین دەرچوون دەبن![4]

*******************************

٦٤.دەگونجیٚ خەڵکێك هەبیٚ کەم زۆر گیرۆدەی شیرکی گۆڕ پەرستی ببیٚ، بەڵام شەریعەتی خوا هەر حاکم بیٚ، بەڵام هەتا طاغوتە کان بپەرسترێن شەریعەتی خوا حاکم نابیٚ![5]◆

---

[1] زنجیرە دەرسی ئیمان و عەقیدەی ئیسلامی لەژێر ڕۆشنایی قورئان و سوننە تدا -بەرگی دووەم- خوا بەیەکگرتن لە بەدیهێنرابەتی و پەروەردگارێتی دا-چاپی یەکەم -ساڵی ٢٠٠٧ز-لا-١٩٢-١٩٣

[2] زنجیرە دەرسی ئیمان عەقیدەی ئیسلامی لەژێر ڕۆشنایی قورئان وسوننەت دا -بەرگی سێیەم -خوا بەیەکگرتن لەناو سیفەت و لەپەرستراوێتی دا-چاپی یەکەم -ساڵی ٢٠٠٧ز-لا-٣٥٩

[3] سەرچاوەی پێشوو لا-١٩٣

[4] سەرچاوەی پێشوو لا-٣٦١

[5] سەرچاوەی پێشوو لا-٣٦١

◆ بەڵیٚ دەگونجیٚ هەندیٚ کەسی سۆفی ودەروێش و مسوڵمانی عەوام هەبن کەبچن لەخاوەن قەبرێك بپاڕێنەوەو حوکمی ئیسلامیش هەبیٚ، بەڵام ناگونجیٚ طاغوتێك و دیکتاتۆرێك هەبێت خەڵکی کردبێتە بەندەو

٦٥.گورگی شیرك تەنها زەفەر بەدڵ و دەروونێك دەبات کە بە خۆری پرشنگداری ئیمان و خوا بە یەکگرتن ڕۆشن نەبوو بێتەوە، بەڵێ شەمشەمە کوێرەی شیرك تەنیا دەتوانێ لە ئەشکەوتی تاریك و تەڵەمی بابای بێ ئیمان یان ئیمان کزدا سەقامگیربێت و جێیەك بۆخۆی بدۆزێتەوە ![1]

******************************

٦٦.لە بواری ڕاگەیاندنی بیرو باوەڕدا دەنگی زوڵاڵی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام ) پەردەی کات و شوێن (زمان و مکان) دەدڕێ و بە هەموویان (کۆرس) ێك، پێك دێنن، بەڵام بە زمانی جیا جیا– سروودی (اعبدوا الله مالکم من اله غیره) دەڵێن![2]

******************************

٦٧.هەرچەندە بیرو بڕوا لەبووnناسیی یەوە هەڵدەقوڵێ، بەڵام ئەوەی سەنگی مەحەك و پێوەری هەڵسەنگاندنی ئینسانە، بیروبڕوایە نەك بووnناسیی، چونکە بووnناسی هەڵهێنجراو و ڕەنگدانەوەی واقیعی بوونە، بەڵام بیروبڕوا بریتیە لە هەڵوێستی مرۆڤ لە بەرانبەر بوون داو کردەوەیە بەویست و خواستی ئازادانەی خۆی هەڵی دەبژێرێ، ئنجا دیارە زانیاری یەکیش کە کردەوەو هەڵوێستی لەگەڵ نەبێ بێ بایەخەو خاوەنەکەی لێی بەهرەمەند نابێ ![3]♦

******************************

٦٨.ئەگەر ئیسلام بەخانووێك دابنێین بیرو باوەڕ بناغەکەیەتی و، ئەگەر وەك درەختێك تەماشای بکەین بیروباوەڕ ڕەگ و ڕیشەیەتی و، ئەگەر بەجەستەیەکی بچوێنین بیروباوەڕ پەیکەری ئێسکی یەتی ![4]

---

کۆیلەی خۆی و ئەمرو نەهی یان بەسەردا بکات و حەڵاڵ و حەرامیان بۆ دیاری بکات و یاساو دەستوریان بۆ دابنێت ،دینی خواش حاکم بێت !!هەرگیزشتی واناگونجێت !

[1] سەرچاوەی پێشوو ل–٣٦٦

[2] زنجیرە دەرسی ئیمان عەقیدەی ئیسلامی لەژێر ڕۆشنایی قورئان سوننەت دا– بەرگی چوارە –بڕوا بە بە فریشتەکانی خوا –بەپێغەمبەرانی خوا –بە کتێبەکانی خوا –ل–٢٣٦–٢٣٧

[3] تەوژمی ئیسلامیی و عەلمانیی خاڵە هاوبەش و جیاوازە کانیان –چاپی یەکەم–ساڵی ٢٠٠٨ ز –ل–٢٨–٢٩

♦ بۆ نمونە پزیشکێك کە دەزانێ مەیخۆریی و جگەرە کێشان خراپ و زیان بەخشن ،بەڵام لێیان ناپڕینگێتەوە، زانیاریەکەی بێ سوودە! هەمان سەرچاوە –ل–٢٩

[4] پرۆژەی بەرنامەی فکریی کاری ئیسلامیی–چاپی یەکەم–ساڵی ١٩٩٦ ز–ل–٤٠

٦٩.دەبێ دڵنیاو مسوٌگەربین کە هەتا بیرو باوەڕ قوڵترو پتەو تر و دامەزراوتر بێ، پا بەندی و مسوڵمانەتیش چاکتر و ساغتر و تەواوتر و هەمەلایەنە تردەبێ![1]

*******************************

٧٠.ئینسان و دەوروبەر و بوونەوەر، ئاوێنەی تێدا تەجەللا کردن و درەوشانەوەی ناو و سیفەتە چاك و پەسەندەکانی خودان![2]

*******************************

٧١.قەزا و قەدەری خوا کردنە بەهانە و قەڵغانی بێ بڕوایی و خراپەکاری، کە بەدرێژایی مێژوو عادەتی بێ بڕواو لاڕێ یان بووە، شتێکی بێ جێو بێ بنچینەیە و بەڵگەی کەودەنی و نەفامیی خاوەنەکەیەتی ![3]

*******************************

٧٢.ئەم ژیانە کەم و کورتەی ئێرە پێشەکی یەو ئەوەی ئەوێ ئەنجام بەرهەمیەتی، ئاشکراشە ئەنجام و بەرهەمێك هەرچەندە زۆر گەورەش بێت بەبێ پێشەکی یەکەی هەرچەندە زۆر گچکە و کەم بێ نایەتەدی![4]

*******************************

٧٣.کەسێك کە لە بەڕێوەبردن و ڕێکخستنی ژیان گوزەرانی تاکی و خێزانیی و کۆمەڵییدا یان بە یەکجاری ئایین و شەریعەتی بێ هەڵەو پەڵەی خوا پشت گوێ دەخات، یان حیسابێکی لام سەللایی بۆ دەکات و ڕێچکەو بیردۆزەکانی لەگەڵ تێکەڵ دەکات و دەیهێنێتە ریزی بەرنامەو بیردۆزە هەڵقوڵاوەکانی بیرو زەینی مرۆڤ و بۆ ئیدارەکردنی خەڵك و وڵات و پشك و بەشێکی گچکە یان گەورەی پێ دەدات! چۆن دەتوانێ خۆی بەخوا بەیەکگر (مُوَحِّد) دابنێ و واخەیاڵ بکات کە مسوڵمانەو تەنها خوا بە پەروەردگار و پەرستراو یاسادانەر دەزانێ ؟![5]

---

[1] سەرچاوەی پێشوو-لا-٤١




[2] سەرچاوەی پێشوو-لا-٤٥

[3] سەرچاوەی پێشوو-لا-٨٠

[4] سەرچاوەی پێشوو-لا-٢٤٥

[5] زنجیرەی بابەتە هەنووکەییەکان (ئەڵقەی پێنجەم) سیاسەتی ئیسلامیی و چەند ڕوونکردنەوەیەك- چاپی یەکەم -ساڵی ٢٠٠٧ ز-لا-٣٧

تێبینی: ئەم زنجیرەیە تا ئێستا بەردەوامە و(دە) ئەڵقەی لێ بەچاپ گە یشتووە ).ئامادەکار

٧٤.سەرەتا ئیمان و عەقیدە وەك بناغەی ئیسلامەتی ئنجا عیبادەت و زەکات وەکو بەرهەمی ئیمان و عەقیدە، چونکە ئەگەر ئیمان و عەقیدە نەبێ ئینسان خوا ناپەرستێ و نوێژ ناکا، وە نوێژێك کە لەسەر ئەساسی ئیمان و عەقیدە نەکرێ بەکەڵك نایەت، وە ئەگەر عیبادەت نەبێ هیچ شتێك پاڵ بە ئینسانەوە نانێ کە ئینسان ماڵی خۆی ببەخشێ، وە ئەگەر بیشی بەخشێ مادام بۆ خوا نەبێ لێی بەهەرەمەند نابێ![1]

******************************

٧٥.ئیمان و عەقیدەی ئینسانی مسوڵمان بنك و ڕیشەو ئەسڵەکەی لە عەقڵ و دڵ دا جێگیر و چەسپاوە و، ڕواڵەت و ئەندامەکانیشی پابەندن بە شەریعەتی خواوەو سەرگەرمی طاعەت و فەرمانبەرین و هەمیشەش ڕازاوەیە بەخوو خدەی بەرز و ڕەوشت و ئاکاری جوان ودڵگیر![2]

******************************

٧٦.وەك چۆن بەبێ ڕەگ و ڕیشە و بنك قەد و لق و پۆپ و گەڵای درەختەکە ناگونجێ هەبن، بەهەمان شێوەش بەبێ ئیمان و عەقیدەی بە عەقڵ فام کراو لە دڵ دا چەسپاو، طاعەت و پابەندی بە شەریعەتەوە پەیدا نابێ و، بەبێ هەرکام لە ئیمان و طاعەتیش، خوورەوشتی بەرز و پەسەند لە مرۆڤدا پەیدا نابێ، وەك چۆن میوە و بەری درەخت بەبێ ڕەگ و ڕیشەو قەد و لق و پۆپ پەیدابوونی مەحاڵە![3]

******************************

٧٧.ئیمان و عەقیدەی ڕاست و ساغ و تەوا و خورەوشتی بەرز و پەسەند لە ئینساندا پەیدا دەکات![4]

******************************

٧٨.ئیمان و ئیسلام لەدڵ و عەقڵەوە دەست پێ دەکەن نەك لەپەنجەوە![5]♦

---

[1] زنجیرەی بابەتە هەنووکەییەکان ( ئەڵقەی شەشەم) چەند بنەمایەکی گرنگی وتاربێژی –چاپی یەکەم – ساڵی ٢٠٠٦ ز–ل–٣٥

[2] زنجیرەی بابەتە هەنووکەییەکان (ئەڵقەی هەشتەم) خورەوشتی بەرز و پەسەند سەنگی مەحەکی مسوڵمانەتی یە–چاپی یەکەم –ساڵی ٢٠٠٧ ز–ل–٣٨

[3] سەرچاوەی پێشوو–ل–٣٨

[4] سەرچاوەی پێشوو–ل–٣٩

[5] چەند ڕێڕوونی یەك بۆ ئیسلامی یەکانی کوردستان –چاپی یەکەم –ساڵی ١٩٩٧ ز–ل–١٠٩

٧٩.مەرج نیە هەر واقیعێك كە بەویستی خوا دروست بوو، بەپێی ڕەزامەندی خواش بێ![1]

******************************

٨٠.ئەگەر بمانەوێ وە دوای ویستی خوا بكەوین ئەوە پێویست بەویستن و نەویستنی ئێمە ناكات، چونكە هەرچی بكەین هەر بەویستی خوا دەیكەین و ناتوانین لەژێر ڕكێفی ویست و دەسەلاتی وی دەربچین![2]

******************************

٨١.یاسا بێ یاسا دانەر و ڕێك و پێكی بێ ڕێكخەر و كاركردن و بەڕێوە چوون بێ كارگێری و بەڕێوەبەر هاتنەدی یان مەحاڵە![3]

******************************

٨٢.قەزا و قەدەر هەردووكیان بەو نەخشەو بەرنامەو یاساو دەستووره ڕێك و پێكانە دەگوترێ كە خوا بۆ ئەم بوون(وجود)ەی داناون![4]

---

تێبینی: ئەم كتێبە لەسەرەتادا لەشێوەی نامیلكەی بچووكدا سێ ئەڵقەی لێ چاپ كراو دواتر سێ ئەڵقەكەو ئەو بەشانەی تری كە بەچاپ نەگەیشتبوون چاپ كران و كتێبی ناوبراویان لێ پێك هاتووە.ئامادەكار

* ئەم وتەیە سەر گوزشتەیەكی زۆر خۆش و بەپێزو پڕواتای تێدایە، بە پەسەندم زانی بۆ ڕوو كردنەوەی زیاتری ووتەكەو بۆ بەرچاو ڕوونی خوێنەر نقڵی بكەم كەبەم شێوەیە دەست پێ دەكات:

ڕۆژێكیان گەنجێكی چواردە پازدە ساڵانە دوای نوێژ كەمن ئیمام بووم، لێی پرسیم: ئەوە بۆچی لەكاتی تەحییات دا پەنجەت نەجووڵاند خۆ فەرمموودەی (صحصح) ی لەسەرە؟!

منیش پێم گوت: كاكە گیان هەردووك لای هەرسوننەتە، بەڵام من یەكجار جووڵانی پەنجەو ئیشارە پێ كردنیم پێ ڕاسترە، چونكە ئیشارە پێ كردنی لە (صحیح)ی (مسلم) داهاتووە، بەڵام جووڵاندنی لە(سنن)دا هاتوەو هەر لە(سنن) یش دا نەجوڵاندنیش هاتووە! پاشان پێم گوت: كاكە گیان چەند لە ئیسلام شارەزای و چی و چیت خوێندوە؟ گوتی: وەڵڵا بەس دوو دەرسم خوێندون و تازە دەستم پێ كردوە. منیش پێم گوت: جابرای شیرینم! چۆن، بەدوو دەرس گەیشتی یە (پەنجە)ت! كە چوویە لای مامۆستایەكەت سەلامی منی پێ بگەیەنەو بڵێ گووتوشیەتی: ئیمان و ئیسلام لە دڵ و عەقڵەوە دەست پێ دەكەن نەك لەپەنجەوە، و، بارێزو تەرتیبی دەرس گوتنەوەكەی بگۆڕێ و، هەوڵیش بدات باشتر لە قورئان و سوننەت تێ بگات!!

[1] زنجیرەی باچاكتر ئیسلام بناسین ئەڵقەی یەكەم –خودا - جلَّ جلاَلهُ –چاپی دووەم –ساڵی ١٩٩٠ز–لا –٣٨

[2] سەرچاوەی پێشوو–لا–٣٨

[3] سەرچاوەی پێشوو–لا–٧٤

[4] سۆزی نەتەوایەتی بیری ناسیۆنالیزم لەتەرازووی ئیسلام دا –چاپی یەكەمی نوسینگەی تەفسیر –ساڵی ٢٠٠٥ ز لا–٧٦–٧٧

٨٣. ئەوانەی کە ئەهلی کوفر و شیرکن ئەگەر لە جیاتی مزگەوتێك پەنجاش دروست بکات، وە هەر شتێکی دیکە بکات ئەوە بەهۆی کوفرو شیرکە کەیەوە ڕەنج بەخەسارەو کردوو کۆش و پووچ و بۆشە، ئەگەر ڕاست دەکات بالەپێشدا خۆی ئاوەدان بکاتەوە ئەو جار ماڵ بۆ خوا دروست بکات، لەپێش دا خۆی بەندەی خوا بێت پاشان ماڵ دروست بکات بۆبەندایەتی کردن بۆ خوا![1]

******************************

٨٤.هەمیشە ئیمان و عەقیدەی ڕاست و دروست، هەڵوێست و دیدو بۆچونی ڕاست و دروست و بێ گرێ و گۆڵ لە خاوەنەکەیدا بەرهەم دێنێ و، بەپێچەوانەوەش هەمیشە عەقیدەی چەوت ولار، یان کرچ و کاڵ و بەخلتەو خاڵ، کانگای هەڵوێست و بیروڕاو بۆ چوونی هەڵەو پەڵەو نالەبارە، پێشینانیش ڕاستیان گوتوە: (گۆزە چی تێدابێ هەر ئەوەی لێ دەڕژێت)![2]

******************************



[1] مزگەوتەکانی کوردستان لەنێوان ئاوەدانکردنەوەو وێرانکردندا-چاپی یەکەم -ساڵی١٩٩٩ زلا -٣٠-٣١

[2] زنجیرە دەرسی ئیمان و عەقیدە ئیسلامی لەبەر ڕۆشنایی قورئان وسوننەت دا -بەرگی شەشەم تایبەتمەندیی و دید وبۆچونەکانی پەیرەوانی ڕێبازی ڕاست-چاپی یەکەم-ساڵی ٢٠٠٨ ز-لا-١٠

٨٥.ئیسلام بیرو باوەڕێکی میسالیانە نیە کە تەنیا لەدنیایی بیر کردنەوە و خەیاڵ دا هەبێ و هیچی دی، بەڵکو دەستوور و بەرنامەی ژیانە و دەبێ لەکردەوە و ڕەفتار و هەڵوێستی شوێن کەوتوانی دا هەبوونی بخاتە ڕوو بی سەلمێنێ![1]

*******************************

٨٦.لەڕوانگەی ئیسلامەوە گەورەترین ڕاستی لەبوونەوەردا دووشتن: یەکەم خوایەتی خوا، دووەم: بەندایەتی ئینسان![2]

*******************************

٨٧.ئیسلام وەك بەرنامەو ڕێچکە دەسکردەکان نیە کە پڕوپاگەندەو وروژاندنی خەڵکی بەس بێت بۆ وەدواکەوتنی، وە ئەوانەش کە خۆیان بەخاوەنی دەزانن هیچ پێ یان نەنگ و کەسری نەبێت کەسەد شاخ و باڵ و کلکی زیادە و دەسکرد بۆ بەرنامەکەیان بکەن و هەردەمەش بەکاڵاو بەرگێك بی پۆشن و ناوێکی نوێی بۆ داتاشن کە لەگەڵ ئارەزووی خەڵکی دا بگونجێت و سەرنجیان ڕابکێشێ، وە دەربەستیش نەبن کەهەرچەشنە شێوازێکی دزێو و ناقوڵا بەکاربێنن بۆ وەی بیرۆچکەکەیان بەرقەرار بێت![3]

*******************************

٨٨.ئیسلام ڕێبازو بەرنامەی خوایە و چەند بنچینەیەکی ژیری و زانستیانەی نەگۆڕاوی هەیە، چونکە پەیوەستن بەچەند یاساو بنەمایەکی نەگۆڕاوەوە لەسروشتی بوونەوەر و ئینسان دا![4]

*******************************

٨٩.بێجگە لە ئیسلام لە هیچ بەرنامەو مەکتەبێکی تردا نا توانرێ هەڵوێستێکی ئینسانانە لە ئاقار ئینسان دا پیشان بدرێ![5]

*******************************

٩٠.ئیسلامەتی بەهیچ کلۆجێك بیروباوەڕ و بەرنامەیەکی تیۆری و بیری ڕووت و قووت نیەو نابێ، بەڵکو ئیسلام بریتیە لەو بیروباوەڕە واقیعی و زیندووەی کە کۆمەڵە ئینسانێك دەبنە

[1] پوختەیەك دەربارەی ئیسلام لەبەر ڕۆشنایی سوورەتی فاتیحەدا -چاپی دووەم -ساڵی ٢٠٠٦ ز -لا-١٧

[2] سەرچاوەی پێشوو لا-٢٣-٢٤

[3] سەرچاوەی پێشوو لا-١٠٩

[4] سەرچاوەی پێشوو لا-١٠٩

[5] سەرچاوەی پێشوو لا-٣٠٨

ته‌رجه‌مه‌یه‌كی واقیعی و كرده‌وه‌یی بۆی، وه‌له‌ هه‌ر كات و جێ یه‌ك دا ئیسلام به‌شێوه‌یه‌كی كرداری ڕه‌نگ نه‌داته‌وه‌ له‌كرده‌وه‌ و ڕه‌وشت و خوو هه‌ڵسوكه‌وتی ڕۆژانه‌ی كۆمه‌ڵه‌ ئینسانێك دا، ناتوانین بڵێین له‌و كات و شوێنه‌دا ئیسلام هه‌یه‌، هه‌ڵبه‌ته‌ ئه‌و جۆره‌ هه‌بوونه‌ی ئیسلامیش شتێكی حه‌تمی و پێویسته‌ له‌هه‌موو چاخێك دا![1]*

******************************

٩١.هه‌روه‌ك چۆن كاتێك دوژمن بیه‌وێ به‌سه‌ر شوێنێك دا زاڵ بێ و بیخاته‌ ژێر ڕكێفی خۆیه‌وه‌، له‌ پێش دا هه‌وڵی داگیركردن و ده‌ست به‌سه‌را گرتنی لوتكه‌و به‌رزایی یه‌كان ده‌دات، بۆ ئه‌وه‌ی دواتر به‌ ئاسانی به‌سه‌ر هه‌موو ناوچه‌كانی دیكه‌دا زاڵ بێ، هه‌ر كاتێكیش دوژمن و ناحه‌زانی ئایین و به‌رنامه‌ی خوا، توانیان به‌سه‌ر لوتكه‌ی هه‌ره‌ به‌رزی ئیسلام (تێكۆشان) دا زاڵ بن و له‌بیرو مێشكی خه‌ڵكی موسڵمانی ده‌ربێنن و له‌به‌رنامه‌ی خوای بقرتێنن، مانای وایه‌ لای سه‌ره‌وه‌یان له‌ ئیسلام گرتوه‌ به‌سه‌ر هه‌موو لایه‌نه‌كانی دیكه‌ی ئیسلامه‌تی دا زاڵ بوون و خستویانه‌ته‌ ژێر ڕكێفی خۆیانه‌وه‌![2]

******************************

٩٢.له‌ ڕاستی دا ئیسلام وێڕای دڵۆپه‌ فرمێسكی چاوان دڵۆپه‌ خوێنی هه‌ناوان و، وێڕای گریانی چاوی مزگه‌وت و میحراب، ئیشكه‌ گرتنی چاوی نێو سه‌نگه‌ر و مه‌یدانیشی ده‌وێ![3]

******************************

٩٣.پابه‌ندبوون به‌ئیسلامه‌وه‌ ماكی نه‌خۆشی و ده‌رده‌كانی ئێمه‌ نیه‌، به‌ڵكو خراپ حاڵی بوون و پابه‌ند نه‌بوون به‌ ئیسلامه‌وه‌ به‌م ده‌رده‌ی بردووین و توشی ئه‌م ڕۆژه‌ی كردووین![4]

---

[1] سه‌رچاوه‌ی پێشوو لا-٣١٣

* وه‌ك خۆشه‌ویست( ﷺ ) فه‌رموویه‌تی (لاتزال طائفة من امتي ظاهرين على الحق حتى يأتي امرالله.../مسلم ڕوایه‌تی كردوه‌ واته‌: به‌رده‌وام تاقمێك له‌ ئومه‌تم له‌سه‌ر هه‌ق ده‌مێننه‌وه‌ هه‌تارۆژی دوایی دێت به‌فه‌رمانی خوا.

[2] یادی خودا – گرنگی یادی خوا له‌ژیانی مرۆڤ دا- به‌رگی یه‌كه‌ م – چاپی یه‌كه‌م- ساڵی ١٩٨٧لا-١١-١٢

[3] سه‌رچاوه‌ی پێشوو لا-١٥٧

[4] سۆزی نه‌ته‌وایه‌تی بیری ناسیۆنالیزم له‌ته‌رازووی ئیسلام دا –چاپی یه‌كه‌می نوسینگه‌ی ته‌فسیر –ساڵی ٢٠٠٥ ز-لا-٥٤

٩٤.ناتەواوی و هەڵەی شوێنکەوتووی هیچ ڕێبازێك نا گونجێ بکرێتە بەڵگەی ناتەواوی ئەو ڕێبازە![1]

********************************

٩٥.هەرکام لە زاراوەی: شێخ، ئاغا، دەبەگ، لە لایەکەوە و زاراوەی مسکێن، ڕەشۆکی، لە لایەکی دیکەوە، لە فەرهەنگی ئیسلام دا نین و لە ڕژێمی قڕی و پڕی و چینایەتی دا لەدایك بوون، هەڵبەتە وشەی (المسكين)لە قورئاندا هەیە، بەڵام لە قورئانێ دا مەبەست بابای نەدارە، نەك نیوەکاری ئاغاو میر و شێخ![2]

********************************

٩٦.ئیسلامەتی مرۆڤـ نەیناردووە، تا هەر جارە ڕەشەبای هەوا و ئارەزوو بۆچوونی مرۆڤانەی بەلایەك دا ڕەپێچی بدات![3]

********************************

٩٧.ئیسلام◆ بەرنامەیەکە بەس ئەو دەتوانێ و توانیوەتی کە هێمنی و ئاسایش و دادگەری و تەبایی و یەکسانی و خۆش گوزەرانی و ڕەوشت بەرزی بۆ بەرەی ئادەمیزاد بهێنێتەدی![4]

********************************

٩٨.ئیسلام بەرنامەیەکە بەس ئەو دەتوانێ و توانیوەتی قەڵای کوفرو زۆرداری بروخێنێ و مافی، خوراوی چەوساوان بستێنێ و، تاغووت و فیرعەونان لە ڕیشەو بیخەوە دەرێنێ و بەرەو زبڵدانی مێژوو بیانڕەتێنێ![5]

---

تێبینی: ئەم کتێبە سێ جاری تر چاپ کراوە لەم چاپەیدا کە نوسینگەی تەفسیر کردوویەتی سەرجەم ئەو بابەتانەی پەیوەست بوون بەم باتەوەوە خراونەتە نێو ئەم کتێبە واتە ئەم کتێبە چوارجار چاپ کراوە .ئامادەکار

[1] سەرچاوەی پێشوو لا-٥٥

[2] سەرچاوەی پێشوو لا-٨٣

[3] سەرچاوەی پێشوو لا-٨٦

◆ ئەوی خەتی بەژێردا هاتوە خۆم بۆم زیاد کردووە، چونکە سیاقی ووتەکە دەیخوازێ و هیچ کاریگەریەك لەسەر واتا و ناوەڕۆکی وتەکان دروست ناکات هەروەها وتەکانی - ٨٠-٨١-٨٢- یش بەهەمان شێوە. ئامادەکار

[4] سەرچاوەی پێشوو لا-٩٤

[5] سەرچاوەی پێشوو لا-٩٤

٩٩.ئیسلام تاقە بەرنامەیەکە کەبتوانێ ڕێزو حورمەتی زۆر و پلەو پایەی بەرزو ڕەزامەندی لەلایەن خواوە بۆ مرۆڤـ فەراهەم بێنێ![1]

******************************

١٠٠.ئیسلام تاقە بەرنامەیەکە کە بتوانێ مرۆڤـ لە دنیاو دوارۆژدا بەمراد بگەیێنێ و وەحەسێنێ![2]

******************************

١٠١.بەپێی پەیڕەوی خوا: یەك پەرستراو(إلـه) ویەك بەرنامەو یەك پێشەوا و یەك کتێب و یەك ڕووگەو یەك مەبەست بۆ مرۆڤەکان دیاریکراوە، پەرستراو بەس خوا(الله) یەو، بەرنامەو پەیڕەو تەنها ئیسلامەو، وە ڕابەر و پێشەوا هەر پێغەمبەرە ﷺ، بەس قورئان کتێبی بڕواپێکراوە[3] و، تاقە ڕووگە کەعبەی پیرۆزەو، بەرزترین مەبەست خوا ڕازی کردنە![4]

******************************

١٠٢.ئیسلام کە عەقیدە و سیاسەت و عیبادەت و حوکم و حیکمەت و ڕووح و جەستە و بازاڕ و مزگەوت و دنیا و قیامەتە مەحاڵە بەبێ تێگەیشتن و پێگەیشتن و خەملاندنی گەل و کۆمەڵگایەك و دابین کردن و ئازادکردنی نیشتمان و جێگایەك، بلوێ پیادەبکرێ و ئەرك و فەرمانە تاکی و کۆمەڵی و ڕووحی و سیاسی و دینی و مەدەنی یەکانی جێ بەجێ بکرێن![5]

******************************

١٠٣.ئیسلام ناوە بۆ هەموو ئەو ئایین و بەرنامەنای کە خوا بە پێغەمبەرانیدا (علهیم الصلاه السلام) ناردوونی، جا هەرچەندە لەچۆنیەتی و چەندیە تیشدا لێك جوێ بوون، بەڵام لە کاکڵ و مەبەستدا



---

[1] سەرچاوەی پێشوو لا-٩٤

[2] سەرچاوەی پێشوو لا-٩٤

[3] هەڵبەتە (سنه ) یش کە گوتارو کردارو بڕیار لەسەردان (القول والعمل التقریر)ی پێغەمبەرمان دەگرێتەوە، بری تییە لەتەفسیری لێکدانەوەی قورئان، وەك خوا فەرموویەتی (وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَانُزِّلَ إِلَيْهِمْ)ا لنحل /٤٤

[4] سەرچاوەی پێشوو لا-١٢٣

[5] سەرچاوەی پێشوو لا- ٢٠١

یه‌ك بوون، كه‌ بریتیه‌ له‌سه‌ر دانه‌واندن و گه‌ردنكه‌چ كردن بۆ به‌رنامه‌ی خوا و، خۆیه‌كلا كردنه‌وه‌ بۆ به‌ندایه‌تی و فه‌رمانبه‌یی خوا![1]

*******************************

١٠٤.له‌ ڕوانگه‌ی ئیسلامه‌وه‌ بڕوای بێ گه‌ردن كه‌چی و، فه‌رمان به‌ری بوونی نیه‌ و، ئه‌گه‌ر گریشمان هه‌شبێ، ئیسلام وه‌ك پاره‌ی قه‌ڵب و گوێزی قرپۆكی حسێبی ده‌كات ![2]

*****************************

١٠٥.زۆر سه‌یره‌ مرۆڤێك بڵێ بڕوام به‌و ئایه‌تانه‌ هه‌یه‌ و خۆی به‌بڕوادار بزانێ و، به‌ خۆشی ڕه‌وا ببینێ، په‌نا به‌رێته‌ به‌رغه‌یری خواو به‌رنامه‌ و په‌یڕه‌وی ژیانی لێ وه‌ربگرێ؟ ئایا ئه‌و ساده‌ بیره‌ نازانێ كه‌ به‌و ڕه‌فتاره‌ نا له‌باره‌ی به‌زمانی حاڵ درۆ ده‌داته‌ لای خوای به‌رز و پاك؟!

خوای زانا فه‌رمویه‌تی ئایینه‌كه‌تان تێروته‌واوه‌ (اكملت لكم دينكم) بێگومان شتی ته‌واو یش حه‌وجێی پینه‌و په‌ڕۆیان نی یه‌، به‌ڵام ئه‌و گێل و نه‌فامه‌، ئه‌گه‌ر به‌ زمانی وتار(مقال)یش نه‌ی گوتبێ، به‌زمانی كردوه‌ و حاڵ گوتوویه‌تی ئیسلام ناته‌واوه‌ !چونكه‌

بۆبه‌ڕێوه‌بردنی كاروبردنی كاروباری ده‌وڵه‌ت .

یان بۆ به‌ره‌و پێش بردنی ئاوه‌دانی وڵات.

یان بۆ په‌ره‌پێدانی پیشه‌سازی و كشتوكاڵ و گه‌شه‌پێدانی بازرگانی .

یان بۆ وه‌ده‌سهێنانی مافه‌ نه‌ته‌وه‌ییه‌كان.

یان بۆ ڕزگاربوون و گه‌یشتن به‌ ئازادیی .

یان بۆ چاره‌كردنی كێشه‌و گرفته‌ كۆمه‌ڵایه‌تییه‌كان .

یان..یان..هتد.په‌نای بردۆته‌ به‌ر فلان وفیسار بیردۆزه‌ و بیروبۆچوون و، بۆته‌ داشی دامه‌ی فلا نه‌ حیزب و ڕێچكه‌ !!

جا بێگومان مرۆڤیش هه‌تا شتێك له‌ماڵی خۆیدا شك به‌رێ په‌نا نابا ته‌ به‌ر یه‌كی دی. مادام وابێ هه‌ركه‌سێك له‌ هه‌ر لایه‌نێكی ژیانیدا: گیانی و په‌روه‌رده‌یی، سیاسی، كۆمه‌ڵایه‌تی،

---

[1] خواناسیی ئایین ئیمان –ڕاستییه‌كانی ئیسلام ده‌ده‌ره‌شێنه‌وه‌ ئه‌فسانه‌كانی ڕێچكان ده‌پووچێنه‌وه‌ –چاپی یه‌كه‌م–ساڵی ٢٠٠٠ ز –لا–١٨٣

[2] سه‌رچاوه‌ی پێشوو لا–١٦٨

ئابووری،...هتد.بەنا بەریتە بەر پەیڕەوو بەرنامەیەکی دیکە، بێجگە لە هی خوا، ئەوە بەزمانی کردەوە دانی پێداهێناوە و پێی لێناوە کە بەرنامەی خوا ناتەواوە ![1]

*******************************

١٠٦.جیاوازی نێوان بەرنامەی خوا و بەرنامەی مرۆڤ هێندەی جیاوازی نێوان خواو مرۆڤە ![2]◆

*******************************

١٠٧.خوای بەرز و بێ وێنە بۆ خۆی ئینسانی خولقاندووە و، ئەگەر بێت و خۆشی بەرنامەی ژیانی بۆ دابنێ، ئەوە پێکەڵپێك و پڕ بەپێستی دەبن و کورد گوتەنی (کاڵا بەقەد باڵا دەبێ ) بێ کەم و زیاد ![3]

*******************************

١٠٨.شەریعەت [4] ی ئیسلام چەسپاوە و ناگۆڕێ ، بەڵام شەرع[5] ی(فقە) ئیسلام چەسپاوو نە گۆڕنیەو، جێی لابردن و گۆڕانکاری تێدایە ![6]

*******************************

١٠٩.ئەگەر هات و هەرکام لە دیاردەی گاڵتە بەئایین کردن و، سەودا و مامڵەت بەئایینەوە کردنت دیتن، ئەوە لە بارەی ئایین و بەرنامەی خواوە دوو دڵ و دڕدۆنگ مەبە، چونکە دەریا بەزاری سەگ

---

[1] سەرچاوەی پێشوو لا-١٨٨-١٨٩

[2] سەرچاوەی پێشوو لا-١٩٩

◆ ئاشکراشە کە خوا لەهەموو ڕوویێکەوە تەواو بێ سنوور و بەرزو بێ لەکەیەو، مرۆڤیش لەهەموو ڕوویێکەوە ناتەواو سنووردارو پڕهەڵەو پەڵەیە، هەرکەسێکیش خۆی و خواو بەرنامەی خوای ناسیبێ، یان لانی کەم لە هەرسێکیان یەکیانی ناسیبێ ، دەزانێ ئەوەی گوتمان چ دەگەیێنێ و، بێ سێ و دوو دەیسەلمێنێ .

[3] سەرچاوەی پێشوو لا-٢٠٨

[4] مەبە ستیشمان لە شەریعەت ئەو یاساو بنچینە گشتی و سەرەکییە ،چەسپاوانەن کە پەیوەستن بەلایەنی بیرو باوەڕو، ڕەوشت و ئاکارو ، خواپەرستی و (خواپەرستی بەچەمکی عورفی و تەسکی، ئەگەرنا خواپەرستی هەموو شتێ دەگرێتەوە.) چوارچێوەی گشتی و پایە بنەڕەتییەکانی بەرنامەی خواوە ،

[5] وە مەبەستامان لەشەرع دا (فقە ) ئەو یاسایانەن کە پەیوەستن بەوردە بابەتەکان (جزئیات) ی بەرنامەی خواوە ،مەودای بیرکردنەوە و کۆشش (اجتهاد) ی زانایانیان تێدا هەیە و، دەبارانیان هەیە واتاو لێکدانەوەی جۆراو جۆر هەڵبگرن و، جێ گۆڕکە (تبدیل)ی حوکمانیان تێدا بکرێ.

[6] سەرچاوەی پێشوو لا-٢٢٢

پیس نابێ و، بیروباوەڕیش مادام ڕاست بێ، بەلادانی شوێنکەوتوانی سووک نابێ، ئنجا هەموو دەمێش وێڕای بەناو پێشەوای دڵنەخۆش و ئایین و فرۆش، پێشەوای بەرز و چاك و لێهاتوو و چاکیش هەن، وە وێڕای بەناو موسڵمان و مسولمانۆچکان موسڵمانی کامڵ و تێرو تەواویش هەن! [1]

******************************

١١٠.ئایین و بەرنامەی خوا بۆ مرۆڤایەتی، وەکو هێڵی ئاسن ( سکة الحديد) وایە بۆ شەمەندەفەر( القطار) هەروەك چۆن لە کاتی ترازانی شەمەندەفەردا لەسەر هێڵی ئاسن، ژیانی هەموو ئەوانە دەکەوێتە مەترسییەوە کە سواری بوون، مرۆڤایەتیش بەلاڕێ بوون و لادانی لەسەر ڕێڕەو و بەرنامەی خوا، ژیان و گوزەرانی دنیایی دەکەوێتە مەترسیەکی هەرە گەورەی هەمەلایەنەوە، سەرەڕایی خەشم و تورەیی و سزا و تۆڵەی خوای دادگەر لە دواڕۆژدا! [2]

******************************

١١١.ڕاستییەکانی ئیسلام دەدرەوشێنەوەو، ئەفسانەکانی ڕێچکان دەپووچێنەوەو دەپووکێنەوەو وەکو بەفری بەر خۆر زوو دەتوێنەوە! [3]

******************************

١١٢.ئیسلام ڕاستیی(صِدْق) یەو بە درۆو دەلەسە خزمەت ناکرێ! [4]

******************************

١١٣.ئیسلام هەق (حق) ەو بەباتڵ (باطِلْ) بەڕێوە نابرێ ! [5]

******************************

١١٤.مادام (دین) کاڵای پڕ بە باڵایی (ژین)ەو ژیان و گوزەرانی ئینسانیش بەردەوام و بێ پشودان و سرەوتن لە گۆڕان و پەرەستاند و جم و جووڵ دایە، دەبێ ئایینیش بەردەوام لە فراوان بوون لێك کێشرانەوە دابێ تاکو فریایی ژین و گوزەران و گۆڕانکاریی یەکان بکەوێ لێی بەجێ نەمێنێ ![6]❖

---

[1] سەرچاوەی پێشوو لا-٢٣٠-٢٣١

[2] سەرچاوەی پێشوو لا-٤٣٣

[3] سەرچاوەی پێشوو لا-٤٦٧

[4] زانایانی ئیسلام کێن و چۆنن -چاپی یەکەم ساڵی ٢٠٠١ ز-لا-٥٣

[5] سەرچاوەی پێشوو لا-٥٣

[6] سەرچاوەی پێشوو لا-١٠٣

١١٥.بەرنامەو پەیڕەوێك کە پێغەمبەرانی مەزن بانگەوازیان بۆ کردووە، هەم بەرنامەی تێگەیاندن و پێگەیاندنی تاك (فرد) بووە، لە بوارەکانی فیکری و ئەخلاقی داو، هەم بەرنامەی گۆڕین و چاککردن(التغیر الاصح)ی کۆمەڵگا(مجتمع) بووە، لە بوارەکانی ئابووری و سیاسی و کۆمەڵایەتی و عەسکەری دا![1]

******************************

١١٦.ئایین و بەرنامەی پێغەمبەرانی دیکە لەموعجیزەکانیان جیابوو ون، بەڵام پێغەمبەری کۆتایی (ﷺ) بەرنامەو موعجیزەکەی هەریەکن، واتە بەرنامەیەکی پێ دراوە کە لە عەینی بەرنامەبوونی دا موعجیزەشەو لە عەینی موعجیزە بوونیشی دا بەرنامەیە![2]

******************************

١١٧.بەکورتی و پوختی مەبەست لە (ئیسلام): دینی خوای پەروەردگارە، (سبحانە وتعالی) کە لە قورئان و سوننەت دا بەرجەستەیە![3]

******************************

١١٨.زۆر کەس دەیەوێت پێناسەی ئیسلام بکات بە پێناسەیەك کە هەڵقوڵاوی بیرو زەینی خۆیەتی، یان هەڵقوڵاوی واقیعی ئەو کۆمولگایەیە کە تێیدا دەژیی، یان هەڵقوڵاوی بیر و زەینی کە سانێکە کە نەیارن بە ئیسلام جا بێگومان هەموو ئەو جۆرە پێناسانە ناڕەوا و نادروستن، بۆچی؟! چونکە لەڕاستی دا تەنها کەسانێك کە لە ئیسلام دا پسپۆڕ و شارەزان بۆ یان هەیە کە پێناسەی ئیسلام وە مسوڵمانەتیی بکەن، چونکە قسەکردن لە بارەی شتێکەوە کە زانیاریت لە بارەیەوە نیە و نایناسی شتێکی ناڕەوایە و بگرە تاوانێکە لێپرسینەوەی لەسەر دەکرێ![4]

******************************

---

* ئنجا بەسەرنج دانی قورئان سوننەت یش بۆمان دەردەکەوێ کە خوای کاربەجێش سروشتی ئیسلامی هەروا هەڵخستووە یاساو دەستورە گشتی و سەرەکی و نە گۆڕەکان ئینسان و ژیان و، یاسا گچکەو وردە گۆڕاوەکان یشی بۆ لایەنە گۆڕان بەسەر هاتووەکانی ئینسان و ژیان،داناون. هەمان سەرچاوە –ل–١٠٣

[1] مسوڵمانی کامل– بەشی یەکەم –بیروباوەڕی مسوڵمان چاپی یەکەم–ساڵی١٩٩٧ز–ل–٨٨–٨٩

[2] سەرچاوەی پێشوو ل–٩٣

[3] ئیسلام و مسوڵمانەتی و کاری ئیسلامی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوووننەت دا–چاپی یەکەم –ساڵی ٢٠٠٦ ز ل–١٨

[4] سەرچاوەی پێشوو ل–١٨–١٩

١١٩.دەبێ پێناسەی ئیسلام و مسوڵمانیەتیی و دینداریی تەنها لەلایەن کەسانێکەوە بکرێ کە شارەزا و پسپۆڕن لە ئیسلامدا![1]

*******************************

١٢٠.ئیسلام کاڵایەکە پڕ بەباڵای ئینسان وە ئیسلام ڕێباز و بەرنامەیەکی کشتگیرە بۆ ژیانی ئینسان، هەم ئیمان و عەقیدەی تێدایە، هەم لایەنی فیکریی و ڕۆشنبیری و ئەخلاق و ئەدەب و ئابووریی و، کۆمەڵایەتی و، ڕامیاری و، جەنگ و جیهاد و ئاشتی و حوکم و سیاسەت و دەوڵەت و ...هتدی تێدایە![2]

*******************************

١٢١.لە ئیسلام دا ڕێگا لە خەڵك نەگیراوە كە كافربن، بەڵام ڕێگایان لێ گیراوە كە زاڵم بن![3]

*******************************

١٢٢. هەموو ئەوانەی کەبەرنامەی ژیانیان لە خواوە وەرنەگرتوە، ئەوانەن کە بەدوای هیدایەتی خوا ناکەون، وەهەر کەسێك کە بەدوای بەرنامەی خوا ناکەوێ نەزانە بۆ؟چونکە دیارە نازانێ کێ دروستی کردووە! وە نازانێ لە کوێوە هاتوە!،وە نازانێ بۆ کوێ دەچێت! نازانێ بۆچی دروست کراوە! وە نازانێ ئەرك و وەزیفەی چییە لە ژیاندا، وە هەر بەرنامەیەکیش دابنێ بۆ ڕێکخستنی ژیانی لەسەر بناغەی نەزانی و نەفامی دایدەنێ![4]◆



---

[1] سەرچاوەی پێشوو ل-١٩

[2] سەرچاوەی پێشوو ل-٢٨

[3] سەرچاوەی پێشوو ل-١١٩

[4] سەرچاوەی پێشوو ل-١٢٦

◆ بۆچی؟ چونکە تەنها خوای پەروەردگار نهێنیەکانی ئینسان و ژیان و بوونەوەر و دنیاو دوا ڕۆژ دەزانێت و ژیانی ئینسانیش پەیوەندی هەیە بەدنیاو دواڕۆژەوە و، پەیوەندی هەیە بەڕووح و جەستەوە و بەئێستا و داهاتووەوە و، بەتاك و خێزانەوە، وە جا ئەو زانیارییە دەورەدەر (محیط)ە ش تەنها لای خوای پەروەردگارە هەر بۆیەش خوای بەرز و بێ وێنە لە بارەی قورئانەوە دەفەرموێ (قُلْ أَنْزَلَه الَذي يَعْلَمُ السِّرَّ فِي السَّمَاوات وَالأرض) هەمان سەرچاوە و لاپەڕە

١٢٣.ئه‌م دینه‌ هه‌ر دینی تاك نیه‌، به‌ڵكو دینی تاك و كۆمه‌ڵه‌، وه‌ ته‌نیا دینــی مزگـه‌وت نیـه‌، بـه‌ڵكو دینی مزگه‌وت و بازه‌ڕه‌، وه‌ته‌نیا دینی سه‌ردوانگه‌(منبر)نیه‌، به‌ڵكو دینی فه‌رمانگه‌(دائرة) شه‌ ![1]

******************************

١٢٤.دیـن و ده‌وڵـه‌ت لـه‌ ئیـسلامدا دووشـتی تێكهه‌ڵكێـشن و دوو دیـوی یـه‌ك سـككه‌ن دوو ڕووی حه‌قیقه‌تێكن![2]

******************************

١٢٥.داڕنین و لابردنی حوكم و سیاسه‌ت له‌ ئیسلام، واته‌ له‌یه‌ك پچڕاندن و ترازاندنی خودی ئیـسلام و پارچه‌ پارچه‌كردنی![3]

******************************

١٢٦.زاراوه‌ی پیاوانی دینی هیچ په‌یوه‌ندییه‌كی بـه‌ ئیـسلامه‌وه‌ نیـه‌، چـونكه‌ لـه‌ ئیـسلام دا هـه‌موو پیاوان ده‌بێ پیاوانی دینی بن و هه‌ر كه‌سێك بڕوای به‌دین هه‌یه‌ ده‌بێ پیاوی دیـن بـێ، وه‌ زانایـانی دینی كۆمه‌ڵێكی دیاریكراو و تایبه‌ت نین له‌ نێو مسوڵماناندا![4]

******************************

١٢٧.ئیسلام بڕوای به‌وه‌ هه‌یه‌ كه‌ جیهان بۆ خۆی چۆنه‌ ئاوا ته‌عامولی له‌گه‌ڵ دا بكه‌ین، نه‌یگۆڕین و ده‌سكاری نه‌كه‌ین و خه‌ڵكی جیهان چۆنه‌ ئاوا ته‌عامولیان له‌گه‌ل بكه‌ین، مه‌گه‌ر به‌شێوه‌ی بانگه‌واز و ئیقناع كردن و تێگه‌یاندن و له‌ ده‌روونه‌وه‌ بیانگۆڕین![5]

******************************

١٢٨.دوای ئـه‌وه‌ی خـوای پـه‌روه‌ردگار و كابـه‌جێ زانیوویـه‌تی مرۆڤایـه‌تی گه‌یـشتۆته‌ قۆناغێـك شایسته‌ی ئه‌وه‌یه‌ و ده‌توانێ كه‌ بـه‌هۆی ته‌كنـه‌لۆژیاوه‌ و بـه‌ هـۆی پێگه‌یـشتنی فیكرییـه‌وه‌ كارێـك بكات یه‌ك كۆمه‌ڵگای یه‌كگرتوو له‌سه‌ر زه‌وی بنیات بنێ وڵاته‌ دووره‌كـان لـه‌ یـه‌ك نزیـك بخاتـه‌وه‌ و پێكیانه‌وه‌ گرێ بدات وه‌ك ده‌ڵێن دنیا بكاته‌ دێیه‌ك خوای په‌روه‌ردگار كه‌ ئـه‌وه‌ی له‌بـه‌ر چـاو بـووه‌

---

[1] سه‌رچاوه‌ی پێشوو لا-١٥٦

[2] سه‌رچاوه‌ی پێشوو لا-١٩٨

[3] سه‌رچاوه‌ی پێشوو لا-٢٢٥

[4] چه‌ند مه‌سه‌له‌سه‌كی باوی سه‌رده‌م سه‌رنجێكی واقیعیانه‌و هه‌ڵسه‌نگاندنێكی شه‌رعییانه‌-چاپی چواره‌م - سانی -٢٠٠٥ ز-لا-١١١

[5] سه‌رچاوه‌ی پێشوو-لا-١٨٣

دینێکی ناردووە کە بۆ هەموو مرۆڤایەتی بشێ، بەڵێ ئەگەر سەرنج بدەین بە ڕوونی دەبینین کە ئاینەکانی دیکەی پێش ئیسلام زیاتر دینی قەومی بوونە و هەرکام لە (هود و صالح و شعیب و لوط و موسی و عیسی و هتد...) علیه الصلاة والسلام ، فەرموویانە (یاقومی ) هەر کامێکیان تەنها لەگەڵ نەتەوەی خۆی دا قسەی کردوە، بەڵام پێغەمبەری کۆتایی ( ﷺ ) لەبەر ئەوەی کە دوایین ئاین و پەیامی خوای پێیە لەگەڵ هەموو بەشەریەت دا قسەی کردووە ![1]

******************************

١٢٩.ئیسلام دینێکی خوایی یە و دینێکی ئینسانی یەو بۆ هەموو بە شەریەت هاتوە، بەڵام بە پێچەوانەی سیستەمە جاهیلی و طاغووتیەکانەوە نەهاتوە کە هەندێك خەڵکی بکاتە خزمەتکاری هەندێکی دیکەیان و هەندێکی لە ژێر پێی هەندێکی دا بپڵیشێنێتەوە، وە نەهاتووە خەڵك وەك کۆمپانیا و کارگەو شەریکەیان تەماشا بکات، کە هەرچی زیاتر بەرهەمیان پێ وەدەست بهێنێ ![2]

******************************

١٣٠.ئیسلام هەموو شتێك لە ڕوانگەی قیەم و ئەخلاقەوە تەماشا دەکات لە ڕوانگەی خوا و قیامەت و ڕەحم و بەزەیی و ویژدانەوە تەماشا دەکات![3]

******************************

١٣١.ئیسلام هیچ شتێکی تێدانیە کە لەگەڵ عەقڵ و فیطرەت دا دژو پێچەوانە بێت، یان لەگەڵ بەرژەوەندییەکی ڕاستەقینەی تاك و کۆمەڵ تێك بگیرێ![4]

******************************

١٣٢.ئیسلام تەنها لە کەسانێك بەرپرسیارە کە بەپێی ئیسلام چووینە سەر حوکم! [5]

******************************



[1] سەرچاوەی پێشوو-لا-١٨٤
[2] سەرچاوەی پێشوو-لا-١٨٧
[3] سەرچاوەی پێشوو-لا-١٩٠
[4] سەرچاوەی پێشوو-لا-١٩٩
[5] سەرچاوەی پێشوو-لا-٢٠٨

١٣٣.یاسادانان و دەسەڵاتی یاسادانان لە ئیسلام دا هەر بە سروشت سەر بەخۆ و جیایە لە هەردووك دەسەڵاتی جێبەجێکرد و دادگا![1]

*****************************

١٣٤. ئیسلام بەدیلە بۆ دیموکراسی و هەر رێچکەو رێبازیکی دیکەش، چونکە ئیسلام لایەنە چاك و ئیجابیەکانی هەموویانی لە خۆیدا کۆکردوتەوەو لەهەڵەو کەم و کورپییەکانیشیان دوورە![2]

*****************************

١٣٥.ئیسلام سەرجەم خاڵە بە هێز و ئیجابی یەکانی دیموکراسی گرتوتە نێو خۆی بەڵام، بەشێوەیەکی چاکترو بەدووریش لەکەم و کورپییەکانیان، وە لەخاڵە خراپ و بێ هێزەکانیشی بەرییە! [3]♦

*****************************

١٣٦.پەیداکردن و داهێنان(الأحداث والأبتداع) لەدین دا چەند خراپە تازەگەری و داهێنان( التجدید والابداع) لە ژین دا هێندە پێویستە![4]

*****************************

١٣٧. ئیسلام ئیسلامە نە ئایدیالیزمە و نەماتریالیزم![5]

*****************************

١٣٨.لە ئیسلام دا دین و ژین و حوکم و حیکمەت و سیاسەت و عیبادەت تێکهەڵکێشن![6]

*****************************

١٣٩.موعجیزەی پێغەمبەری ئیسلام، موعجیزە یەکی علمی و فیکریی یە کە قورئانە![7]

---

[1] سەرچاوەی پێشوو-لا-٢٢٩

[2] سەرچاوەی پێشوو-لا-٢٣٥

[3] سەرچاوەی پێشوو-لا-٢٣٦

♦ بەتایبەت جەوهەرو نێوەرۆکەکەی کە بریتیە لە جیاتی خوا بە پەرستراو دانانی ئینسان کە لەپەرلەمان و ئەنجومەنێك دا خۆی دەنوێنێ کە بەبێ ئیزنی خوا بەرنامە و دەستوور و یاساکانی ژیان بۆ خەڵك دادەنێ!

[4] سەرچاوەی پێشوو-لا-٢٧٣

[5] دەبەرێك راچوونی ئیسلام و رێچکان -چاپی سێیەم -ساڵی ٢٠٠٦ ز-لا-٥٩

[6] تەوژمی ئیسلامیی و عەلمانی خاڵە هاوبەش و جیاوازەکانیان-چاپیەکەم -ساڵی ٢٠٠٨-لا-١٠٤

[7] سەرچاوەی پێشوو-لا-١٠٧

١٤٠.کەسی یەکەمی دەسەڵاتی سیاسی لە ئیسلام دا نەسێبەری خوایە و نەوەکیلیشیەتی، بەڵکو وەکیل و نوێنەری خەڵکە بۆ جێبەجێ کردنی شەریعەتی خوا بەسەریان داو، خۆیشی پێش هەموویان و لەهەموو چاکتر لەسەری پێویستە پێیەوە پابەند بێ و، شەرعییەت پێدران و لێ ستێرانەوە یشی پەیوەستە بە ئیرادەی خەڵکەوە ![1]

********************************

١٤١.ئیسلام چ بەتێوری(نظري) و وەك دەقەکانی قورئان و سوننەت و، چ بەکردەوەیی و جێبەجێ کردن، (تطبیق) ژمارەی قیاسی شکاندوە لە مێژووی مرۆڤایەتی دا لە سەماحەت و سینەفراوانی و مەدارکردن و ئاین و بیروبڕوای جیاواز تەحەمولکردن دا ![2]

********************************

١٤٢.ئەوانەی کە قیاسی ئیسلام ومێژووی ئیسلام، لەسەر نەصرانییەت و مێژووەکەی دەکەن، خراپ بە هەڵە دا نەچوونە و ئەو پەندە کوردی یەیان بەسەردا نە چەسپیوە کە دەڵێ (زاری بەشیر سووتا بوو فووی لە دۆش دەکرد!) ؟! بیگومان با![3]

********************************

١٤٣.ئەو ئاین و بەرنامەیەش کە بە پێغەمبەری کۆتای خۆیدا بۆ مرۆڤایەتی ناردوویەتی کاڵایەکە پڕ بەباڵای مرۆڤ و وەڵامی هەموو پرسیارێك و چارەسەری هەمو کێشەیەك و دەرمانی هەموو دەردێکی پێیە![4]

********************************

١٤٤.شەریعەتی خوای زانا و شارەزا بەگوێرەی مامەڵەی کاربەجێیانەی خۆی بۆ شتی چەسپاو و نەگۆڕ یاساو حوکمی چەسپاوو نەگۆڕ بۆ هی گۆڕاویش یاساو حوکمی گۆڕاو و گۆڕانکاریی هەڵگری داناون![5]

********************************



[1] سەرچاوەی پێشوو-لا-١١٢-١١٣
[2] سەرچاوەی پێشوو-لا-١١٤
[3] سەرچاوەی پێشوو-لا-١١٦
[4] سەرچاوەی پێشوو-لا-١٤٩
[5] سەرچاوەی پێشوو-لا-١٦٥

١٤٥.پێویستی هەبوونی ئیسلام بە دەوڵەت لەورووەوەیە کە ئیسلام بە پێچەوانەی حاڵی بوونی هەندێك کەسەوە، وەك ئایینی شێوێنراوی نەصرانیی نیە کە تەنیا پەیوەست بێ بە تاك (فرد)ەوە و لە جوغزی لایەنی عەقیدەیی و ڕووحی و ئەخلاقی داکورت هەڵهاتبێ![1]

******************************

١٤٦. لە ئیسلام دا حکومەت مەدەنیی یە نەك ئایینی و، حوکمڕانیش وەکیلی خەڵکە نەك هی خوا![2]

******************************

١٤٧.ئەگەر بەپێی دیموکراسی و سیکۆلاریزم مافی ڕەوای هەرهاوڵاتییەکە ڕەخنە لە حکومڕان و کار بەدەستان وسیاسەت مەدارانی وڵات بگرێ و، هەڵە و کەم و کووڕیی یەکانیان بخاتە بەرچاوو پەنجە بخاتە سەر برینەکانیان، ئەوە لەئیسلام دا ڕەخنە لێگرتن و ڕاستکردنەوەی هەڵسوڕاوانی بواری حوکم و سیاسەت، وێڕایی ماف بوون، ئەرکێکی شەرعی و پێویستیشە![3]◆

******************************

١٤٨.لە ئیسلام دا ژیانی دنیا مەنزڵگای کۆتایی و ئامانجی هەرە بەرز نی یە، بەڵکو دنیا کێڵگەی دواڕۆژە و ئامراز و هۆکاری وەدەستهێنانی بەختەوەری و سەرفرازی ڕاستەقینە یە کە بریتیە لەگەیشتن بە ڕەزامەندی خوا و نیشتەجێ بوون لە بەهەشتە ڕازاوە و نەبڕاوەکانی خوای بەخشەر و بە بەزەیی دا![4]

******************************

---

[1] سەرچاوەی پێشوو-لا-١٨٣

[2] سەرچاوەی پێشوو-لا-٢١٧

[3] سەرچاوەی پێشوو-لا-٢٣٥

◆ ئاشکراشە کەئەرك (واجب) و ماف (حق) لەیەك جیان -بەتایبەت لەئیسلام دا -چونکە مرۆڤ دەتوانێ چاوپۆشی لەمافەکەی بکات و دەستبەرداری بێ، بە تایبەت ئەگەر بزانێ سەرئێشەی بۆ پەیدا دەکات !بەڵام ئەرك، چونکە لێپرسینەوەو سزای لەدوایە و، مرۆڤ سەرپشك (مختار) نیە لەکردن و نەکردنیدا، وا بەئاسانی دەستی لێهەڵناگرێ!

[4] سەرچاوەی پێشوو-لا-٢٥٢

١٤٩.ئیسلام هاوکات لەگەڵ ئەوەدا کە دان بەموڵکایەتی تاك دا دێنێ، بەهۆی دانانی، چەند بەند و مەرج (قیدو شرط) ێکەوە نینۆکی دەکات و ناهێڵێ زیان بە بەرژەوەندی گشتی بگەیەنێ ![1]

*******************************

١٥٠.سیستەمی ئابوری ئیسلام لایەنە چاکەکانی هەرکام لە کاپیتالیزم و سۆسیایزمی لە خۆدا کۆکردونەتەوە و، لەکەم کورپی و عەیبەکانیشیان سەلامەت و پارێزراوە ![2]

*******************************

١٥١.ئیسلام وا تەماشای مرۆڤایەتی دەکات کە زادەو بەرهەمی خێزانێکەو هەموویان خاوەنی یەك ڕیشەو بنەچەکەن و، هیچ کەس و کۆمەڵ و تیرە و گەلێك پلە و ئیمتیازی بەسەر یەکێکی دیکە دانیە ![3]

*******************************

١٥٢.ئیسلام و سیکۆلاریزم هەرچەندە دوو ئایین و بەرنامەن و لەڕووی سەرچاوەی لێوە هەڵقوڵینیانەوە زۆر لە یەك جیاوازن و نێوانیان ئاسمان و زەوییە، چونکە یەکەمیان لەزانیاری و حیکمەتی بێ سنووری خوا -عز وجل-و ، دووەمیشیان لە بیرو هۆشی پڕ هەڵەو پەڵەی مرۆڤەوە هاتوە، هەرچەندە کۆمەڵێك جیاوازیی سەرەکیشیان لە نێوان دا هەن، بەڵام لەچەند شتێکیش دا کەم و زۆر یەکدەگرنەوەو پێك دەگەنەوە ![4]

*******************************

١٥٣.ئیسلام لەگەڵ سەرجەم ئایین و بەرنامەکانی دیکەش دا کەم و زۆر خاڵی لێکچوون و پێکگەیشتنی هەن و، هەر هەق و ڕاستییەکی بچووکیان لە لابێ ئیسلام بەشێوەیەکی چاکتر لە لایەتی ![5]

*******************************

١٥٤.بێگومان خاڵە هاوبەشەکانی نێوان ئیسلام و سیکۆلاریزم، ئەو شتانەن کە عەلمانییەت هەقی تێدا پێکاون، خاڵە جیاوازەکانیشیان ئەو شتانەن کە تێیدا گیرۆدەی هەڵەو ناهەقی بووە، هەر بۆ

[1] تەوژمی ئیسلامی و عەلمانی خاڵە هاوبەش و جیاوازەکانیان-چاپی یەکەم -ساڵی ٢٠٠٨ ز-لا-٢٦١

[2] سەرچاوەی پێشوو-لا-٢٦٣

[3] سەرچاوەی پێشوو-لا-٢٨٩

[4] سەرچاوەی پێشوو-لا-٣٢٥

[5] سەرچاوەی پێشوو-لا-٣٢٥

یەش هەق و ڕاستیی ڕەها (مطلق) لە هەموو ڕوێکەوە بەس لە ئیسلام دایە، کەدواین نوسخەی هیدایەتی خوا و تاکە سروش (وحی) ێکی خوایی پارێزراو دەستکاری نەکراوی بەردەستی مرۆڤایەتی یە لەم ڕۆژگارەماندا، بەڵام ئایین و بەرنامەکانی دیکە کە زادەی ئەو هیدایەت و ڕووناکییە نیسبی یەن کە خوا – عز وجل – لە عەقڵ و فیطرەتی مرۆڤەکاندا داینـاوە، هەق و ناهەقیان تێدا تێکەڵ و ئاوێتە بووە ! [1]

*******************************

١٥٥.با هیچ کەس ترس و بیمی ئەوەی نەبێ کە لە پەنای مسوڵمانان و لەژێر سایەی ئیسلام دا ناژی و ناحەوێتەوە، مەگەر مسوڵمانان ناحاڵیی و لە ئیسلام بەجێماو، ئیسلامیش گۆڕاوو شێوێنراو بێ، بەڵام ئەوەی جێگای بیم و مەترسی و دڵە ڕاکێیە ئەوەیە کە ئیسلام و ئەهلی ئیسلام لە پەناو سێبەری غەیری خۆیان دا جێیان نەبێتەوە و نەحەوێنەوە، وەك لەم ڕۆژگارە دا دەبینین کە ئیسلام و مسوڵمانان لە سایەی حیزب و ڕژێمە عەلمانی یەکان دا دووچاری گرفت و کێشەو سەغڵەتییەکی یەکجار گەورە و بێڕەزا بوونە، ئیدی بەهیوای ئەوەی کە هەموو لایەك عەقڵ و دڵی خۆمان گەورەترو فراوانتر بکەین و خۆمان واڵێ بکەین کە بتوانین لەگەڵ هەموو ئەوانەدا بژین و بحەوێینەوە کە لەگەڵمان جیاوازیی یان هەیە ! [2]

*******************************

١٥٦.پێویستە ئەو ڕێڕوونی و بەرنامەیەی کە ئینسانی پێ بەڕێوە دەچێ و ژیانی کۆمەڵگای پێ ڕێك دەخرێ، لەسەر چاوەیەکەوە بێ کە خاوەنی زانیاری یەکی تێر و تەواو بێ و ڕابردوو و ئیستاو داهاتووی ژیانی لێ دیاربێ، وەدەبێ هیدایەت و بەرنامەی ژیانی ئینسان لەسەرچاوەیەکەوە بێ کە ئینسان لە سەروی خۆیەوە ببینێ و لێی دڵنیا بێ و پێی پشت ئەستوور بێ و جێی شەرم و سام و ڕێزی بێ، جا بێگومان ئەو سەرچاوەش بەس خودای پاك و تاك و زانا و کاربەجێ یە ! [3]

*******************************



(١) سەرچاوەی پێشوو–ل–٣٣٥–٣٣٦

[٢] سەرچاوەی پێشوو–ل–٣٢٨

[٣] پرۆژەی بەرنامەی فکری ی کاری ئیسلامیی –چاپی یەکەم –ساڵی ١٩٩٦ ز–ل–١٣

١٥٧.قورئان (متن) ی ئیسلامە و سوننەت لێکدانەوە (شرح) یەتی کەواتە کەسێك بیەوێ لە ئیسلام شارەزا بێت پێویستە لە سەرەتاوە بەقورئان (متن) دەست پێ بکات و دوایی بێتە سەر سوننەت (شرح) نەك بەپێچەوانەوە ![1]

*******************************

١٥٨.قورئان بەسەر سونەت دا حاکمە و سوننەت لە خزمەتی دایە، بۆیە هیچ کاتێك سوننەتی صەحیح لەگەڵ قورئان دا تێك ناگیرێن![2]♦

*******************************

١٥٩.ئیسلام هیدایەتە بۆ ئینسان، پاشان بەرنامەیە بۆ ژیان ![3]

*******************************

١٦٠.باوا ئیسلام بناسین و بەرێوەی بەرین کە پێغەمبەر(ﷺ) و یاوەرە وەفادارەکانی تێی گەیشتوون و بەرێوەیان دەبرد کە هەم تێروانین بوو هەم بیروباوەڕ هەم خوا پەرستی بوو هەم رەوشت و خوو و هەم تەقوا بوو هەم غەزا ...هتد با ئێمەش چیدی بە بەهانەی گرتنی بەشێك و لایەنێکی ئیسلامەوە لایەن و بەشەکانی دیکەی واز لێ نە هێنین، با دڵنیابین کە ئیسلام نەبیروباوەڕی رووتە نەپەروەردەی بە تەنهایە، نە تەزکیەو (تصوف) ی جیا لە مشورخواردن لە دەردی کۆمەڵگایە، نە رێکخستنی (تنظیم)و کاری سیاسی و دوور لە تەقوایە نەخواپەرستی و دنیا بە کەم گرتن (الزهد) لەگەڵ خەبات و جەنگ پێکەوە دژن، نە کارو کاسبیی نێو بازاڕ لەزیکر و پاڕانەوە و نوێژی نێو مزگەوتێ جیایە، چونکە ئیسلام بەرنامە و پەیرەوی ژیانی تاك و کۆمەڵە و ژیانیش هەموو ئەو بوار و لایەنانەی تێدایە ![4]

*******************************

---

[1] سەرچاوەی پێشوو-ل-١٧

[2] سەرچاوەی پێشوو-ل-١٧-١٨

♦ کەوابێ هەرکاتێك دژایەتی لە نێوان دەقێکی سوننەت و ئایەتەکانی قورئان دا بینرا، ئەگەر بە ( تأویل) کردنی یەکێکیان دژایەتی یەکە لاچوو ئەوا باشە ئەگەرنا ناچارین دەست بەرداری ئەو دەقەبین و بڵێین (ئەم دەق-نص- ە بەهەڵە رەگەڵ سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) کەوتووەو هی ئەو نییە.

[3] سەرچاوەی پێشوو-ل-١٠٨

[4] سەرچاوەی پێشوو-ل-١١٣

١٦١.ئیسلام پەیڕەو و بەرنامەی ژیانی تاك و کۆمەڵە و بۆیە هاتووە کە واقیع و حاڵی کۆمەڵگا چاك بکات و بگۆڕێ، لە کوفرەوە بۆ ئیمان، لە ستەمەوە بۆ داد، لە خراپەوە بۆ چاکە، لە ئەفسانەوە بۆ زانست، لە جێمانەوە بۆ بەرەو بۆ پێش چوون لە زەبوونی یەوە بۆ عیززەت مەندی لە هەژاری یەوە بۆ دەوڵەمەندی و، بەکورتی لە نەفامی (جاهلیة)یەوە بۆ ئیسلام ![1]

*******************************

١٦٢.ئیسلام بۆ هێنانەوەو خەملاندنی واقیعێکی ئیسلامیی ڕەسەن هاتوە و، ڕازی نابێ بکرێتە پینەچی بۆ پینەو پەڕۆی واقیعێکی نەفامی و نا شەرعی ![2]

*******************************

١٦٣.دوژمن و ناحەزانی خوا و ئیسلام و مسوڵمانان لە ماهیەت و جەوهەردا لە هەموو چاخ و قۆناغەکانی مێژوودا هەریەکن و ئەوەی گۆڕانی بەسەردا دێت تەنها دیکۆر و ڕواڵەتیان و ئەو تابلۆ دروشمانەیانن کە خۆیانیان پێ دە ناسێنن ![3]

*******************************

١٦٤.(دین) ێك کە خوا بۆ هەموو پێغەمبەرانی ناردووە (علیه الصلاة والسلام) تەنیا ئیسلامە، ئیسلام بەچەمك و واتا حەقیقی و زمانەوانییەکەی نەك بە مەفهومە عورفییەکەی کە ئیسلام بەمەفهوومی عورفی بریتیە لەو شەریعەتەی کە بۆمحمەد(ﷺ) پێغەمبەری کۆتایی نێردراوە ![4]

*******************************

١٦٥.لە ئیسلام دا قاعیدە دەبێ بەقسەی قیادە بکات، بەڵام بە بەرچاو ڕوونی یەوەو لەسنووری شەرعدا ![5]

*******************************

١٦٦.ئیسلام هەڵقوڵاوی زانیاری بێ سنووری خوایە کە حاکمی تێکڕای (بوون)ە ![6]

---

[1] سەرچاوەی پێشوو-لا-١٢١

[2] سەرچاوەی پێشوو-لا-١٥٩

[3] سەرچاوەی پێشوو-لا-٢٢٢

[4] زنجیرە بابەتە هەنوکەییەکان ئەڵقەی چوارەم -چۆنیەتی بوونە پێشەنگ و بنیاتنانی بنکەی جەماوەریی- چاپی یەکەم -ساڵی ٢٠٠٧ ز-لا-١٤

[5] سەرچاوەی پێشوو-لا-٣٦

[6] سەرچاوەی پێشوو-لا-٥٥

١٦٧.بە هیچ ڕەنگێك ناگونجیٚ حوکم و سیاسەت و سەرپەرشتی کردنی گەل و وڵات لە شەریعەتی خوا دابڕنریٚ و لەیەك بترازێنرێن لە نێو کۆمەڵگاو خەڵکێکیدا کە دەیانەویٚ بەمسوڵمانەتی بژین و شەریعەت سایەو سێبەریان بیٚ![1]

******************************

١٦٨.کاتێك سەرنجی ژیانی سەروەری پێغەمبەران و گەورەترین و بەرزترین ئینسان دەدەین، دەبینین

عەقیدەو شەریعەت و

عیبادەت و سیاسەت و

حوکم و حیکمەت و

پارێزکاریی و فیداکاریی و

مزگەوت و بازاڕ و

دنیاو دواڕۆژ و

لەبەر خوا گریان و سوپا پێکەوەنان و

خەڵك تەزکییە کردن و دەوڵەتداریی کردن و

بەکورتی: دینداریی و دنیاداریی، پێکەوە گریٚ داون و سەرجەم لایەن و بوارەکانی دین و ژینی ڕەچاو کردوە و هیچ شتێکی بۆ شتێکی فەرامۆش نەکردوە![2]



******************************

١٦٩.خوایی بە بەزەیی (سبحانە وتعالى) هەموو ئەو لایەن و بوارانەی ژیانی ئینسان کە زیاتر بەرووح و ماهیەتییەوە پەیوەستن و ناگۆڕێن یان کەمتر وایە گۆڕانیان بەسەردا بێت وەك ئیمان و عەقیدەو عیبادەت و ئەخلاق و ئاکار و بنیاتنانی خێزان، کۆمەڵێك یاسای ورد و تەفصیلی بۆ داناون و نوختەیان تێدا خراونە سەر پیت، بەڵام ئەو لایەن و بوارانەی دیکەی ژیان و گوزەران کە گۆڕانیان بەسەر دادیٚ و زیاتر پەیوەستن بە جەستەو ڕواڵەت و دیوی ماددی ژیانەوە وەك سیاسەت و ئابووری و جەنگ و ئاشتی، خوای زاناو شارەزا بەوەندە وازی هێناوە کە کۆمەڵێك بنەماو هێڵی

[1] زنجیرەی بابەتە هەنوکە ییەکان (ئەڵقەی پێنجەم) سیاسەتی ئیسلامیی و چەند ڕونکردنەوەیەك-چاپی یەکەم ساڵی ٢٠٠٧ ز-ل-١٦

[2] سەرچاوەی پێشوو-ل-٢٠

گشتیان بۆ دابنێ کە چوارچێوەو بازنەیەکی فراوانیان بۆ دیاری بکات و چەندان ناوچەی بۆشایی (مناطق الفراغ ) یش بهێڵێتەوە ![1]

*******************************

١٧٠.ئەگەر هاتباو شەریعەت لەو لایەن و بوارانەدا* وەك لایەنەن و بوارەکانی عەقیدەو عیبادەت و ئەخلاق و خێزان نوختەی تێدا خستبایە سەر پیت و وردەکارییەکانی باسکردبایە، یان دەبوو بەگوێرەی ئاستی ئەو سای کۆمەڵگاکان دیاری کردبایە کە بێگومان لەبەر سادەیی و ساکاریی لەگەڵ قۆناغەکانی دیکەی ژیانی بەشەردا نەدەگونجا ! یان دەبوو بە پێی دواقۆناغی گەشەسەندووی ژیانی بەشەر بووایە کە دیارە ئەو کاتەش بۆ قۆناغەکانی پێشتر نەگونجاو نەدەبوو، واتە: ئەگەر بە گوێرەیی قۆناغ و هەل و مەرجی دابەزینی قورئان بووایە، دوایی بۆ قۆناغەکانی دیکەی داهاتوو تەنگ(ضيّق) دەردەچوو، وە ئەگەر بە گوێرەی دواقۆناغی گەشەکردنی ژیان و گوزەرانی بەشەر بووایە بۆ قۆناغەکانی پێش خۆی فشوفۆڵ (فضفاض) دەبوو![2]

*******************************

١٧١.لە کاتێکدا کە شەریعەت لە بواری جیهانبینی و ئیمان و عەقیدە و عیبادەت و ئەخلاق و خێزان دا کارێکی کردوە کە مرۆڤ ئەرکی کۆشش کردن و خۆماندوو کردنی لەکۆڵ بکەوێ، لە بواری هەڵسوکەوتەکاندا بەپێچەوانەوە کارێکی کردوە کە بەجیددی خەم بخوات و کۆشش بکات تاکو وردەکاریەکانی ئەو بوارە لە چوارچێوەی فراوانی شەریعەت و بنەما سەرەکیە کانیدا دیاری بکات ![3]

*******************************

١٧٢.پابەندی حکومەت بەشەریعەتەوە تەنها ئەوەیە کە رووح و هەناوی بۆ پەیدا دەکات و لەلادان و خلیسکان دەیپارێزێ، ئەگەر نا ڕێی هیچ شتێکی چاك و سود بەخشی بۆ خەڵك و کۆمەڵگا لێ ناگرێ، وەك مێژووی (١٣٠٠) ساڵەی دەوڵەتی ئیسلامی سەلماندوویەتی ![4]

---

[1] سەرچاوەی پێشوو-ل-٢٩

* لایەن و بوارەکانی حوکم سیاسەت ئابوری و هاوشێوەی ئەمان -ئامادەکار

[2] سەرچاوەی پێشوو-ل-٣٠

[3] سەرچاوەی پێشوو-ل-٣٢

[4] سەرچاوەی پێشوو-ل-٣٢

١٧٣.به‌ دیلی پابه‌ندیش به‌ شه‌ریعه‌تی خواوه‌ – كه‌ له‌ قورئان و سوننه‌ت دا به‌رجه‌سته‌ یه‌ – شوێنكه‌وتنی هه‌واو ئاره‌زووی نه‌زانانه‌ و جێگره‌وه‌ی حوكم و به‌رنامه‌ی خواش ته‌نیا حوكمی نه‌فامانه‌ ![1]

******************************

١٧٤.پێویسته‌ شه‌ریعه‌ت تاكه‌ چاوگی ده‌ستوور و ته‌نیا سه‌رچاوه‌ی یاسادانان (تشریع) یش بێت، ئه‌و جار ئیسلام كردنه‌ ئایین و به‌رنامه‌ی ژین و شوێن شه‌ریعه‌ت كه‌وتن، دێته‌ دی ![2]

******************************

١٧٥.ته‌نیا كاتێك به‌س خوا به‌ په‌روه‌ردگار و خاوه‌ن و سه‌روه‌ر ده‌گیرێ، كه‌ ئایین و شه‌ریعه‌تی خوا له‌ هه‌موو ڕووێكه‌وه‌ په‌یڕه‌وی لێ بكرێ و بكرێته‌ به‌رنامه‌ی ڕێكخه‌ری ژیان و گوزه‌ران به‌ هه‌موو بواره‌كانییه‌وه‌، هه‌روه‌ها به‌س كاتێك خوا به‌ ته‌نها ده‌په‌رسترێ كه‌تاك و كۆمه‌ڵ وه‌ك چۆن نیشانه‌و دروشمه‌كانی خواپه‌رستی (شعائر العباده) ته‌نیا پێشكه‌شی خوا ده‌كات و به‌شی كه‌سی دیكه‌یان تێ ناخات، به‌رنامه‌كانی زینده‌گی (شرائع الحیاة) یش ته‌نها له‌ خواو شه‌ریعه‌ته‌كه‌یه‌وه‌ وه‌رده‌گیرێ و ژیانی تاكیی و خێزانیی و كۆمه‌ڵیی له‌ هه‌موو بواره‌كانی: سیاسه‌ت و ئابووری و كۆمه‌لایه‌تی و جه‌نگ و ئاشتی و ئه‌خلاقیی و ...هتد دا به‌ پێی یاساكانی شه‌ریعه‌ت ڕێك ده‌خات ![3]

******************************

١٧٦.ئیسلام ده‌ڵێ مادام ته‌نها خوا تبارك وتعالى به‌دیهێنه‌ر و خاوه‌ن په‌روه‌ردگاری جیهانه‌كانه‌، پێویسته‌ ته‌نها ئه‌ویش بپه‌رسترێ و به‌ندایه‌تی بۆ بكرێ و په‌یڕه‌وی له‌ شه‌ریعه‌ته‌كه‌ی بكرێ و، بێجگه‌ له‌وی هیچ كه‌س و لایه‌نێك مافی ئه‌وه‌ی نیه‌ و شایسته‌یی ئه‌وه‌ی نیه‌، كه‌ خه‌ڵك بیكه‌نه‌ په‌روه‌ردگار و په‌رستراو حاكمی خۆیان ![4]

******************************



[1] سه‌رچاوه‌ی پێشوو-ل-٣٤
[2] سه‌رچاوه‌ی پێشوو-ل-٣٥
[3] سه‌رچاوه‌ی پێشوو-ل-٣٦
[4] سه‌رچاوه‌ی پێشوو-ل-٥٢

١٧٧.(لەئیسلام دا)* دەسەڵات هی خەڵك و کۆمەڵگایەو لە سنووری شەریعەتدا دەستی واڵایە![1]

******************************

١٧٨.حوکم و سیاسەت لایەنێکی گرنگی ئیسلامەو سەرگەرم بوونی مسوڵمانانیش بەلایەنی سیاسییەوە و چۆنیەتی ئاراستە کردن و ڕێکخستن و بەڕێوەبردنی ژیان و گوزەرانی خەڵك بەپێی شەریعەتی تێرو تەوا و گشتگیر خوا نەك هەر مافێکی ڕەواو ئاسایی، بەڵکو ئەرکێکی شەرعیی گەورەو گرنگی سەرشانیانە و بەکەم تەرخەمی تێدا کردنی گوناهبار و دووچاری تۆڵەو سزای دوا ڕۆژ دەبن![2]

******************************

١٧٩.حوکم و سیاسەت بەشێك و لایەنێکی گەورە و گرنگی ئایین و شەریعەتی کامڵ و گشتگیری خوایەو (شەریعەت و سیاسەت) دووشتی تێکهەڵکێش و پێکەوە پەیوەست و کرێدراون و هەرگیز ناگونجێ لە یەك دابڕێن!![3]

******************************

١٨٠.ئینسان ئەگەر بەپێی بەرنامەی خوا بەڕێوەنەچێ، سەری لە زوڵم و ستەم و نەفامییەوە دەردەچێ، بەڵام کاتێك کە پابەندبێ بە بەرنامەی خواوە، خراپە و زوڵمەکەی دەگۆڕێ بۆ چاکەو داد، وە نەزانیی و نەفامییەکەیشی دەگۆڕێ بۆ زانیاری و زانست، چونکە بەرنامەی خوا بەرچاوی ئینسان ڕۆشن دەکاتەوە بەڕووناکی (وحی) و زانیاری پێدەدات دەربارەی خۆی، دەربارەی ژیانی، دەربارەی بوونەوەر، دەربارەی ڕابردووی، دەربارەی داهاتووی، وە دەربارەی ئەرکی لەم ژیانە دا، وە هەروەها چۆنیەتی پەیوەندی لەگەڵ خوای پەروەردگاردا، وەسەرەنجام و پاشەڕۆژی![4]

******************************

---

* ئەوەی لەناو کەوانەکەدایە لەسیاقی ووتەکەی مامۆستادا نی یە، بەڵام بابەتاکانی پێشتر باس لەم بابەتە دەکەن وە هەروەها هیچ کاریگەرییەکی لەسەر ناوەڕۆکی وتەکە نابێت، بەڵکو بەشێوەیە جوانترو تەواتر دەبێت . ئامادەکار

[1] سەرچاوەی پێشوو-لا-٦٢

[2] سەرچاوەی پێشوو-لا-٨٠

[3] سەرچاوەی پێشوو-لا-٨٧

[4] سەرچاوەی پێشوو-لا-١٠٣

١٨١.خوای پەروەردگار دەستی ئینسانی کردۆتەوە و ئازادی کردوە لە ژیانی سەر زەویدا، بەلام ئاگاداریشی کردۆتەوە کە ڕاست بڕوا و چەوت نەڕوا![١]

*******************************

١٨٢.سیاسەت لە ئیسلامدا واتە چۆنیەتی سەرپەرشتیکردنی ژیان و گوزەرانی خەڵك بەو شێوەیەی کە لای خوا پەسەندە و بەوشێوەیەی کە خوای پەروەردگار بەپێغەمبەراندا (علیهم الصلاه والسلام) ناردوویەتی و دیاری کردوە![٢]

*******************************

١٨٣.سیاسەت بەشێکە لە دین سەرپەریشتیکردن و مشورخواردن لە ژیانی خەڵك بەشێکە لە دینەکەیان و بەشێکە لە ئیسلام کەواتە کاتێك دەگوترێ: با سیاسەت لە ئیسلام یان ئیسلام لە سیاسەت دوور بخرێتەوە، یان دین لە دەوڵەت دابڕنرێ، واتە با ئیسلام لەت بکرێ و بەش بەشبکرێ![٣]

*******************************

١٨٤.کەسانێك کە ئیسلام بەش بەش دەکەن و دەڵێن: عیبادەتەکەی دەگرین، بەلام سیاسەتەکەی مان ناوێ، یان لایەنی پەروەردەیی یەکەی دەگرین، بەلام جەنگ و جیهادەکەیمان ناوێ، یان لایەنی کۆمەلایەتیەکەی دەگرین، بەلام لایەنی عیبادەتمان ناوێ، ئەوانەی وا دەڵێن خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ئەی محمد (ﷺ) ئەوانە پەیوەندیان بەتۆوە نەماوە، مسوڵمانانێك پەیوەندیان بە (محمد مصطفی )وە (ﷺ) هەیە و مسوڵمانانێك ئوممەتی ئەون، کە ئەو ئیسلامەی خوا ناردوویەتی بە هەموو لایەنەکانییەوە قبوڵیان بێ، وەك چۆن عیبادەتەکەیان قبوڵە، حوکم و سیاسەتەکەشیان قبووڵ بێ، وەك چۆن لایەنی ئەخلاقییەکەییان قبووڵە، لایەنی ئابوورییەکەشیان قبووڵ بێ و هەموو لایەنەکانی دیکەی ئیسلامیشیان قبووڵ بێ،[٤]

*******************************

---

[١] سەرچاوەی پێشوو-لا-١٠٥

[٢] سەرچاوەی پێشوو-لا-١٠٧

[٣] سەرچاوەی پێشوو-لا-١١٢

[٤] سەرچاوەی پێشوو-لا-١١٣

١٨٥.ئیسلام کە بەرنامەی ژیان بێت، دیارە بەرنامەی ژیان ناگونجێ باسی سیاسەت و حوکمڕانی تێدا نەبێت و ناگونجێ باسی قەوارەی سیاسی تێدا نەبێت، ئاخر ئەوە چ بەرنامەیەکە ئەوەی تێدا نەبێ کە چۆن سەرپەرشتی ژیان و گوزەران و کارو باری خەڵك و کۆمەڵگا و وڵات بکرێ؟! بێگومان ئەوە بەرنامەیەکی ناتەواوە و خوای کاربەجێش دەفەرموێ: ئەم ئیسلامەی ئێوە بەرنامەیەکی تێر و تەواوە ![1]

******************************

١٨٦.ئەگەر خوا پەروەردگاری ئێمە بێ دەبێ حاکم و بەرنامە ڕێژی ئێمەش بێ، چونکە بەشێك لە پەروەردگارێتی خوا و سەرپەرشتیکردنی بۆ ژیانی ئێمە و خاوەندرارێتی بۆ ئێمە ئەوەیە کەحەڵاڵ و حەراممان بۆ دیاری بکات و چاکەو خراپەمان بۆ دەستنیشان بکات لە هەموو بوارەکانی ژیاندا لە بواری سیاسی، ئیداری ،ئابووری، کۆمەڵایەتی، فیکری، ئەخلاقی، عیبادییدا ![2]

******************************

١٨٧.من زۆر بەجێگەی داخی دەزانم کە وابزانرێ ئیسلام لە خزمەتی زاڵم و ستەمکار و دیکتاتۆرەکان دایە و لەزەرە و زیانی خەڵکی چەوساوە و ڕەشوڕووتە !! لەکاتێکدا بەدرێژایی مێژووی پێغەمبەران (علیهم الصلاة ولسلام) مەشخەڵ هەڵگری ئازادی بوون بانگی ئازادیی و ڕزگارییان بەگوێی خەڵکدا داوە، وە پێغەمبەران هەمیشە شوێنکەوتووە کانیان بریتی بوون لە: چەوساوەکان (مستضعفین)، دوژمنانی پێغەمبەرانیش هەمیشە بریتی بوون لە: خۆبەزلگرەکان، خۆشگوزەرانەکان، زیادەڕۆییکەرەکان (المستکبرین، المترفین، المسرفین) ئا ئەوانە دوژمنەکانیان بوون و شوێنکەو توانیشیان ڕەشوڕووت و چەوساوەو ماف خورا و بەش خوراوەکان بوون ![3]

******************************

١٨٨.حوکمڕان و براگەورە لەسیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامیی دا وەکیلی مسوڵمانانە، بۆ ئەوەی دینەکەیان بەسەر دا پیادە بکات، هەر بۆیەش حوکمڕانی مسوڵمانان جا ناوی خەلیفەیە، ئەمیرە، سەرۆکە، سوڵتانە، هەرناوێکی هەیە دەبێ لە پێش مسوڵماناندا و لەهەموویان دا و لەخەڵك پتر

---

[1] سەرچاوەی پێشوو-ل-١١٥

[2] سەرچاوەی پێشوو-ل-١١٦

[3] سەرچاوەی پێشوو-ل-١٢٠

پابەندی شەرع بێ و لەپێش هەموویاندا دەبێ سزاکانی بەسەردا بچەسپێنرێن ئەگەر هات و تووشی لادان و بێ شەرعییەك بێت!(١)

*******************************

١٨٩.لەرۆژئاوا حیساب بۆ خەڵك و جەماوەر دەکرێ، لە راستیدا ئەوە شتێکی ئیسلامییە، وەدوایی کە دەسەڵاتدار دەچێتە سەر کورسی حوکم بە ئیرادە و هەڵبژاردنی خەڵك شتێکی شەرعیی و ئیسلامییە، لێرەش کە خۆی دەسەپێنێ شتێکی کافرانەیە و دیکتاتۆرانەیە و هیچ پەیوەندییەکی بە ئیسلامەوە نیە ،بەڵێ لە نێو مسوڵمانان دایە و رەنگە کابرا خۆیشی بە مسوڵمان بزانێ، بەڵام بەراستی چوونە سەر کورسی حوکمەکەی و شێوەی حوکمڕانییەکەی و مانەوەی لەسەر حوکم هیچ پەیوەندیی بە ئیسلامە وە نیە!(٢)

*******************************

١٩٠.من لێرەدا رایدەگەێنم و تەحەددا دەکەم ئەوانەی کوێرانە رەخنە لە ئیسلام دەگرن و لە پشت پەردەی رەشەوە سەیری دەکەن من دەڵێم با ئەوانە بێن بزانم رەخنە و گلەیی زانستییانە و مەنتیقییانەی لە کوێی ئیسلام هەیە !

دەبا بێن ئەدی ئەوانە ناڵێن با بەزمانی گفتوگۆ و دیالۆگ یەکدی بدوێنین! دەفەرموون بابێنە مەیدانی رەخنەی بابەتییانە و شێوازی زانستییانە،بەڵام ئایا دەزانن کە شێوازی زانستییانە ئەوەیە تۆ باسی شتێك نەکەی و قسەی دەربارەی نەکەی کە ئاگاداریی و ئاشنایەتیت لەگەڵیدا نەبێت؟! وە ئایا دەزانن کە رەخنەی بابەتیی و مەنتیقییانە ئەوەیە کە تۆ زاتی بەرانبەر و فیکرەکەی تێکەڵ نەکەی و لەبەر ئەوەی کە رقت لە لایەنێکی ئیسلامیی هەڵدەستێ و بۆ خۆت عەلمانی، نەچی هەموو حەقەکانی بکەی بە ناحەق، وە ناحەقییەکانی خۆیشت هەمووی بکەی بەحەق، هەر لەبەر ئەوەی تۆ دژایەتی ئیدۆلۆژیت لە گەڵیدا هەیە؟! شێوازی بابەتییانە ئەوەیە کە تۆ وەك بابەت (موضوع)ەکەی تەماشای فیکرەکەی بکەی ئیسلام وەك خۆی ببینە و کابرای ئیسلامیی لێ بەرەدەرێ، مادام رقت لە من هەڵدەستێ بە شەخسی زاتی من مەهێنە نێو حیسابەکە و، بەڵکو بابەتی ئیسلام تەماشا بکە بزانە رەخنەت لەکوێی هەیە !! ئێستا ئەوانەی بەبێ ئاگایی و کوێرانە

---

(١) سەرچاوەی پێشوو-لا-١٣٠

(٢) سەرچاوەی پێشوو-لا-١٤٠

بەنێو دەکەون و دەڵێن: ئیسلام بەکەڵك نایەت و لەپەنای ئیسلامدا زوڵم لە کورد کراوە و مافەکانی زەوت کراون، ئێمە دەپرسین: ئایا کێ زوڵمی کردوە و لە کوێ زوڵم کراوە؟![1]

******************************

١٩١.ئیسلام پێش ئەوەی ببێتە سیستەم و بەرنامەی ژیان، دەبێتە هیدایەت بۆ ئینسان و دەبێتە ئیمان و عەقیدە و ئەخلاق و ڕەوشت و ڕەفتار و لە شەخصدا ڕەنگ دەداتەوە، دوایی ئەو شەخصانە بە هەموویان ژیانی خۆیان دەگۆڕن و بەو شێوەیە ڕێکی دەخەن کە دینی حەقی خوا دەیخوازێ، ئەوکاتە دینی حەقی خوا دێتەدی![2]

******************************

١٩٢. هیدایەت لە تاکدا بەرجەستە دەبێ و دینی حەقیش لە کۆمەڵگادا بەرجەستە دەبێ![3]

******************************

١٩٣.ئەو دینەی (محمد المصطفى ) (عليه الصلاة والسلام) هەم هیدایەت و هەم دینی حەقە، هەم بەتاك جێ بەجێ دەکرێت و هەم بەکۆمەڵ و میللەت![4]

******************************

١٩٤.قورئان و سوننەت هێندە ڕوون و بەقەدەر نووکی دەرزی ناهەقی "باطل"یان ڕەگەڵ ناکەوێ![5]

******************************

١٩٥.هەر بەرنامەیەك هەرچەندە تێر و تەواو بێ مادام پیادە نەکرێ و جێبەجێ نەکرێ هیچی لێ هەڵناوەرێ![6]

---

[1] سەرچاوەی پێشوو-لا-١٤٠-١٤١

[2] زنجیرەی بابەتە هەنوکەییەکان ئەڵقەی شەشەم چەند بنەمایەکی گرنگی وتار بێژیی-چاپی یەکەم-ساڵی ٢٠٠٦ ز-لا-٥٦

[3] سەرچاوەی پێشوو-لا-٥٦

[4] سەرچاوەی پێشوو-لا-٥٦

[5] زنجیرەی بابەتە هەنوکەییەکان ئەڵقەی حەوتەم قوتابیانی زانیاری شەرعیی و چەند سەرنج و ڕێنمایی یەك -چاپی یەکەم-ساڵی ٢٠٠٧ ز-لا-١٧

[6] بزوتنەوەی ئیسلامیی و ئاسۆیەکی گەش و ڕوون بنەما شەرعی یەکان و بنچینە ئەخلاقییەکان-چاپی یەکەم- ساڵی ١٩٩٧ز-لا-١٦

١٩٦.جیاوازی نێوان (وەحی )ی خواو (فیکر)ی ئینسان، کە یەکەمیان هەقی موتڵەق و بێ هەڵەو پەڵەی پێ یە، بەلاّم دووەمیان هەم ڕاست و هەم هەڵەشی لێ دەوەشێتەوە، هەر بۆیەش ئینسان هەتا زیاتر دەست گرتووبێ بەوەحی یەوە لە هەڵەو خلیسکان پارێزراوتر دەبێ ![1]

*******************************

١٩٧.فیطرەت و سروشتی ئینسان تەنیا تەحەمولی شەرع و بڕیارە ڕاست و دروست و پڕ بە پێستەکانی دەکات و لەشەرع لادان هەرچۆن بێ و بەهەر بارێکدا بێ هەردژ و پێچەوانەی فیطرەتە ![2]

*******************************

١٩٨.حیکمەتی ئەوەش کە تۆبە کردن و گەڕانەوەی کاتی گیانەلاّو دەمی خۆر لە ڕۆژئاواوە هەڵهاتن وەرناگیرێ، ئەوەیە کە ژیانی دنیا تاقیگای ئینسانە و دەرفەتی ئیمان هێنان و نەهێنان و چاکەکاریی و خراپەکاریی هەیە، بەلاّم لەکاتی ڕووح دەرچوون و لەدەمی خۆر گەڕانەوەدا ئەو هەل و دەرفەتی تاقی کرانەوە (إمتحان)یە بەسەر دەچێ، لە حاڵەتی گیانەلاّدا هی ئەو ئینسانە کە خەریکی گیان سپاردنە و لە حاڵەتی خۆر گەڕانەوەشدا هی سەرجەم مرۆڤایەتی ![3]

*******************************

١٩٩.وەك چۆن پڵێتەی چرا بەهۆی نەوت و سووتەمەنی یەك کەتێی کراوە دەگرێ و شوعلەی هەیە، ئیمانیش بەهۆی بەندایەتی بۆ خواو فەرمانبەریی بۆ کردنی و پابەندیی بەئایین و شەریعەتەکەیەوە گەشەو زیاد دەکات و بەپێچەوانەشەوە وەك چرای بێ نەوت دەکەوێتە پڵتە پڵت و خەفەو بێ شۆق دەبێ![4]

*******************************

٢٠٠.داخرانی دەرگای "إجتهاد" بەهەر بەهانەو عوزرێکەوە بێت، وشەیەکی بە ئەدەبە بۆ ڕاگەیاندنی وەفات کردنی ئیسلام و ئینسان و ژیان بەجێ هێشتنی ![5]

---

[1] سەرچاوەی پێشوو-لا-٥١

[2] گەڕانەوە لای خوا سبحانە وتعالی -چاپی سێیەم -ساڵی ٢٠٠٥ ز-لا-٤٤

[3] سەرچاوەی پێشوو-لا-٤٧

[4] سەرچاوەی پێشوو-لا-٥٢

[5] چەند ڕێږوونی یەك بۆ ئیسلامی یەکانی کوردستان -چاپی یەکەم -ساڵی ١٩٩٧ ز-لا-٣٤

٢٠١.ئیسلام هەم هیدایەتە بۆ ئینسان و هەم بەرنامەشە بۆ ژیان و گوزەران![1]

******************************

٢٠٢.پانتایی بڕیارە ئیسلامییەکان پانتایی (شەریعەت)ی ئیسلامی بە ڕاستی، پتر بەکۆمەڵ جێ بەجێ دەکرێ، بەدەوڵەت هەڵدەسوڕێ بەگەڵ بە ئەنجام دەگەیەنرێ، بە هەرەوەزەیی سەردەگرێ![2]

******************************

٢٠٣.ڕامیاری بەشێکە لە ئیسلام، هەم لایەنی ئابووریی، لایەنی کۆمەڵایەتی، لایەنی بیر بەشێ لە ئیسلام پێکدێنن بەشێکە لەوەی ئیسلام بایەخی پێداوە و نەخشەی بۆ داناوە. ئەوە کێشەیە کە ئێمە،چەن ئیسلامێکمان نییە، یەکێکیان ڕامیاری ئەوی دیکەیان ناڕامیاری بێ! ئێمە تەنیا یەك ئیسلاممان هەیە. بەشێ لەو ئیسلامە (ڕامیاریی) یە![3]

******************************

٢٠٤.ئازایەتی لە پێناسەی ئیسلام دا ئەوەیە: چ بەقسە و چ بە کردەوە، مرۆ سنوورەکانی (شەرع) نەبەزێنێ، نە لەبەر گوشاری دەرەکیی و خەڵك، شتێکی ڕەوا بەژێر لێوەوە بکا، کە پێویستە بگوتوێ نە لەبەر ئەوەی، ڕقیشی لە خەڵك هەستاوە، شتێ بڵێ کە لە شەرع بەدەربێ و لە(شەرع)دا نەبێ![4]

******************************

٢٠٥.ئەگەر هەرفکرەیەك بگونجێ بە زۆر بسەپێنرێت بەسەر خەڵکیدا ئەوا ئیسلام ناگونجێت بەزۆر بسەپێنرێت، چونکە ئیسلام بەر لەوەی کاری لەگەڵ ڕواڵەتی ئینسان و لەگەڵ جەستەو دەرەوەی ئینساندا بێت، سەروکاری لەگەڵ دڵ و دەروون و عەقڵ و بیر و هۆشی ئینسانە، چونکە لە ئیسلامدا هیچ کردەوەیەك بەبێ نیەت بەرناکەوێت![5]

---

[1] سەرچاوەی پێشوو-ل-٧٥

[2] سنورە قەدەغەکان مەشکێنن -دەقی گفتوگۆیەکە لەگەڵ مامۆستا عەلی باپیر ڕۆشنبیر حوسێن محمد عەزیز ئامادەی کردووە بەماوەك لە دەستگیرکردنی لەلایەن ئەمریکیەکانەوە-چاپی دووەم -ساڵی ٢٠٠٤ ز-ل-٨٨

[3] سەرچاوەی پێشوو-ل-٨٩

[4] سەرچاوەی پێشوو-ل-٩٣

[5] کۆمەڵی ئیسلامیی- ئامانج و هەڵوێستەکانی و چەند پرسیارو وەڵامێکی گرنگ لەبارەی ئیسلام ئیسلامییەکانەوە -چاپی یەکەم -ساڵی ٢٠٠٢ز-ل-١٧-١٨

٢٠٦.ئیسلام دینی خوایە بۆ هەموو بەندەکانی خوا لەسەر زەوی خوا و نە بەستراوەتەوە بەشوێن و کات و میللەتێکی تایبەتی یەوە ![1]

*******************************

٢٠٧.ئیسلام بۆ هەرکام لەجەنگ و بەرەنگاری و، کاتی ئاشتی و ئاسایی دەستوور و شێوازێکی سەربەخۆ و تایبەتی داناوەو ئێمەش ئەگەر پابەندی ئیسلام و مل کەچی شەرعی خوابین، نەك گوتی لەمستی ئارەزوو و گەردن کەچی طە بعی خۆمان ئەوە بێگومان لەهەر حاڵە تێك دا بەشێوەیەکی حەکیمانە و پڕ بە پێست ڕەفتار دەکەین و هەرشتە لەشوێنی شیاوی خۆی دا دادە نێین دووچاری هەڵەشەیی و ڕەفتاری سەر کیلانە نابین![2]

*******************************

٢٠٨.چەك و هێزو دەسەڵات لە ئیسلام دا بەس وەسیلەیەو قەڵغان و سوپەری سەر سەری کارو بانگەوازی ئیسلامی و، پاشان کیان و قەوارەی ئیسلامی یەو خۆی لەخۆیدا ئامانج نی یە ![3]

*******************************

٢٠٩.هەمیشە پێویستە تەبع لەگەڵ شەرع بگونجێ و بۆی ملکەچ بکرێ، نەك شەرع بەپێی میزاج و تەبع ملی پێ بابدرێ![4]

*******************************

٢١٠.لەڕوانگەی ئیسلامەوە هەر کردەوەو جم وجوڵ و چالاکی و ڕەنج و تێکۆشانێك ببێتە هۆی لەخۆبایی بوون و خۆڵ گۆڕانی ئینسان، لەوە هەرگەڕێ کە بەچاك (صالح) دانانرێ، بگرە خاوەنەکەی زۆری شی لەسەر قەرزدار دەبێتەوە و لەجیاتی چاکە و(نِعْمَة) بۆی دەبێتە بەڵاو (نِقْمَة)![5]

*******************************

٢١١.دینی خوای پەروەردگار وەکو چۆن حەماسەت و دلگەرمی و دڵسۆزی پێویستە، هێندەش عەقل و لێزانین و حیکمەتی پێویستە ![6]

*******************************

---

[1] جیهاد لەڕێ ی خوادا و چەند سەرنج و ئاگاداری یەك –چاپی دووەم –ساڵی ١٩٩٨ ز–ل–٣٠

[2] سەرچاوەی پێشوو–ل–٥٥–٥٦

[3] سەرچاوەی پێشوو–ل–٥٩

[4] ئافرەت و خێزان لەسایەی شەریعەدا –چاپی یەکەم –ساڵی ٢٠٠٣ ز–ل –١٣١

[5] زنجیرەی باچاکتر ئیسلام بناسین –ئەڵقەی یەکەم– خودا جَلَّ جَلالُهُ –چاپی دووەم ساڵی ١٩٩٠ ز–ل–٧

[6] ئەشکەنجەو زیندان –دەقی گفتو گۆیەکە کاك هاوڕێن عومەر لەگەڵ مامۆستا عەلی باپیر سازی کردووە لەدوای ئازاد بوونی لە زیندان –چاپی یەکەم ساڵی ٢٠٠٦ ز–ل–٤٠٠

٢١٢.ئیسلام بەرلەوەی لەسەر خراپەو تاوان سزای خەڵکی بدات خێرو چاکەیان فێر دەکات بەر لەوەی لەسەر دزی دەستیان ببڕێ ئاگرو بڵێسەی ئەو برسێتی یە خاموّش دەکات کە لە هەناوی برسی و وشکیاندا دەگرێ و، بەر لەوەی لێیان تووڕە بێ ئاموّژگاریان دەکات و بەرلەوەی گلەییان لێ بکات گلەیی یەکانیان و لادەبات و گیروگرفتە کانیان حەل دەکات و، پێش ئەوەی داوا لەخەڵکی بکات بکات پابەندی یاساو دەستورە کانی بن پێداویستی ومافە سیاسی و ئابووری و کوّمەڵایەتی یەکانیان بوّ دابین دەکات، دیارە قورئانیش هەروای گوتوەو پێغەمبەری خواش هەروای کردووە ![1]

*******************************

٢١٣.حوکمی ئیسلامی پێش ئەوەی جێ بەجێ کردنی سزاکان بێ یەسەر خەڵکی دا دابین کردنی پێداویستیەکانیانە ![2]

*******************************

٢١٤. ئیسلام سیاسەتێکی خوایی یە بوّ چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی تاك و کوّمەڵ![3]

*******************************

٢١٥.ئیسلام بەرنامەی خوای کاربەجێیەو نەرمی و توندی و بەرەنگاری و ئاشتی هەریەکەو لەشوێنی خوّیدا لە سەر مسوڵمانانی فەرزکردووە و بەدەردی پێشینانیش دەڵێن (کەنگرو ماست بەوەختی خوّی )![4]



[1] گوّڤاری پەیڕەو -ژمارە(٣) ساڵی ١٩٩٥ز-لا-٥

[2] سەرچاوەی پێشوو-لا-٥

[3] گوّڤاری سنوور ژمارە(١٠)ی ساڵی١٩٩٦ز-لا-٢٢

تێبینی: گوّڤاری سنوور گوّڤارێکی مانگانەی گشتی بووە (شورای خوشکانی ئیسلامی کوردستان ) دەری کردووە خاوەنی ئیمتیاز دایکی بەنان: سەرنوسەر: ژیان عبدالقادر، بووە.

[4] گوّڤاری ئەزموون ژمارە(٣)ی ساڵی ١٩٩٤ز-لا-١٨

تێبینی :گوّڤاری ئەزموون گوّڤارێکی مانگانەی سیاسی بووە دەزگای ڕوّژنامەنوسی و چاپەمەنیەکانی بزوتنەوەی ئیسلامی لەکوردستان دەری کردووە ،خاوەنی ئیمتیازەکەی دکتوّر ئازاد گەرمیانی، سەرنوسەرەکەی ئامانج ژاژلەیی بووە .

٢١٦.له‌ژیانی هه‌موو پێغه‌مبه‌ران ته‌نها جارێك نابینی پێغه‌مبه‌رێك هه‌ڕه‌شه‌ی كردبێت له‌ فیرعه‌ونێك هه‌میشه‌ سه‌رانی كوفر هه‌ڕه‌شه‌یان كردووه‌ له‌ پێغه‌مبه‌ران، فیرعه‌ونه‌ هه‌ڕه‌شه‌ له‌ موسا ده‌كات. نه‌مروده‌ هه‌ڕه‌شه‌ له‌ ئیبراهیم ده‌كات، سه‌رانی كوفر هه‌ڕه‌شه‌ له‌ هه‌موو پێغه‌مبه‌ران ده‌كه‌ن و پێیان ده‌ڵێن: له‌ وڵات ده‌رتان ده‌كه‌ین، یان ده‌بێت بگه‌ڕێینه‌وه‌ سه‌ر ئایینی ئێمه‌ ![1]

*******************************

٢١٧. زۆر به‌زه‌ییم به‌ ئسلام دا دێته‌وه‌ كاتێك كه‌وا وێنا ده‌كرێت كه‌ په‌نا ده‌باته‌ به‌ر توندوتیژی و خه‌ڵكی دیكه‌ش په‌نا ده‌باته‌ به‌ر ناتوندوتیژی ![2]

*******************************

٢١٨.ده‌وڵه‌تی ئیسلامی ده‌وڵه‌تێكی ئینسانییه‌و پایه‌كه‌ بۆ به‌شه‌ر ![3]

*******************************

٢١٩.ئیسلام بۆ خۆی دینێكی خواییه‌ بۆ هه‌موو به‌شه‌ر، دینێكی ڕه‌ببانیه‌ وه‌كو سه‌رچاوه‌ و ئینسانیه‌ وه‌كو ته‌وه‌جوهه‌كه‌ی، ڕووی له‌ هه‌موو ئینسانه‌كانه‌ ![4]

*******************************

٢٢٠.سیسته‌می حوكمڕانی ئیسلام كاكڵ و جه‌وهه‌ری لایه‌نه‌ ئیجابییه‌كانی سیسته‌می دیموكراسی تێدایه‌ ![5]

*******************************

٢٢١.له‌ ئیسلام دا ته‌نیا شه‌ریعه‌ت سالاریی هه‌یه‌ و شه‌ریعه‌تی خوا سه‌روه‌ر و سالاری هه‌موو كه‌سه‌ ![6]



[1] گۆڤاری لڤین ژماره‌( ٤٦) ساڵی ٢٠٠٦ز –ل-٣

[2] سه‌رچاوه‌ی پێشوو–ل-٣-٤

[3] سه‌رچاوه‌ی پێشوو–ل-٥

[4] سه‌رچاوه‌ی پێشوو–ل-٢٣

[5] ڕۆژنامه‌ی كۆمه‌ڵ –ژماره‌٢٥٧–ل-٧–بابه‌تی– تایبه‌تمه‌ندیی گرنگی ئیسلام له‌ بواری حوكم و سیاسه‌تدا.

[6] زنجیره‌ی بابه‌ته‌ هه‌نووكه‌ییه‌كان ئه‌ڵقه‌ی سێ یه‌م به‌دورخستنه‌وه‌ی ئافره‌ت له‌ ئیسلام چ زیانێك ده‌كه‌ین؟– چاپی یه‌كه‌م –ساڵی ٢٠٠٧ ز –ل-٤١

٢٢٢.شه‌ریعه‌تی خوا (نێـر ) داینـه نـاوه تـاكو بـه‌زه‌ره‌ری مـێ تـه‌واو بـێ و(مـێ) داینـه نـاوه تـاكو به‌زه‌ره‌ری نێر ته‌واوبێ ،خوا یه‌ك (جل شأنه) دایناوه كه نێرایه‌تی و مێینیه‌تی پاڵ نادرێته لا ![1]◆

******************************

٢٢٣.خوای بێ وێنه و هاوه‌ڵ له‌سه‌رووی ئه‌وه وه‌یه كـه نێرایـه‌تیی و مێیایـه‌تیی پاڵبدرێتـه‌لا، بۆیـه شه‌ریعه‌ت و به‌رنامه‌كه‌ی نه به‌لای پیاودا شكاوه‌ته‌وه نه به‌لای ئـافره‌ت دا، بـه‌ڵكو بـۆ هـه‌ردووكیان وه‌ك یه‌كه ![2]

******************************

٢٢٣.دین و ده‌وڵه‌ت له یه‌ك جیان یان ئیسلاممان قبووڵه به‌ڵام ئیسلامی سیاسی نـا یـان (لاسیاسـه فى الدین ولا فى السیاسه) ! ! بـه‌ڵێ ئـه‌و جـۆره قـسانه هـه‌ڵقولاوی یـه‌ك سه‌رچـاوه و ره‌شـاوی یـه‌ك هه‌ناون، ئه‌ویش بابایه‌كه یان ساده‌و سـه‌ركێڵ و بـێ ئاگایـه‌و بـه‌فیكری رۆژئـاوا گـۆش كـراوه و بـه شیری گونی بیردۆزیك و فرچك دراوه، یاخود داخ و قین له دڵه‌و بوغز و غه‌ره‌زی له به‌رنامه‌ی خوا و به‌نده‌كانی خوا هه‌یه و ده‌یه‌وێ بـه‌و جـۆره قـسه بـێ سـه‌رو پـێ یانـه خـه‌ڵكی بـه سـه‌هوو ببـات و چه‌واشه‌یان بكات ،ئه‌گه‌رنا ئیسلام به‌و ماڵماڵۆكێنه‌و گوریس پچركێنه‌یه رازی نی یه‌و، له ئیسلام دا دین و ده‌وڵه‌ت پێكه‌وه ته‌بان و عیباده‌ت و سیاسه‌تیش بران، مزگه‌وت هیچ گـیرو گرفتێكـی له‌گـه‌ڵ بازاڕدا نییه سه‌وداو مامه‌ڵـه‌و بازرگـانی شـه‌رعی حـه‌ڵاڵیش رۆژێـك لـه رۆژان له‌گـه‌ڵ نوێـژ و رۆژوو و زیكرو فیكردا ناكۆكی یه‌كیان نه‌بووه ![3]

******************************

٢٢٤.ئیـسلام و كـورد وه‌كـو دوو ده‌سـت وابـوون بـۆ یـه‌كتری كـه یـه‌كتر ده‌شـۆن، وه‌كـو دوو بـرا خزمه‌تیان به یه‌كتری كردووه، كه‌واته موعاده‌له‌كـه بـه‌و شـێوه‌یه نیـه یـا كـورد بـین یـا مـسوڵمان، نه‌خێر كوردی مـسوڵمانین و مـسوڵمانی كـوردین، بـه‌كورد خزمـه‌تی ئیـسلام ده‌كـه‌ین و بـه ئیـسلام خزمه‌تی كورد ده‌كه‌ین ، دین بۆ به‌خته‌وه‌ركردنی ئینسان هاتوه، ئینسانیش بۆ به‌ندایه‌تی كردن بـۆ خوا خوڵقاوه و به‌وه‌ش به‌خته‌وه‌ر ده‌بێ كه ژینی به پێی دین به‌ڕێوه بچێ![4]

---

[1] سه‌رچاوه پێشوو –لا–٤٢

◆ (وَمِن كُلِّ شَيْءٍ خَلَقنا زَوجَينِ لَعَلَكُم تَذكَّرُون)الذریات–٤٩

[2] سه‌رچاوه پێشوو –لا–٤٢

[3] مزگه‌وته‌كانی كوردستان له‌نێوان ئاوه‌دانكردنه‌وه‌و وێرانكردندا–چاپی یه‌كه‌م –ساڵی١٩٩٩ ز–لا –٤٦–٤٧

[4] پێشمه‌رگه‌ی ئیسلام یان مسوڵمانی موجاهید كێ یه‌و چۆنه ؟!–چاپی سێیه‌م –ساڵی ١٩٩٨ ز–لا –٢٤

٢٢٥.هەرکەسێك نەختێك سەرە دەری لە قورئان و سوننەت دا بکات و بڕێك بە یاسا هەمەلایەنە و جۆراوجۆرەکانی ئیسلام ئاشنا بێت، دەزانیٚ کە ئیسلام بەرنامە و پەیڕەوێکی وایە، عیبادەت و سیاسەت و دونیا و قیامەت و مزگەوت و بازاڕو تەقواو تەقەو عەقڵ و دڵ... هتد پێکەوە گرێریٚ دەدات و بۆ هەموو پرسیارێك چاکترین وەڵام و بۆ هەموو دەرگایەك باشترین کلیلەی هەیە و، لەبەردەم چارەسەری هیچ گیروگرفتێك و کردنەوەی هیچ گریٚ یەك دا نامێنیٚ و، هەموو دەمیٚ لەهەر باردۆخ و سەردەمێك دا دەتوانیٚ ساغ و سەلیم ترین کۆمەڵگا و تێرو تەواو ترین دەوڵەت و بەهێزترین سوپا بخەملێنیٚ و، سەر بەگەورەترین طاغووت و دیکتاتۆری ڕۆژگار دانەوێنیٚ![1]

*******************************

٢٢٦.ئامانجی ئیسلام بریتییە لە زیندووکردنەوەی خەڵك نەك مراندنیان![2]



---

[1] کوردستان بۆ وێرا بوو چۆن ئاوەدان دەبێتەوە؟! –چاپی یەکەم –ساڵی ١٩٨٩ ز–لا–٥٢

[2] ئەشکەنجەو زیندان –چاپی یەکەم –٢٠٠٦ –لا–٨٢

٢٢٧.موسڵمان کوێرانە وەڕێ ناکەوێ تفەنگی بەتاریکایەوە نانێ بەڵکو هەوڵ دەدات بەر لەهەموو شتێك بە بنج بنەوانی بیروباوەڕەکەی دا بچێتە خوارو لێی حاڵی بێت و بزانێ ئیسلامەتی چیەو چۆنەو چۆن خەڵکی بۆ بانگ دەکات![1]

*******************************

٢٢٨.ئیسلام وەك درەختێکە لەدوو بەشان پێك دێ: یەکەمیان ڕەگ و ڕیشە دووەمیان قەد و لق و پۆپ و گەڵا، جا هەروەك چۆن درەخت چ قەد و لق و پۆپ و گەڵای دیارنین هەتا ڕەگ و ڕیشەکانی بەعەرزێ دا نەچنە خوار و تام و خوێ و چێژێك لەزەوی دەستگیر نەکەن کەدواتر بەشی دووەمی درەختەکە پێك دێنن. هەر بەهەمان دەستوور ناگونجێ چاوەڕوانی ڕەفتار و کرداری ئیسلامیانە بی لە بابایەك کەڕەگ و ڕیشەی بروا و عەقیدە لە دڵ و دەروونی دا خۆیان دانەکوتاوە ![2]

*******************************

٢٢٩.موسڵمانی تێکۆشەر و شۆرش گێڕ دەبێ پێغەمبەرانە بەدەستێکی سەرگەرمی دروست کردنی قەڵای ئیسلام بێ و بەدەستێکی تریش کۆنە قەڵای رزیوی ڕێچکە دەستکردەکان بداتە بەرپاچی ژیری و زانیاری و لەبەرێکی هەڵقەنێ و داری بەسەر بەردیەوە نەیەڵێ![3]◆

*******************************

٢٣٠.پێویستە مەردوم ئیسلامەتی لەرەفتار و ئاکار و هەڵس و کەوت و ڕەوشتی کادیری ئیسلامی دا ببینن بەر لەوەی لەزاری ببیستن![4]

*******************************

٢٣١.کابرای موسڵمان بۆیە ناونراوە موسڵمان چونکە گەردن کەچی فەرمانەکانی خوایە، بەڵام وەختێك لە فەرمانەکانی خوا لاملی کرد و یاخی بوو هیچ ماقووڵ نیە ئەو ناوەی هەر پێوە بێ، چونکە کاتی خۆی ئەو ناوەی بۆیە لێ نراوە چونکە ئەستۆی بۆ ئەمرو فەرمانەکانی خوا و پێغەمبەر

---

[1] پوختەیەك دەربارەی ئیسلام لە بەرڕۆشنایی سورەتی فاتیحەدا-چاپی دووەم ساڵی ٢٠٠٦ ز- لا-١١٠

[2] سەرچاوەی پێشوو لا-١١٣

[3] سەرچاوەی پێشوو لا-١١٤

◆ کورد گوتەنی: کارێکی پێ بکات با بەدەواری شری نەکردبێ

[4] سەرچاوەی پێشوو لا-١١٨

(ﷺ) کەچ کردووە، ئەمما ئێستا کە گەردن گەچ نەماوە و لارێ بووە و لای داوە ناوو شۆرەتی موسڵمانەتیشی پێوە نەماوە و لەوئیسلامەتی یە هەڵاوێرراوە ![1]

*****************************

٢٣٢.پێغەمبەری خواناس و بت شکێن و طاغووت خەسێن و کافر ڕەتێن و دوژمن تۆقێن و شەیتان بەزێن و گەل ڕزگارکەر و ئازادی هێن ﷺ بەرهەڵستی کردن و ڕاپەڕین دژی طاغووت و زۆر دارانێك کە دەسەڵات و زەبرو زەنگی خۆیان بەسەر خەڵکی دا دەسەپێنن و لەجیاتی بەرنامەی خوا هەوا و بیرو بۆچوونی خۆیان یان مرۆڤێکی وەك خۆیان دەکەنە دەستوری ژیانی بەندەکانی خوا بە بنەڕەتی ترین و سەرەکی ترین مەرجی موسوڵمانەتی بەشوێن کەوتووی پێغەمبەر ﷺ لەقەڵەم دران دادەنێ![2]

*****************************

٢٣٣. ئەگەر هێندە نوێژان بکەی تا نێو چەوانت توێخێکی بە بەرماڵێ وە دەچێ و

هێندە وەپاڕێی هەتا بن هەنگڵت دەتـــەزێ و

هێندە حەجان بکەی هەتابنی پێیانت دەسوێ و

هێندە یادی خوابکەی هەتاکرکڕەت شین دەبێ و

زمانت شل دەبێ و دەنگت دەنووسێ و ئاگات لە دنیایە دەبڕێ، مادام دژی ئەو طاغوت و زۆر دارە کافرانەی کەبەپێی بەرنامەی خوا حوکم ناگێڕن هیچ هەڵوێستێك پێشان نەدەی و، لەگوڕین و ئاڵ و گۆڕکردنی ئەو واقیع و بارو دۆخەدا کەڕژێمی طاغووتی هێناویەتە کایەوەو، خوا و پێغەمبەر ﷺ پێی ڕازی نین هەوڵێك نەدەی و مشوورێك نەخۆی، پێغەمبەری پێشەوامان ﷺ بەسەرباز و شوێن کەوتووی خۆی حسێبت ناکاو، گوێت پێ نادات![3]

*****************************

٢٣٤.خواناسە ڕاستەقینەکان مەردی میحرابی پەرستن و مەیدانی جەنگ بوون و، لە بواری عیبادەت و بازاڕی سیسەت دا کارامەو لێهاتوو بوون و، پشکیان هەم لەتەقوا دا هەبووە هەم لە

[1] سەرچاوەی پێشوو لا-٢٢٧

[2] یادی خوا گرنگی یادی خوا لە ژیانی ئینساندا -بەرگی یەکەم -چاپی یەکەم -ساڵی ١٩٨٧ ز لا-١٤-١٥

[3] سەرچاوەی پێشوو لا-١٥

غەزادا و، بەخەم خواو خەڵکەوە بوون و، دڵ ڕوون و بیرتیژ بوون و، دونیاو دوارۆژیان کردووتە چەپکێك پێکەوەیان بەستوون و، شتاقیان بۆ شتاقیان فەرامۆش نەکردوون![1]

******************************

٢٣٥.هەرچەندە ژیانت پڕبێ لەچالاکی و خەبات و تێکۆشان، بەڵام مادام کردار و ئاکارو وتارو نیاز و مەبەستەکانت، بەس قاوغێکی بۆشی بەڕواڵەت جوان بەدەوی بێ نێوبن و، ئیمان و بڕوایان تێدا نەبێ و بەپێ ی ئیمان ڕێنموونی نەکرابن و، هەڵقوڵاوی سەرچاوەی بڕوا و پەیوەندی بوون لەگەڵ خوانەبن، مانای وایە وەك خۆراکە بێ ڤیتامینەکان شتێکی بۆش و بێ کاکڵن و، مردووی بەدیمەن ویندوون![2]

******************************

٢٣٦.هیچ کەس بۆی نیە قسە و کردەوە و ئاکاری مرۆڤی بەناو مسوڵمانی بێ بەندو باری نا لەباری بەسەر ئیسلامەوە بار، بکاتە بیان و بەهانەی گلەیی و ڕاکردنی لە ئیسلام![3]

******************************

٢٣٧.مسوڵمان بوونی تاك تاکی خەڵکی شتێکە و ئیسلامی بوونی شۆڕش و خەبات و کیان و قەوارە و سیستەمی ژیان و گوزەرانیشیان شتێکی دیکەیە هەرچەندە مسوڵمانەتی ڕەسەن و ڕاستەقینە هەمیشە ئیسلامی بوونی هەڵسوکەوت و هەڵوێست و کارو چالاکیەکان پەلکێش دەکات و ناتەواویەك لەئیسلامی بووندا دەگەڕێتەوە بۆ کەم کوڕی لەمسوڵمانەتیدا، کە دیارە مەبەستمان لە مسوڵمانەتی حاڵەتی دینداری شەخسی یە و مەبەستیشمان لە ئیسلامی بوون حاڵەتی دینداری کۆمەڵایەتیە![4]

---

[1] سەرچاوەی پێشوو ل-٢٨-٢٩

[2] سەرچاوەی پێشوو ل-٥٠

[3] سۆزی نەتەوایەتی و بیری ناسیۆنالیزم لە تەرازووی ئیسلام دا-چاپیەکەمی نوسینگەی تەفسیر-ساڵی ٢٠٠٥ ز ل-١٥٢

تێبینی: ئەم کتێبە سێ جاری تر چاپ کراوە لەم چاپەیدا کە نوسینگەی تەفسیر کردوویەتی سەرجەم ئەو بابەتانەی پەیوەست بوون بەم باتەوەوە خراونەتە نێو ئەم کتێبە واتە ئەم کتێبە چوارجار چاپ کراوە .ئامادەکار

[4] خواناسی ئایین ئیمان ڕاستیەکانی ئیسلام دەدرەوشێتەوە و ئەفسانەکانی ڕێچکان دە پووچێنەوە-چاپی یەکەم - ساڵی ٢٠٠٠ ز-نوسینگەی تەفسیر-ل-٧

٢٣٨.بەرنامەی خوا هەروەك چۆن لە چاخی زێڕین (العصر الذهبی) یدا، بە ماوەیەکی زۆر کورت توانی تەمی نەفامی بڕەوێنیّ و، شەیتانی بەدفەڕ بڕەتێنیّ و ، سوپای کوفر ببەزێنیّ، کۆشك و بارەگای بڕووخێنیّ و، ئامێزی پڕ میهر و سۆزی لە دنیای بەرین وەربێنیّ و، ئێستاش و دوای ئێستاش هەرکاتێك ئەو هەولّ و کۆشش و ڕەنجدانەی کە پێویستیەتی بۆی بخرێتە کار و، شوێنەکەوتووانی وەك شوێنکەوتوە دلّسۆزە ڕەسەنەکانی چاخی زێڕینی، لەپێناویدا خوێن و ئارەق و سامانی خۆیانیان لیّ وەچاو نەبیّ، دیسان دەتوانیّ هەمان دەور کە دیویەتی ببینێتەوە و، دەولّەتی خوا بەیەکگرتن و دادگەری لە سەرانسەری دنیادا دابمەزریّ و، ڕەگ و ڕیشەی کوفر و ستەم و نەفامی لە بن دەرێنیّ و، جارێکی دیش مافی ڕەوای چەوسێنراوان لە چاوی طاغووتان دەربێنیّ و ئینسانەکان تێکڕاو وێکڕا لە خەمی دنیاو دوا ڕۆژ بڕەخسێنیّ![1]

*******************************

٢٣٩.مسولّمانی کامل و تەواو چاك لە ئیسلام حالّی بوو، دنیاو دوا ڕۆژان وەك دووتای تەرازوو هاوسەنگ ڕادەگریّ و هەرکامێکیان مافی خۆی دەداتیّ و، شتقیان بۆ شتاقیان فڕیّ ناداو، بەناوی سۆفیيايەتی و دنیابەکەم گرتن (زهد)ەوە کارێکی وا ناکات بەس پیاوی قیامەتیّ بیّ و لە ژیانی دنیادا هیچ نەبیّ و طاغوتێك خۆی لەسەر بکاتە پیاو و، ئەویش بەکزی و داماوی لە دەستییەوە ڕابمێنیّ و، جار جارەش کە زۆر برسی بوو وەك پشیلەی برسی بێت و بچیّ و بەزەبوونی بلّیّ: میاو میاو![2]

*******************************

٢٤٠.جوانیی و ڕەونەق و تێر و تەواوی ئیسلام و مسولّمانەتی تەنیا لە کاتێکدا دێتەدی کە بەگوێرەی تەرازووی قورئان و سوننەت بەڕێوەبچیّ و، تەنیا لەو حالّەتەشدا مسولّمان هاوسەنگ (متوازن) دەبیّ و بە پێچەوانەوە هەر لاسەنگ و لاتەلّ دەردەچیّ![3]

---

تێبینی: ئەم کتێبە واتە:-خواناسی ئایین ئیمان – لەسەرەتادا ناوی گەورەترین ڕاستی بووە و وەسالّی ١٩٨٨ز نوسراوە، بەلاّم بەهۆی وون بوونی بەشێك لەو کتێبە لە سوتانی مالّی مامۆستا عەلی باپیر لە سالّی ١٩٩٣ز ئەو بەشانەی کە مابوون کۆکراونەتەوەو ئەو کتێبەیان لیّ پێك هاتووە– لە پێشەکی کتێبی ناوبراوەوە وەرگیراوە -ئامادەکار.

[1] سەرچاوەی پێشوو لا–١٩٨

[2] سەرچاوەی پێشوو لا–٤٢١

[3] زانایانی ئیسلام کێن و چۆنن -چاپی یەکەم – سالّی ٢٠٠١ ز لا–٢٧

٢٤١.ئیسلامی بوون یانی شوێن کەوتنی ئیسلام، وە ئیسلامیی بابایەکە کە بەدوای ئیسلام دەکەوێ و تەنیا ئیسلامەتی بە بەرنامە و ڕێباز و ژیان و گوزەرانی خۆی و میللەتەکەی دەزانێ![1]

*******************************

٢٤٢.مسوڵمانەتی لەگەڵ خۆو خواو خەڵك ڕاست و دروست بوونەو بەنیفاق و چەواشەکاریی و دوو ڕوویی (إزْ دواجية) ئەنجام نادرێ![2]

*******************************

٢٤٣.خوشك و براخۆشەویستەکانم! نەچن هەرکەسێکتان بینی بۆ هەڵسەنگاندن و لەمەحەك دانی مسوڵمانەتی یەکەی هەر بەوەندە وازبێنن کەسەرنجی ڕیش و سمێل[3] و دەلینگی شەرواڵەکەی بدەن و، پاشان بە ئەندازەی درێژی و پانی ڕدێنی و کورت کردنەوە و هەڵپێچانی دەرقاچەکانی نمرە(درجة)ی ئیمان و تەقوای بۆ دابنێین!![4]♦

*******************************

٢٤٤.هەر هێندە گرنگی و بایەخ بەشتێکی گچکەو لاوەکی – لەچاو شتی تر– وەك ڕیش هێشتنەوە بدەن، کە خواو پێغەمبەر (ﷺ) لە قورئان و سوننەتدا ئەمیەتیان پێ داوە و، کارێك مەکەن کە لەبەر هەبوونی ڕیش ئاگاتان لە (بێ ئیشی) زۆر کەس بڕێ و، لەبەر بێ ڕیشیش (ئیش)ی گەلێك کەس بەکەم سەیربکەن![5]

*******************************



[1] سەرچاوەی پێشوو ل–٣٥
[2] سەرچاوەی پێشوو ل–٥٣
[3] ئەگەر ئافرەتیش بێ سەرپۆش و پۆشاکەکەی.
[4] سەرچاوەی پێشوو ل–٦٣
♦ چونکە دڵنیابن بەم جۆرە هەڵسەنگاندن و لەمەحەك دانە تووشی گەلێك هەڵەی کوشندەو هەڵسەنگاندنی بێ مانا دەبن، چونکە ڕیش هێشتنەوەو بەر سمێل کردن و ..هتد زۆر ئاسانن بەهەموو کەس دەکرێن و، بەو پێودانگە زۆر بابای سیخورو جاسوس و بەکرێ گیراوی کوفر خۆیمان بەمسوڵمانێکی چاك و پاك و ڕێ و شوێنی سەلەفی صالح گرتوو پێ دەفرۆشێ و پاشانیش نامەردانە گورزو زەبری خوی دەوەشێنێ!
[5] سەرچاوەی پێشوو ل–٦٣

**٢٤٥.(مسوڵمان دەبێ بەم جۆرە هەڵسوکەوت بکات بۆ ئەوەی لەکارو بانگەوازەکەیدا بەرهەمی هەبێت)**

بە ڕووگەشیی و قسەو گفت و خۆشیی لە کاتێك کە خەڵکی مۆن و مرچ و ڕووگرژن و جۆرەها وشەو قسەی بێ نەزاکەت دەپرژێنن، وەبە بەرچاوتێریی و دەست کراوەیی و بەخشندەیی لە کاتێك دا کە خەڵکی دڵ کوێر و بەرچاو تەنگن و چەنگ دەقووچێنن وەبەهێمنی و لێبووردەیی و دڵگەورەیی لەکاتێك دا کەخەڵکی تەنکە پرێسکە و تووڕە و تۆسنن و دەپرتێنن و دەبۆڵێنن، وە بە ئازایەتی و خۆڕاگری و نە لە خشاویی، لەکاتێك دا کە خەڵکی ترسنۆکن و بەهەڵپەن و دۆستانیشیان دەتۆقێنن، وە بەڕاپەڕین و هەڵسانیان لەحاڵێك دا کە خەڵکی لە نائومێدی یان دەست لە ئەژنۆیان وەردەنێن، وە بەمشورخواردن و بەخەمەوە بوونیان بۆ مسوڵمانان لەکاتێك دا کەخەڵکی هەر خەریکن پارە و ماڵی زیاتر وەدەست دێنن، وەهەقبێژیی و دژی ناهەق بوون لە کاتێك دا کە خەڵکی هەر لە بیری ئەوەدان چۆن چۆنی ڕەزامەندی و ئافەرینی ئەهلی باتڵ وە دەست بێنن و لە خۆیانیان نەڕەنجێنن !![1]

******************************

٢٤٦.بە تەئکید هیچ کەس – مەلا بێ یان پادشا بێ یان گەدا– بە بیری تاریك و هەناوی سارد و سڕ هیچی بۆ لەگەڵ کەس ناکرێ، پێشینانیش جوانیان گوتوە: (ئاسنی سارد بەفوو گەرم نابێ)![2]

******************************

٢٤٧.من هەر کاتێك بابایەك دەبینم کە لەمەیدانی کار و چالاکی ئیسلامی دا خۆی خەریك کردووە، بەڵام لە خوا پەرستییە تایبەتییەکاندا سارد و سڕەو هیچی لە خەڵکی عەوام زیاد نییە، یەکسەر لە مێشکم نیشانەیەکی پرسیاری گەورە پەیدا دەبێ :

تۆ بڵێی ئەو بەڕێزە ڕاست بکات، کە لە خەڵکی عەوام زیاتر خوای خۆش دەوێ و لێی دەترسێ و شەرمی لێ دەکات و، لەوان پتر ئیمانی بە ڕۆژی دوایی و لێپرسینەوە و بەهەشت و دۆزەخ هەیە و... هتد ئەدی ئەگەر ڕاست دەکات بۆچی هیچی لەوان زیاد نیە؟! ئەگەر

[1] سەرچاوەی پێشوو لا-٩٣

[2] سەرچاوەی پێشوو لا-٩٧

ڕاستیش ناکات بۆچی ئیدیعای وادەکات، بابایەك بۆ خۆی وێران بێت چۆن چۆنی غەیری خۆی ئاوەدان دەکات؟![1]

*******************************

٢٤٨.بە ئەندازەی صالح بوونمان، خوا(اصلاح)ی حاڵی خەڵکیمان پێ دەکات بە تەعبیرێکی دیکە: بە بارتەقەی خۆ گۆڕینمان واقیع و خەڵکیشمان پێ دەگۆڕێ![2]

*******************************

٢٤٩.ئەگەر ئسلام و مسوڵمانەتی درەختێك بێ ئەوە (ئیمان و عەقیدە) ڕەگ و ڕیشەو، (عیبادەت و تەقوا) قەد و لق و پۆپ و گەڵا و (ڕەوشت و ئاکاری بەرزو پەسەند) یش میوەو بە(ثمرة) ە کەیەتی ![3]

*******************************

٢٥٠.هەندێك کەس پێیان وایە "مسوڵمان" ئەو کەسەیە کە لە دایك و باێکی مسوڵمان پەیدابووبێ و لەکاتی ناونوس دا بە مسوڵمان نووسرابێ، ئیدی بیروباوەڕ و ڕەوشت و ڕەفتار و خەتی سیاسی چی یەو چۆنەو سەربە چ ڕێچکەو حیزب و تاقمکێکە، ئەوە شتێك نیە، چونکە مسوڵمانەتی لە دایك و بابەوە بەهۆی جینی سەر کرمۆسۆمەکانەوە دەگوێزرێتەوە بۆ ڕۆڵە ![4]

*******************************

٢٥١.هەروەك چۆن هاتنە دەرەوەی تیشك و ڕووناکی لە دەرگاو پەنجەرەکانی ژوورێکەوە کە چرایەکی تێدا هەڵکراوە و، میوە دەرکردنی درەختێکی بەردار کە لەزەوی یەکی بەپیت دا نێژراوە، ئەنجامێکی ئاسایی و بەر هەمێکی سروشتی و چاوەڕوان کراوە، بە هەمان شێوەش پەیدابوونی کردەوە و ڕەفتاری چاك و پەسەندو جم وجۆڵ و چالاکی مسوڵمانانە لە کەسێك دا کە بڕوا و خواناسینی لە دڵدا دامەزراوە ئەنجام و بەهەمێکی سروشتی و چاوەڕێ کراوە. هەر بۆ یەش

---

[1] ڕێگای صالح بوون و بەرەو خوا چوون –تەزکیەی نەفس لەبەر ڕۆشنایی قورئان سوننەتدا – چاپی سێیەم– ساڵی ٢٠٠٥ ز– لا–٩

[2] سەرچاوەی پێشوو لا–١٩

[3] سەرچاوەی پێشوو لا–٢٩٤

[4] مسوڵمانی کامڵ – بەشی یەکەم –بیروباوەڕی مسوڵمان چاپی یەکەم –ساڵی١٩٩٧ز–لا–٤

ده‌بینین وشه‌ی (العمل الصالح) كرده‌وه‌ی چاك ده‌یان جار له‌گه‌لْ وشه‌ی ( إیمان) له‌ قورئانیْ دا دووباره‌ بۆته‌وه‌ ![1]

******************************

٢٥٢.به‌بیْ خواناسین و بروا پیْهیْنانی ئینسان مه‌عناو حیكمه‌تی بوونی خۆی و ژیان و بوونه‌وه‌ر و ده‌وروبه‌ر نازانیْ و، هه‌ر جاره‌ بۆ ته‌فسیركردنی هۆ و حیكمه‌تی ئه‌و شتانه‌ په‌نا ده‌باته‌ به‌ر بیردۆزیْك كه‌ده‌بیْ هه‌ر له‌ بازنه‌یه‌كی داخراودا بخولیْته‌وه‌و له‌ ئاكام دا خۆی و ژیان وبوونی له‌ به‌رچاو ده‌بیْزریْ و، له‌چلْتاوی ئاژه‌لْیزمی داروین و سیكسی فرۆیدو گه‌ده‌ په‌رستی ماركسی دا ده‌تلْیشیْته‌وه‌ و، ئه‌وه‌ هیچ كه‌ قیمه‌ت و ریْزی خۆی له‌ ده‌ست ده‌دا بگره‌ هه‌ر ناوی خۆشی فه‌رامۆش ده‌كات![2]◆

******************************

٢٥٣.هه‌موو ئه‌و كه‌سانه‌ی بیْ ئه‌وه‌ی رۆژیْك له‌ رۆژان ئه‌رك و زه‌حمه‌تی لیْكۆلْینه‌وه‌ و تویْژینه‌وه‌یان له‌ باره‌ی قورئان و سوننه‌ته‌وه‌ كیْشابیْ، ئه‌و قسه‌و باسانه‌ی كه‌ له‌باره‌ی ئیسلام و مسولْمانه‌تی یه‌وه‌ ده‌یانكه‌ن، جا چ مه‌به‌ستیان مه‌دح بیْ چ زه‌م، نا گونجیْ ئیعتیباریان بۆ دابنریْ، چونكه‌ كه‌سیْك له‌ شتیْك شاره‌زا نه‌بیْ و پیْی ئاشنا نه‌بیْ هه‌رشتیْكی له‌و باره‌وه‌ بلْیْ به‌قسه‌ی نیْو هه‌گبه‌و گیرفانی خۆی داده‌نریْ و ره‌فتاره‌كه‌یشی تفه‌نگ به‌ تاریكیه‌وه‌ نان نه‌بیْ چی دیكه‌ نییه‌ ![3]

******************************



[1] سه‌رچاوه‌ی پیْشوو لا-٣٨

[2] ئیسلام و مسولْمانه‌تی و كاری ئیسلامیی. له‌ به‌ر رۆشنایی قورئان سوننه‌ت دا -چاپی یه‌كه‌م -سالْی ٢٠٠٦ ز لا-٢٣٩-٢٤٠

◆ هه‌ر بۆیه‌ش خوای دادگه‌ر و كاربه‌جیْ! فه‌رموویه‌تی (ولاتكونو كالذین نسو الله فأنساهم إنفسهم أولئك هم الفاسقون) واته‌ وه‌ك ئه‌و كه‌سانه‌ش مه‌بن كه‌ خۆیان له‌بیرچۆته‌وه‌ ئه‌ویش خۆیانی له‌بیر بردوونه‌ته‌وه‌، ئه‌وانه‌ له‌ریْ ده‌رچووان.

[3] ئیسلام مسولْمانه‌تی و كاری ئیسلامی له‌ژیْر رۆشنایی قورئان سونه‌ت دا-چاپی یه‌كه‌م سالْی -٢٠٠٦ز- لا-٨

٢٥٤.بێگومان ناگونجێ لەسەر بناغەی بەهەڵە تێگەیشتن لە ئیسلام جگە لە دیواری مسوڵمانەتیی کرچ وکاڵ و هەڵە و ناتەواو هیچ دیوارێکی دیکە هەڵبچنرێ و لەمێژیشە پێشینان گوتوویانە: (گۆزە چی تێدابێ هەر ئەوەی لێ دەڕژێ)![1]

******************************

٢٥٥.هیوادارم میللەتە مسوڵمانەکەمان ڕۆژ بۆ ڕۆژێ زیاتر و چاکتر لە قورئان و سوننەت شارەزابێ و بەشەریعەتی خوا ئاشنابێ، هەتا وای لێ دێ نە هیچ نەزانێکی بە نەزانیی خۆ زان و خەڵك بەسادەو گێل زان و، نە هیچ خۆ بە زانا زانێکی لە ڕاستیدا نەزان، جورئەتی ئەوە نەکات کە باسی ئیسلامەتی بۆ بکات و مسوڵمانەتیی بۆ پێناسە بکات وە هەرکاتێك واشیان کرد لە جیاتی گوێ بۆ شلکردن و سەر بۆ لەقاندن قسەکانیان تورِ بدات![2]

******************************

٢٥٦.مەبەست لەمسوڵمانەتیی بەڕێوەبردنی ئیسلامە بەشێوەیەکی ڕاست و دروست، واتە بەو جۆرەی کە پێغەمبەر خوا (ﷺ) و هاوەڵانی بەڕێوەیان بردوە لە ژیانی تاکی و خێزانی و کۆمەڵی یان![3]

******************************

٢٥٧.مسوڵمان ئەو کەسەیە کە ئیسلام لە خۆیدا بەرجەستە دەکات و لەگەڵی کارلێك (تفاعل) دەکات و بەو شێوەیە کە ئیسلام — واتە هەردووك سەرچاوەی ڕوون و بێ چەندو چوونی کە قورئان و سوننەتن— دەڵێت کەسایەتی خۆی دادەڕێژێت لە بواری جیهانبینی (تێڕوانین) و لە بواری ئیمان و عەقیدەو خواپەرستی و ئەدەب و ڕەوشت و هەڵوێست و هەڵس و کەوت کردنی لەگەڵ خەڵك و دەوروبەردا![4]

******************************

٢٥٨.کەسێك کە لە مزگەوتێ مسوڵمانەتیی و دینداریی دەکات و ڕوو لە خوایە، بەڵام لە مەیدانی بازاڕ و کارو کاسبی، یان حوکم و سیاسەت، یان نیشتیمان پەروەری و نەتەوایەتی یان ..یان ..

---

[1] سەرچاوەی پێشوو لا-١١

[2] سەرچاوەی پێشوو لا-١١

[3] سەرچاوەی پێشوو لا-١٨

[4] سەرچاوەی پێشوو لا-٤٦

هتد دا لە ئیسلام و دەستور و یاساکانی لادەدات و ڕوو لە غەیری خوا دەکات، ئەوە بێگومان بە ئەندازەی لە ئیسلام لادان و لە شەریعەت دوور کەوتنەوەکەی نیشانەی پرسیار(؟) لەسەر مسوڵمانەتیی و دینداری و خواپەرستی یەکەی پەیدا دەکات، چونکە ئینسانی مسوڵمان تەنها بەئەندازەی ئەوە مسوڵمان و دیندار و خواپەرستە کە بەشەریعەتی خوای دادگەرو کاربەجێ وە پابەندو بۆ خوا گەردن کەچە! جا کەسێکی وا کە لە مزگەوتدا سەجدە و ڕکووع بۆ خوا دەبات، بەڵام لە دائیرە و بازاڕ و مەیدانەکانی حوکم و سیاسەت و جم و جۆڵ و چالاکییەکانی دیکەیدا پشت لە خواو دین و شەریعەتەکەی دەکات، ئەوە مانای وایە بابایەکی وا بۆ خوا گەردن کەچ (مسلم )نیە! جا لێرەوە دەتوانین بڵێین: کە مسوڵمانی تەواو هەیە کە لە هەموو لایەنەکانی ژیانیدا بۆ خوا مل کەچە، هەروەها نیوە مسوڵمان و سێ یەکە مسوڵمان و بگرە دەیە کە مسوڵمانیش هەیە! !وەبێگومان خوای پەروەردگار وای لە ئێمە خواستوە کە مسوڵمانی تەواوبین و بەتەواوی مل کەچی خوا بین ![1]

*******************************

٢٥٩.بەبێ ئیمانێکی دوور لە کوفر و خوا بە یەکگرتن (توحید) ێکی دوور لە هاوبەش دانان (شرك) و پابەندییەکی دوور لە لادان (انحراف)یش ئەو بەندایەتی بۆ خوا کردن و مسوڵمانەتی یە ڕاست و ڕەسەنە نا یەتەدی کە مرۆڤ بکاتە شایستەی موژدەی پێغەمبەران(علیهم الصلاة والسلام)و پارێزرا و لە هەڕەشە و ترساندنیان![2]

*******************************

٢٦٠.هەرلا یەنێکی ئیسلامی ئەگەر بیەوێ بە ڕەسەن و شەرعیی لە قەڵەم بدرێ نابێ کەللە وشك و دەماگیربێ بۆ حیزب و ڕێکخراوەکەی خۆی، بەڵکو دەبێ عەقڵی کراوە بێت و سینگیشی ئاوەڵا بێت بۆ قبوڵ کردنی هەر ڕەخنە و پێشنیار و سەرنجێك بۆ ئەوەی کارەکەی هەرچی زیاتر شەرعی و ڕێکتر و ڕاستر بێ![3]

*******************************

---

[1] سەرچاوەی پێشوو لا-٥٢-٥٣

[2] سەرچاوەی پێشوو لا-٨١

[3] سەرچاوەی پێشوو لا-١٤٤-١٤٥

٢٦١.ئەو کۆمەڵە کە کۆدەبێتەوە بۆ ئەنجام دانی کارێکی ئیسلامی دەبێ وریابێ ئەو ئاڵایەی لەسەر خۆیەوە هەڵی داوەو بەرزی کردۆتەوە لە ژێر هیچ فشارێك دا و نە لەترسان و نە لەبرسان لێخن و چڵکنیی نەکات و لە بیری نەچێ کە خۆی تەنها وەسیلەیە و ئیسلام ئامانجەو خزمەتی خەڵکی ئامانجە![1]

******************************

٢٦٢.هێز و وزەی مسوڵمانان هەرچەندە زۆر بێت ئەگەر ڕێك نەخرێ و (تنظيم و ترتيب ) نەکرێ هیچی لێ شین نابێتەوە، بەڵکو زۆر جار ئەو مسوڵمانە ڕێك نەخراو و پەروەردە نەکراوو گۆش نە کراوانە دەبنە دار دەستی دوژمنانی ئیسلام و دەبنە ئامراز و ئالەتێك و دەبنە بورغویەك لە مەکینەیەك کە بەپێچەوانەی ئیسلام دەسووڕێ![2]

******************************

٢٦٣.بێگومان کۆمەڵ بوونی موسڵمانانیش ئەگەر بۆ ئەوە نەبێ کە هێز و دەسەڵات و سام و هەیبەتیان پەیدا ببێ مانای وایە دەبێتە وە شتی شەخسی، ڕەنگە زیاتر دووکان دانان و کات گوزەراندان و بەرژەوەندی شەخسی و بنەماڵیی و بەرژەوەندی دابینکردنی هەندێك خەڵك بێت![3]

******************************

٢٦٤.کۆمەڵگاو کیانی دەوڵەتی ئیسلامی هەڵقوڵاوی ئیرادەو واقیعی ئیماندارانەی خەڵکێکی مسوڵمانی لە ئیسلام تێگەیشتووە لە مسوڵمانەتی دا پێ گەیشتووە کە لە خاکێکی ئازاد دا نیشتەجێیە و دەیەوێ ژینی بەپێی حەقی خوای پەروەردگار ڕێك بخات و بیگوزەرێنێ بۆ ئەوەی بەختەوەری دنیاو سەرفرازی دوارۆژ بێت ![4]

******************************

٢٦٥.هەر کاتێك ویستمان دەربارەی مسوڵمانەتی و نا مسوڵمانەتیی کەسێك قسە بکەین و حوکمی ئیمان یان کوفری بۆ بدەین، تەنها یەك ڕێگامان لە پێشە ئەویش ئەوەیە کەسەرنجی دەربڕینەکانی زمانی و کردەوەی ئەندامە کانی بدەین و بە هیچ شێوەیەك بۆمان نیە بەلای بیرو خولیاکانی نێو

---

[1] سەرچاوەی پێشوو لا-١٤٥

[2] سەرچاوەی پێشوو لا-١٦٣

[3] سەرچاوەی پێشوو لا-١٦٥

[4] سەرچاوەی پێشوو لا-٢٣٢

زەین و مێشکی و نیاز و مەبەستەکانی نێو دڵی دابچین، وەك ئەوە کە ئیدیعا بکەین کە فڵانە کەس کوفرو شیرکی لە عەقڵ و دڵ دا هەیە، یا بڵێین: ڕەنگە لە وانەیە فڵانە کەس شیرك و کوفرو نیفاقی لە دڵ داهەبێ![1]◆

******************************

٢٦٦.ئێمە دەڵێین حەق ئەوەیە کە خوا فەرموویەتی: بەڵام هیچ کاتێ ناڵێین، ئەوەی دەیڵێین هەمووی حەق و ڕاستە![2]

******************************

٢٦٧.مێژووی ئیسلام کەم و زۆر هەر پەیوەست بووە بە دەقە شەرعی یەکانەوە ئەو کاتەی کە مسوڵمانان بە شەریعەتی خواوە پابەند بوون، بەڵام وەختێك کە مسوڵمانان لەشەرع لایان داوە دیارە ئەو کاتە دەگونجێ بڵێین ئەوە مێژووی مسوڵمانانە، بەڵام بەڕاستی ئەوە بەمێژووی ئیسلام دانانرێت![3]◆

******************************



[1] زنجیرە دەرسی ئیمان و عەقیدەی ئیسلامی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەت دا بەرگی یەکەم /ئیمان و عەقیدەی ئیسلامی چی یەو چۆنە-چاپی یەکەم ساڵی ٢٠٠٧ز- لا-٢٦٠

◆ چونکە نهێنی یەکانی دەروونی ئینسان بێجگە لەخوای بەدیهێنەر (سبحانەوتعالی)هیچ کەسی دیکە پەییان پێ نابات و دەرکیان ناکات،وەك فەرموویەتی:(وَأَسِرُّوا قَوْلَكُمْ أَوِ اجْهَرُوابِهِ إِنَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ، أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ) الملك ١٣-١٤

واتە: وە قسەکانتان بە پەنهانی بکەن، یان ئاشکرایان بکەن (خواهەر دەیانزانێ) چونکە بێگومان ئەو نهێنیەکانی سینەکان دەزانێ، جا چۆن کەسێك کە دروست کراوەکانی وە دیهێنان و یەکجارپەنهان بین و شارەزاشە نازانێ ؟!

[2] چەندمەسەلەیەکی باوی سەردەم سەرنجێکی واقیعیانەو هەڵسەنگاندێکی شەرعییانە -چاپی چوارەم - ساڵی ٢٠٠٥ ز-لا-١٧٣

[3] سەرچاوەی پێشوو-لا-٢٤٣-٢٤٤

◆ واتە مسوڵمانان وایان ڕەفتار کردووە، بەڵام ئایا چەند وەفادار بوون بۆ دینە کەیان و چەندە پابەند بوون بە دینە کە یانەوە ؟! ئەوە شتێکی دیکەیە، بەڵام بێگومان ڕەوا نییە هەڵەو کەم و کوڕی و لادانی مسوڵمانان لەسەر ئیسلام حیساب بکرێ !

٢٦٨.تەوژمی ئیسلامی ئەو کۆمەڵە خەڵکەن کە دەیانەوێ ژیان و گوزەرانی تاکیی و خێزانیی و کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووری و ... هتد خۆیان و کۆمەڵگاکەیان لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەت داو لەسەربناغەی شەریعەت ڕێك بخەن و بگوزەرێنن![1]

******************************

٢٦٩.حاڵەتی ئاسایی و سروشتی خەڵکێکی مسوڵمان، ئەوەیە کە جیهانبینی و عەقیدە و ڕەوشت و ئاکار و هەڵس و کەوتیان هەڵقوڵاوی ئایین و بەرنامەکەیان بێ کە ئیسلامە، بۆیە شتێکی نامەنتیقی و نەگونجاوە کە کەسێك خۆی پێ مسوڵمان بێت و ڕووبکاتە سیکۆلاریزم، مەگەر لە یەکێکیان یان لە هەر دووکیان حاڵی نەبووبێ ![2]

******************************

٢٧٠.نەصرانییەکان هەتا دەستکرتوو بوون بەئایینە شێوێنراوەکەیانەوە لە ڕووی شارستانیی و ژیان و گوزەرانەوە دواکەو توو بوون و، کە دەستبەر داری بوون، پێشکەوتن، بەڵام مسوڵمانان بەپێچەوانەی وانەوە، پێشکەوتنیان بەرهەمی باپەند بونیان بوو بە ئیسلامەوە و کاتێك دەستیان لە ئاینەکەیان شل بوو بەجێمان![3]

******************************

٢٧١.لە ڕووی ڕیزکردنی کاتی (الترتيب الزمني) یەوە (ئامانج) داویین قۆناغی کاروخەباتی ئسلامی یەو (مەبەست )یش دوایین قۆناغیەتی و بەرهەم و ئەنجامیەتی لە دوارۆژدا، کە یەکەمیان لە بەرپاکردنی ئایین (إقامه الدين) داو دووەمیشیان لە ڕەزامەندی خوا و بە هەشتی ڕازاوە و بەرین دا خۆی دەنوێنێ ![4]

******************************

٢٧٢.پێویستە دڵنیا و مسۆگەربین کە دامەزراندن و بنیات نانی بیروباوەڕ لە دڵ و عەقڵی کۆمەڵێك دا کە دەویسترێ کۆمەڵگایەکی ئیسلام و کیان و قەوارەیەکی ئیسلام یان لێ پێك بهێنرێ، یە کەمین

---

[1] تەوژمی ئیسلامیی و عەلمانی خاڵە هاوبەش و جیاوازەکانیان –چاپی یەکەم –ساڵی ٢٠٠٨ ز –لا–٢٠
[2] سەرچاوەی پێشوو لا–٢٢
[3] سەرچاوەی پێشوو–لا–١٠٣
[4] پرۆژی بەرنامەی فیکریی کاری ئیسلامی –ساڵی – ١٩٩٦ز–چاپی یەکەم –لا–٩،٨

و گرنگترین هەنگاوه و، پێش ئەوه نابێ هیچ هەنگاوێكی دیكه بنرێ ئەگەر نا كارەكه پووچەڵ و بێ كاكڵ دەبێ و دبێته خوری و سەرناگرێ ![1]

********************************

٢٧٣.ئەو كەسه بەمسوڵمان حسێب ناكرێ كه شایەتمان دێنێ، بەڵام بەشێوەیەك لێكی دەداتەوه، كه دەبێته هۆی بڕوا پێ نەبوونی یەكتایی خوا یان هەندێك له ناوو سیفەتە كانی یاخود شایەتمان دێنێ، بەڵام دان بەهەندێك یان ئایەتێك یان وشەیەك و پیتێكی قورئان ناهێنێ، چونكه (دان پێدانەهێنان)ە كەی بەڵگەیه لەسەر پووچی و ناڕاستی (دانپێداهێنا)ەكەی ![2]

********************************

٢٧٤.تێگەیشتن له ئایین چەنده پەیوەندی به عەقڵەوه هەیه هێندەش به دڵەوه ![3]

********************************

٢٧٥.مسوڵمان هەتا عەقڵی شارەزا و وریاتر و دڵی پاك و بێدارتر و كردەوەی چاك و ڕاست تربێ، پتر شایستەی ئەوەی تێدا دێته دی كه خوا بەپلە كانی هیدایەت دا بەرزی بكاتەوه و بەناوو سیفەته بەرزەكانی خۆی و یاسا و دەستوورەكانی ئاشنای بكات![4]◆

********************************

٢٧٦.تێگەیشتن له قورئان وسوننەت بەس نیه بۆ بەڕێوەبردنی ئایین بەڵكو ناسینی ئەو واقیعەش كه دەمانەوێ ئایینی تێدابچه سپێنین پێویسته ![5]

---

[1] سەرچاوەی پێشوو–لا–٤٠

[2] سەرچاوەی پێشوو–لا–٤٨

[3] سەرچاوەی پێشوو–لا–١٠٥

[4] سەرچاوەی پێشوو–لا–١٠٥

◆ دیاره جیاوازی نێوان دینداری و خواپەرستی هاوەڵه هەڵبژاردەو بەڕێزەكانی پێغەمبەر (ﷺ) خوا لێیان ڕازی بێ و شوێن كەوتووانی ڕاستەقینەیان و خەڵكی دیكەش هەر لەم مەسەلەیەدا شێرراوەتەوه، چونكه ئەو بەڕێزانه بەهەموو كیان و بوونیان و بەدەرو دەروونیان لە ئیسلام تێگەیشتبوون، بەڵام خەڵكی دیكه هەروا بەقسەو بەسەر زارەكی یان ئەو پەڕی بەبیرو هۆشێكی وشك ئایینیان وەرگرتووه پێشیان وایه ،چونكه ئەوانیش وەك مسوڵمانه ڕەسەنه پێشووەكان دەقەكانی قورئان و سوننەتیان لەبەركردوون و تۆماری زەینیان لێ پڕكردوون ،گەیشتوونەته ڕیزی ئەوان و كاریان تەواوه

[5] سەرچاوەی پێشوو–لا–١٠٨

******************************

٢٧٧.هەروەك چۆن بەس بە لەبەركردن(حفظ) ی دەقەكانی ئایین نابینە شارەزا (فقیە) لەئایین دا، بەڵكو پێویستە هەرسێك هێزەكانی (عەقڵ) و (دڵ) و (جەستە)، واتە بەبیرو هۆش و هەست و عاتیفە و كردەوە و ڕەفتار (تفاعل)ی لەگەڵ بكەین ئنجا تێ دەگەین و شارەزا دەبین هەر بۆ یەش پێشەوامان نەیفەرمووە( من یرید بە اللە خیرا یحفظە نصوص الدین) ، بەڵكو فەرموویەتی ( من یرید بە اللە خیرا یفقهە فی الدین ) ![1]

******************************

٢٧٨.لە نێو هەر گەل و كۆمەڵێك دا بویستریٚ حوكم و بەرنامەی خوا جیٚ بەجیٚ بكریٚ و جم و جۆڵ و چالاكی یەكانی ژیانی پیٚ ڕێك بخریٚ، پێویستە پێش ئەوە هەوڵ بدریٚ خەڵكە كە تێڕوانین و بیرو باوەڕی خوایی پیٚ بناسریٚ و (هدی)ی پیٚ هەزم بكریٚ، چونكە ماقووڵ نیە ئینسان بڕوای نەبیٚ و كار و ڕەفتاری بڕوا دارانەی لیٚ چاوەڕوان بكریٚ، وەهیچ ڕیٚ ی تیٚ ناچیٚ كۆمەڵێكی مسوڵمان و ڕێڕوونی كراو (مهتدی ) بارنەهاتبن و بەرنامەی خواش ببێتە حاكم و دابمەزریٚ![2]

******************************

٢٧٩.لە یەكتر گەیشتن (تفاهم )ی دوو كۆمەڵ یان زیاتر ئاسان ترەو نێزیكترە لە لەیەكتر گەیشتن و یەكگرتنی هەزاران كەسی پرژو و بڵاوو بارنەهێنراو ![3]

******************************

٢٨٠.جەوهەری ڕاوێژ بریتی یە لە كۆكردنەوەی شیلەی هەمو عەقڵ و دڵەكان بۆ پێكهێنانی شانەی پوختی بڕیارەكان![4]

******************************

٢٨١.دەبیٚ هەركام لە ئەندامانی كۆمەڵی مسوڵمان وا پەروەردە بكریٚ كە لەیەك كات دا: خواپەرستێكی صالح، سیاسەتمەدارێكی كارامە و، پارێزكارێكی چاو بە فرمێسك و جەنگاوەرێكی

---

[1] سەرچاوەی پێشوو-ل-١٠٨
[2] سەرچاوەی پێشوو-ل-١٠٨-١٠٩
[3] سەرچاوەی پێشوو-ل-١٣٥
[4] سەرچاوەی پێشوو-ل-١٤٦

چەنگ بەخوێن و، عاقڵ مەندێکی تێگەیشوو و دڵ بێدارێکی پێگەیشتوو دواڕۆژخوازێکی بێ پشوو و دنیا ناسێکی بە عەقڵ و خوو..هتد بێ! [٥]

٢٨٢.پاراستنی عیزەت بەوە دەبێ کە کۆمەڵی مسوڵمان سیاسەتی ڕوو بەڕووبوونەوە و بەرەنگاری بە چەك و هێز نەگرێتە بەر هەتا دەگاتە قۆناغ و کاتی خۆی و پێداویستییەکا (مستلزمات)ی بۆ دابین دەکات بە گوێرەی توانا، وە هەر کاتێك کەوتە قۆناغی بەرەنگاری و جەنگیشەوە هێندە زەبری توند و گرچ و بڕ بوەشێنێ و بە شێوەیەك لە دوژمن بدا کە بەچۆکی دا بێنێ و لە خۆڵی وەر گەوزێنێ! وەك قورئان فەرموویەتی (فشرد بهم من خلفهم) [١]

*******************************

٢٨٣.دەبێ کۆمەڵی مسوڵمان دانا و لێزان بێ و دیوار پێش بناغە و فەرع پێش ئەصل و گرنگ پێش گرنگتر نەخات و، هەر هەنگاوە لە قۆناغ و کاتی خۆی دا بنێ و ڕیز (ترتیب) ی سروشتی و مەنتیقی بەش و قۆناغەکانی دینداری تێك نەدات ! [٢]

*******************************

٢٨٤.بێگومان مەبەست زۆر یارمەتی ئینسان دەدات کە ڕێگا بزر نەکات و بەملا و لاش دا لا نەدات، کە وابێ دەتوانین بڵێین: مەگەر چۆن دەنا ڕێ لێون بوون و هەڵتە بوون بەڵگەی نا(مخلص) بوونی ئینسانە، بەر لەوەی نیشانەی نەشارە زابوونی بێ لە ئیسلام دا! [٣]

*******************************

٢٨٥.قیاس کردنی ئیسلام لەسەر واقیع و حاڵی شپرز و بە جێماوی مسوڵمانان و بەهەڵە واحاڵی بوون کە: بارودۆخی واشپرز و بێ سەرو بەری مسوڵمانان ڕەنگدانەوەی ئیسلامە و لەمەوە گەیشتنە ئەو ئەنجامگیریی یە کە: مادام مسوڵمانان بەهۆی شوێن کەوتنی دینەکەیانەوە بەو دەردەچوون، کەواتە دیارە دینەکەیان لە خودی خۆی دا ناتەواوەو هەڵەیە! بەڵام بێگومان ئەو جۆرە بیرکردنەوە و ئەو قیاس کردنە لە بنەڕەتەوە هەڵەیە، چونکە کاتێك واقیع و حاڵی کۆمەڵێك دەکرێتە بەڵگەی ڕاستی یان ناڕاستیی بەرنامە و ڕێبازەکەیان کە بەرنامە و ڕێبازەکەیانەوە پابەند بن و پەیرەوی لێ

---

[٥] سەرچاوەی پێشوو-ل-١٥١

[١] سەرچاوەی پێشوو-ل-١٥٦

[٢] سەرچاوەی پێشوو-ل-١٥٦

[٣] سەرچاوەی پێشوو-ل-٢٤٣

بکەن و ئەو چی دەڵێ وابکەن، بەڵام لەکاتێك دا پێیەوە پابەند نەبن و بگرە ئەو چی گووتوە ئەوان پێچەوانەی بکەن، نا گونجێ واقیعەکەیان بکرێتە بەڵگە لەسەر بەرنامە و ڕێبازەکەیان ئایا پزیشکێك کە جگەرە دەکێشێ و شەراب دەخواتەوە دەکرێ ئەو ڕەفتارەی بکەینە بەڵگە لەسەر ناڕاستی و بەکەڵك نەهاتوویی زانستی پزیشکی ![1]

******************************

٢٨٦.ئێمەی مسوڵمان، هەتا دەستگرتو و بووین بە ئیسلامەوە کەم و زۆر پەیڕەویی مان لە قورئان دەکرد، نەك هەر لە پێش خەڵکەوە بووین، بەڵکو سەرقافڵەی کاروانی ژیان و شارستانێتی بووین لەسەر ئاستی دنیا و هەموو بوارەکانی زانست و دادگەری و چاکەکاریی و ئازادیی و سەماحەت و...هتد دا سەرمەشق بووین، بەڵام کاتێك دوورکەوتینەوە و بە ئیسلام نامۆ بووین، گلۆڵەمان کەوتە لێژی ![2]◆

******************************

٢٨٧.مسوڵمان مێشك و دڵ و دەروونی بۆش و بەتاڵ و بێ بەرنامە نیە ! بەڵکو هەموو شتێکی خۆی هەیە و ئایین و بەرنامەی ڕاست و دروست و لەگەڵ عەقڵ و فیطرەت و زانیاری دا گونجاوە کەیشی دەرگای وەرگرتنی هەموو شتێکی چاکی بۆ خستۆتە سەر پشت و یەکاڵا کردۆتەوە ![3]

******************************

٢٨٨.مسوڵمان سەلبی و داخراو نیە لە بەرامبەر فیکر و کلتووری خەڵکی دیکە دا، بەڵام لاسایی کەرەوە و خۆ بەدەستەوەدەریش نیە ![4]

******************************

٢٨٩.مسوڵمان نابێ وەك سەبەتە بێ هەرچی تێکەی هەر وەری بگرێ و هەڵی گرێ! بەڵکو دەبێ بێژینگ بێ و شتی باشی خەڵك وەربگرێ و خراپە کەشی فڕێ بدات ![5]

---

[1] زنجیرەی بابەتە هەنوکەییەکان ئەڵقەی یەکەم –گەنجەکانمان لەنێوان ڕەسەنایەتی ولاسایی کردنەوەدا– چاپی یەکەم –ساڵی ٢٠٠٦ ز لا–١٣–١٤

[2] سەرچاوەی پێشوو–لا–١٦

◆ ئەمەش ڕاستیەکی مێژوویی یە کەپێش مێژوو زانە مسوڵمانەکان مێژوو نوسانی نا مسوڵمانی وەك: درایبەر و جۆلستهێر و ئادەم میتز و کارل برۆکمان، دانیان پێدا هێناوە!

[3] سەرچاوەی پێشوو–لا–٥٤–٥٥

[4] سەرچاوەی پێشوو–لا–٦٥

********************************

٢٩٠.ئێمەی مسوڵمان خاوەنی فیکرو ئەدەب و کلتووری خۆمانین کە لەدین و عەقیدە و جیهانبینی خۆمانەوە هەڵقوڵیوە، بە هەمان شێوە خەڵکی دیکەش خاوەنی کلتوور و ئەدەبی خۆیەتی کە پەیوەندیی بە دین و عەقیدە و جیهانبینی خۆیەوە هەیە، ئیدی مەرج نیە ئەو فیکر و کلتوورەی ئەوان بە کەڵکی ئێمە بێت![1]

********************************

٢٩١.مەرج نیە ئێمە هەر خۆمان بە دڵسۆزی ئەهلی مزگەوت بزانین، ئەوانەی کە لە دەرەوەی مزگەوتیشن، سەرجەم ئەوانەی کە ئوممەتی پێغەمبەرن (ﷺ) بگرە بەزەیی و پەرۆش و دڵسۆزییمان بۆ تێکڕای خەڵك و میللەتی کوردستانە، چ ئەوەی کە ڕوو لە قیبلە دەکات، وە چ ئەوەی کە ڕووشی تێ ناکات، چونکە ئێمە کەسێك کە وەك برایەکی دینی و خوشکێکی دینیش بۆی بە بەزەیی و پەرۆش نەبین، وەك ئینسانێك کە خوا خولقاندوویەتی بۆ بەندایەتی خۆی و پابەندیی بە ئاینەکەیەوە بۆ ئەوەی بە هۆی بەندایەتیکردنی بۆ خوای پەروەردگار و دادگەر (تبارك وتعالی ) و شوێنکەوتنی شەریعەتەکەیەوە سەربەرز و ڕووسور و سەرفرازی دنیاو دواڕۆژ بێ لەو ڕووەوە بۆ ئەویش هەر دڵسۆزین![2]

********************************

٢٩٢.ئەگەر ڕاستە مسوڵمانین، ئەگەر ڕاستە خۆمان بە بەشێك لە ئوممەتی پێغەمبەر (ﷺ) دەزانین، دەبێ پێش هەموو شتێك و پێش هەموو کەسێك بۆ شەریعەتی خوا بۆ دینی خوای پەروەردگار دڵسۆز بین![3]

********************************

٢٩٣.پێغەمبەر (ﷺ)ئەو پێشەنگە ئیسلامی یەی کە لەمەککە پەروەردەی کردبوون لەگەڵ ئەو بنکە جەماوەرییەی کە لە (یەثریب) ڕەخسابوو و خەملی بوو، لەیەك دان و پێکەوەی ئاوێتە کردن![4]

---

[0] سەرچاوەی پێشوو-لا-٦٦

[1] سەرچاوەی پێشوو-لا-٦٦

[2] زنجیرەی بابەتە هەنوکەییەکان ئەڵقەی دووەم -باوریابین داڕووخانی ڕەوشت کۆمەڵگاکەمان بەرەو هەڵدێر دەبات -چاپی یەکەمی نوسینگەی تەفسیر -ساڵی ٢٠٠٧ ز-لا-١٨-١٩
تێبینی ئەم کتێبە دووجاری تر چاپ کراوە، کەواتە ئەمە چاپی سێیەم یەتی .

[3] سەرچاوەی پێشوو-لا-٥١

٢٩٤.ئیمان و عەقیدەی ڕاست و دروست یەکەم هۆکار و هەنگاوی پێ گەیشتن و دروستبوونی پێشەنگێکە کە بتوانن کۆمەڵگای خۆیان بگۆڕن بەو شێوەیە بیگۆڕن و بەو ئاڕاستەیە دا بیگۆڕن کە شەریعەتی خوا دەیەوێ و خوا پێ ی خۆشە ڕووی پێ لەقیبلەی خوا بکەن ڕووی پێ لە ڕەزامەندی خوا بکەن، بەڵێ یەکەمین هەنگاوی دروست و بوونی پێشەنگێك لە بواری کاری ئیسلامیی دا بریتیە لەوەرگرتن و هەزمکردنی ئیمان و عەقیدەی ڕاست و دروست ئەو ئیمان و عەقیدەیە کە خوا بەیەکگرتن (التوحید) وەك کاکڵەو جەوهەرەکەیەتی ![1]

******************************

٢٩٥.کاتێك دەتوانین ببینە پیشەنگ بۆ خەڵك، کە ئەو دینەی خەڵکی بۆ بانگ دەکەین لێی شارەزابین، وەکاتێکیش دەتوانین لەو کۆمەڵگاو دەوروبەرەدا کاری ڕاست و دروست بکەین، کەپێی ئاشنا بین پێ ی شارەزابین![2]

******************************

٢٩٦.هەر کاتێك لایەنێکی ئیسلامی تەنیا هەڵبژاردەیەك (نخبة) بوو بە ئاسانی لە بەین دەبرێ، وەقەتیش واقیعی پێ ناگوڕدرێ، بۆ یەدەبێ هەمیشە هەوڵ بدرێ کە کار و جم و جوڵی ئیسلامیی ببێتە تەوژم، بەڵێ کاری ئیسلامی بە(نوخبة) دەست پێ دەکات، بەڵام دوایی دەبێ ببێتە تەوژم و بنکەی جەماوەریی بۆ خۆی دروست بکات و ڕای گشتی بۆ خۆی دروست بکات و خەڵك لەگەڵ خۆی دا هاوڕەنگ هاو دەنگ بکات ![3]

******************************

٢٩٧.بێگومان هەرکات مسوڵمانان بەهەڵە واتێگەیشتن کە دینەکەیان وەك دینی مەسیحی گۆڕراو حەقی بەسەر حوکم و سیاسەتەوە نیەو دەڵێ: ئەوەی هیقەیسەرە بۆ قەیسەری لێ گەڕێ و ئەوەی هی خواشە بۆ خوا (دع ما لقیصر لقیصر وما لله لله) ئەوە مەیدانی مشوور خواردن لە کۆمەڵگا لە بوارەکانی سیاسەت و ئابووری و کۆمەڵایەتی و جەنگ و ئاشتیدا چۆڵ دەکەن و ئەو کاتەش خەڵکو

---

[٤] زنجیرەی بابەتە هەنوکەییەکان ئەڵقەی -چوارەم-چۆنیەتی بوونە پێشەنگ و بنیاتنانی بنکەی جەماوری - چاپی یەکەم -ساڵی٢٠٠٧ ز-لا- ١٧

[1] سەرچاوەی پێشوو-لا-٢٠-٢١

[2] سەرچاوەی پێشوو-لا-٢٩

[3] سەرچاوەی پێشوو-لا-٤٥

وڵات بەدەست دنیا خۆرە خوانەناسەکان و طاغووتە خۆسەپێن و خۆشگوزەراکانەوە گیردەخۆن و پەندی (بەزی بەکتکی دەسپێرن ) یان بەسەردا دەچەسپێ![1]

*******************************

٢٩٨.لە کۆمەڵگایەکی ئیسلامییدا کە حوکمڕان لە لایەن خەڵکەوە هەڵدەبژێرێ و، بەیعەتی پێ دەدرێ و، پاشان لەسەری پێویست دەکرێ کە بەشەریعەتەوە پابەند بێت، وە بابای حوکمڕان خۆی بەوەکیل و جێگری خەڵك و کۆمەڵگا دەزانێ و دەزانێ کە شەرعییەت پێدرانی و شەرعییەت لێ ستێنترانەوەیشی بەدەست خەڵکە![2]

*******************************

٢٩٩.مسوڵمان بوونی تاك و کۆمەڵ بەبێ پابەندی بە ئیسلامەوە هیچ واتاو نێوەڕۆکێکی نابێ! ئاخر مسوڵمان (مسلم) کەسێکە بۆ خوا (تبارك وتعالى ) ملکەچ بێت و ملکەچیش بۆ خوا بە پابەندی بەئیسلامەوە دەبێ![3]

*******************************

٣٠٠.ئایا بابایەکی ئیسلامی کە بەرنامەکەی ئیسلامە ئەگەر ئایەت و فەرمووده بۆ خەڵکی نەخوێنێتەوە چۆن چۆنی لەبەرنامە و ڕێبازەکەی خۆی کە ئیسلامە حاڵییان بکات، مەگەر بەبێ ئایەت و فەرمووده باسی دین و ئیسلام دەکرێ، وە ئایا ئیسلام جگە لە قورئان و سوننەت چیە؟![4]

*******************************

٣٠١.شتێکی ماقووڵ و مەنتیقییە ڕێ لە کەسانێك بگیرێ ئایەت و فەرمووده بخوێننەوە کە بڕوایان پێیان نییە و، پێیان وایە بە کەڵکی ئەمڕۆ نایەن، بۆ ئەوەی دووچاری نیفاق و دووڕوویی و دووانەتی (إزدواجية ) نەبن! بەڵام بەکجار شتێکی سەیرو بێ جێیە ڕێ لە کەسانێك بگیرێ ئایەت و

---

[1] زنجیرەی بابەتە هەنوکەییەکان ئەڵقەی پێنجەم-سیاسەتی ئیسلامی و چەند ڕوونکردنەوەیەك -چاپی یەکەم -ساڵی ٢٠٠٧-لا-١٢-١٣

[2] سەرچاوەی پێشوو-لا-٢٧

[3] سەرچاوەی پێشوو-لا-٣٣-٣٤

[4] سەرچاوەی پێشوو-لا-٤٢

فەرموودە بخوێننە وە کەئامانجیان ئەوەیە ئایەت و فەرموودەکان بکرێنە بەرنامەو پەیڕەوی ژیان و گوزەرانی تاك و خێزان و کۆمەڵگا ![1]

*******************************

٣٠٢.ئەگەر بویسترێ تەوژمی ئیسلامی بەشێوەیەکی ڕاست و واقیعی یانەو مەنتیقیانە پێناسە بکرێ، دەبێ بگوترێ: مسوڵمانانی مشوورخۆر و جوڵاو، یان مسوڵمانانی تێکۆشەر و ئیشکەر ![2]

*******************************

٣٠٣.ئایا بۆچی ئەگەر خەڵکی عەلمانی و نا ئیسلامی مشووری وڵات و خەڵك بخۆن و هەوڵی پاکسازیی و چاکسازیی تێدا کردنی بدەن کارێکی ڕەوا و پەسەندە، بەڵام ئەگەر کەسانی ئیسلامی بیکەن دەبێ بۆ یان بەشتێکی خراپ دابنرێ و وەك تاوان یَك پێی تۆمەتبار (متهم) بکرێن؟! ئایا ئەمە جگە لە (بانێکەو دووهەوا)و بە دوو جۆرە پێوان ( الکیل بمکیالین) پێناسەیەکی دیکە هەڵدەگرێ ؟![3]

*******************************

٣٠٤.بەکارهێنانی وشەی (ئیسلامی سیاسی )بۆ پێناسەی تەوژمی ئیسلامیی و هەڵسوڕاوانی مەیدانی کارو چالاکی ئیسلامیی هەر نیاز و ئامانجێکی لە پشتەوە بێ، هەڵەو بێ جێیەو پێویستە، وەك هەر قسەو تەعبیرێکی دیکەی هەڵەو بێ جێ وازی لێ بهێنرێ ![4]

*******************************

٣٠٥.مەرج نیە هەر کەسێك خۆی بەمسوڵمان زانی هەموو سیفەتەکانی وەك ئیسلام دەڵێ وابن، وە مەرج نیە هەرکەسێکیش کافر بوو هەموو سیفەتەکانی کافرانە بن![5]

*******************************

٣٠٦.مسوڵمانەتی ئەوەیە تۆ لە هەموو شتێکدا ملکەچی خوا بی، لە ژیانی تاکی و خێزانی و لە ژیانی کۆمەڵایەتی و تێکڕای لایەنەکانی دیکەدا!

---

[1] سەرچاوەی پێشوو-لا-٤٢
[2] سەرچاوەی پێشوو-لا-٧٤
[3] سەرچاوەی پێشوو-لا-٧٨
[4] سەرچاوەی پێشوو-لا-٨٧
[5] سەرچاوەی پێشوو-لا-١٣٩

٣٠٧.ئەگەر هەر قسەمان لە خەڵك زیاتر بێ، ئەوە خەڵك ناکەوێتە ژێر کاریگەریمان و شایستەی ئەوەش نین کە لەسەر مینبەری پێغەمبەر (ﷺ) بوەستین![1]

*******************************

٣٠٨.کەسانێك کە هەڵدەستن بە پاکسازیی و بژارکردنی خەڵك و کۆمەڵگاکەیان و چاکسازیی تێدا کردن و ڕازاندنەوەی بەهەرچی چاکەیە، ئەوە دەچنە ڕیزی کۆمەڵی هەڵبژاردەی پێغەمبەری خواوە(ﷺ)![2]

*******************************

٣٠٩.هەر کەسێك بەمانای وشە زانی چۆن لەگەڵ خوای پەروەردگاریدا مامەڵە و هەڵس و کەوت دەکات دەشزانێ چۆن لەگەڵ بەندەکانی خواشدا ڕەفتار دەکات و هەرکەسێك لەگەڵ خوادا ڕاست بوو، لەگەڵ خەڵکی خوا شدا چاك دەبێت![3]

*******************************

٣١٠.ئێمە کاتێك دەتوانین خەڵك بۆ لای خوا(جلّ وعلا) بانگ بکەین و لێی نزیك بخەین، کە بۆ خۆمان لێی نزیك بین![4]

*******************************

٣١١.کاتێك خەڵك دەدوێنن و قسەیان بۆ دەکەن هەر بەئایەتی قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) قسەیان بۆ بکەن! پاشان بانگیان بکەن بۆ لای خوا(سبحانه وتعالى ) نەك بۆ لای حیزب و ڕێکخراو و شەخس چونکە شەخس و حیزب و ڕێکخراو هەمووی دەبێ لە خزمەت دینی خوادا بێ، ئێمەش ئەوەمان لە خەڵك دەوێ کە ببەسترێنەوە بە دین و شەریعەتی خواوە، جا ئەو کاتە لە خزمەت ئەو کەس و حیزب و ڕیکخراو کۆمەڵەش دا دەبن و کە لە خزمەت ئیسلام و دینی خوای پەروەردگار دان! بەڵام کە بە دینی خوا (عزّ وجل) نە بەسترانەوە، ئەو کاتە ئەگەر لە نێو حیزب و

---

[1] زنجیرەی بابەتە هەنوکەییەکان ئەڵقەی شەشەم چەند بنەمایەکی گرنگی وتاربێژی -چاپی یەکەم ساڵی ٢٠٠٦ز-لا-٧٧

[2] زنجیرەی بابەتە هەنوکەییەکان ئەڵقەی هەشتەم -خورەوشتی بەرز و پەسەند سەنگی مەحەکی مسوڵمانەتی یە -چاپی یەکەم-ساڵی ٢٠٠٧ ز-لا-٤٣

[3] سەرچاوەی پێشوو-لا-٧٦

[4] زنجیرەی بابەتە هەنوکەییەکان ئەڵقەی نۆیەم- بانگەواز بۆلای خودا چییەو چۆنەو بەکێ و بۆچی دەکرێ؟ -چاپی یەکەم ساڵی -٢٠٠٧ز-لا-٣٤

ڕێکخراوێکی ئیسلامیش دا بن هیچ سوودێکی نیەو بایی فلسێکە و نە بۆ قیامەتی خۆی سوود دەبینێ و نە سوودیشی بۆ تۆ و حیزب و ڕێکخراوەکەت هەیە ! هەڵبەتە بەپێچەوانەی حیزبە عەلمانی یەکانەوە کە دەیانەوێ خەڵك لە خزمەتی خۆیان و ڕێکخراوو مەرامەکانیان دابێ بەراستی دەبێ ئێمە هەوڵدەین خەڵك لە خزمەتی دینی خوا دابێ، جا ئەگەر بە کەڵکی دینی خوا هات بە کەڵکی تۆش و خۆیشی هاتوە ![1]

******************************

٣١٢.بێگومان دەبێ ئینسانی مسوڵمان بەگشتی بابای بانگەوازکار بەتایبەت خۆی لەلا بچووك بێ، ئنجا لەلای خوا گەورە دەبێ و لەلای خەڵکیش ڕێز و خۆشەویستی پەیدا دەبێ ![2]

******************************

٣١٣.کۆمەڵگاو کیان و قەوارەیەکی ئیسلامیی بەجیهاد بنیات نانرێ، بەڵکو بەجیهاد دەپارێزرێ ![3]

******************************

٣١٤.کیان و قەوارەی ئیسلامیی بە بانگەواز و پەروەردە و فێرکردن و تێگەیاندنی خەڵك بنیات دەنرێ، بەڵام دوایی بەجیهاد و جەنگ و هێز دەپارێزرێ و فراوان دەکرێ، وە بەهێز و پێز دەکرێ ![4]

******************************

٣١٥.هەندێك کەس پێیان وایە کە ئیسلامییەکان چەکیان هەڵگرت بۆ ئەوەیە خەڵکی بە زۆر پێ مسوڵمان بکەن، ئەگەرنا بیکوژن، کە ئەمە تۆمەتێکی ناڕەوایە و بۆمان هەڵدەبسترێ .. ئێمە جەنگی فیکر بە فیکر دەکەین![5]

******************************

---

[1] سەرچاوەی پێشوو-لا-٣٥

[2] سەرچاوەی پێشوو-لا-٣٦-٣٧

[3] جیهاد لەڕێی خوادا چی یەو؟! بۆچی دەکرێ و؟! چۆن دەکرێ و؟! چەندقسەیەکی دڵسۆزانە بۆ حوکمڕانەکانی کوردستان-چاپی یەکەم -ساڵی ٢٠٠٢ ز-لا-٢٥

[4] سەرچاوەی پێشوو-لا-٢٦

[5] ووتەی سەر بەرگی نامیلکەی -چۆن لە جیهاد بگەین-چاپی یەکەم -ساڵی -١٩٩٨ز

٣١٦.زۆر كه‌س هه‌یه تاڕاده‌یه‌ك به‌ده‌قه‌كانی قورئان و سوننه‌ت ئاشنایه، به‌لام كه‌دێته سه‌ر چۆنیه‌تی هێنانه خوار (تنزل)ی ئه‌و ده‌قانه بۆ سه‌ر دنیای واقیع و هه‌لس و كه‌وت كردن له‌گه‌ل موفره‌داتی ڕووداوه‌كاندا به‌چه‌سپاندنی یاسا شه‌رعی یه‌كان به‌سه‌ریاندا! ! ده‌بینی یه‌كجار كلۆل و ده‌سته پاچه‌یه و كورد گوته‌نی (وه‌ستای قسان و كۆله‌وای ده‌ستانه)![1]

*******************************

٣١٧.وابه‌سته‌یی و دابه‌سته‌یی له كارو جم و جۆلی ئیسلامی دا، ئه‌و كاره ده‌كاته شتێكی قرپۆك و بۆش و جه‌سته‌یه‌كی ده‌رداژۆ و نه‌خۆش، بۆیه ده‌توانین بلێین: پشت به‌خوا به‌ستن (التوكل علی الله) بۆ كاری ئیسلامی له جێگای هه‌وێنه بۆ شیر و هه‌روه‌ك چۆن شیر بێ هه‌وێن سه‌ره‌نجام هه‌لده‌بزركێ و ده‌بێ فڕێ بدرێ، كارو خه‌باتی ئیسلامیش ئه‌گه‌ر له‌سه‌ر ڕه‌گ و ڕیشه‌ی خۆی نه‌وه‌ستێ و پشت به په‌روه‌ردگاری خۆی نه‌به‌ستێ هیچی لێ هه‌لناوه‌رێ![2]

*******************************

٣١٨.هه‌تا خۆمان (قیاده‌و قاعیده) به‌و شێوه‌یه لێ نه‌كه‌ین كه‌شه‌رع لێی داوا كردووین و ده‌ستوور و یاساكانی شه‌رع به ته‌واوی مه‌عنا به‌سه‌ر خۆماندا نه‌چه‌سپێنین و حه‌قیقه‌ته‌كانی ئیمان و ئیسلام و ئیحسان هه‌زم نه‌كه‌ین و له‌گه‌ل قورئان و سوننه‌ت دا ته‌فاعول نه‌كه‌ین، با دلنیابین به‌ره‌و پێش چوون و گه‌شه‌كردنمان مه‌حاله و خه‌لك چاككردن و واقیع گۆڕینمان خه‌ون و خه‌یاله![3]

*******************************

٣١٩.ئیسلامی بوون به‌رله‌وه‌ی "ناو"بێ، نێوه‌ڕۆكه و له‌پێش دروشم و شیعاردا ڕه‌فتار و كرداره![4]

*******************************

٣٢٠.با[4](دین) و (تدین) تێكه‌ل نه‌كه‌ین و خودی ئیسلام و، چۆنیه‌تی تێگه‌یشتن و حالی بوونی ئه‌م و ئه‌و له ئیسلام له‌یه‌ك جودا بكه‌ینه‌وه، تاكو به به‌هانه‌ی ده‌مارگیری (تعصب) بۆ (دین) كه‌عه‌ینی

---

[1] بزوتنه‌وه‌ی ئیسلامی و ئاسۆیه‌كی گه‌ش و ڕوون-بنه‌ما شه‌رعی یه‌كان و بنچینه ئه‌خلاقی یه‌كان - چاپی یه‌كه‌م -سالی ١٩٩٧-ل-١٢

[2] سه‌رچاوه‌ی پێشوو-ل-٢٢

[3] سه‌رچاوه‌ی پێشوو-ل-٢٤-٢٥

[4] چه‌ند ڕێڕوونی یه‌ك بۆ ئیسلامی یه‌كانی كوردستان -چاپی یه‌كه‌م -سالی ١٩٩٧-ل-١٢

[5] ئه‌م دووپیته "با" خۆم بۆم زیاد كردوه، چونكه به‌م دوو پیته‌وه مانای ووته‌كه ته‌واو ده‌بێت -ئاماده‌كار

هه‌قه‌، تووشی ده‌مار گیری بۆ جۆرێك له‌ دینداری كردن و تێگه‌یشتن له‌ دینیش نه‌بین، كه‌ ده‌مارگیری یه‌كه‌میان ڕه‌سه‌نایه‌تی دینداریمان ده‌سه‌لمێنێ و دووه‌میشیان كه‌للە ئیشكی، چونكه‌ ده‌مارگیری بۆ (دین) سه‌خت گیریه‌ له‌ پابه‌ندی به‌هه‌قی موتله‌ق و بێ پێچ و په‌نای خوایی یه‌وه‌ كه‌جگه‌ له‌ (باطل) هیچی تری له‌ ئاقاردا نی یه‌ (فماذا بعد الحق إلا الضلال)، به‌لام ده‌مارگیری بۆ جۆرێك له‌جۆره‌كانی لێكدانه‌وه‌ و تێگه‌یشتن له‌ دین سه‌خت گیری یه‌ له‌پابه‌ندی به‌ڕه‌ئی و بۆ چوونێكی ئینسانانه‌وه‌ كه‌ڕه‌ئی و بۆ چوونی تری له‌به‌رامبه‌ر دا هه‌ن و پێكانی هه‌قیش له‌سه‌ر هیچ كه‌س تاپۆ نه‌كراوه‌ ![1]

******************************

٣٢١.ئینسانی مسولْمان و كۆمه‌لْی مسولْمان ده‌بێ هه‌م (فقیه) بن هه‌م (رشید)، یانی هه‌م شاره‌زابن هه‌م وه‌ستا، یان هه‌م زانابن هه‌م دانا، یان هه‌م تێگه‌یشتووبن هه‌م پێگه‌یشتو، یان هه‌م زانیاربن هه‌م ئه‌زموندار، یان هه‌م بزانن هه‌م بتوانن، یان هه‌م حالْی بوونیان هه‌بێ هه‌م حال![2]

******************************

٣٢٢.مسولْمانه‌تی بریتی‌یه‌ له‌مه‌ردی حه‌رب و میحراب بوون و پیاوی دوارۆژ و دنیابوون و ئه‌سپ تاودان له‌هه‌ردووك مه‌یدانی سیاسه‌ت و عیباده‌ت و ته‌قوا و غه‌زادا ،چونكه‌ پێغه‌مبه‌ر (ﷺ)هه‌م ئیمامی مسولْمانان بووه‌ هه‌م سه‌ركرده‌یان و هه‌روه‌ك چۆن له‌شه‌و نوێژاندا پاژنه‌پێ یه‌كانی قه‌لْشی وه‌و ریش و به‌رۆكی به‌فرمێسكیان ته‌ڕ بووه‌، له‌شه‌ڕو شه‌به‌ یخوونانیشدا ددانی شكاون و ڕوومه‌تی قه‌لْشیون و شه‌لالْی خوێن بووه‌ ![3]

******************************

٣٢٣.ناگونجێ مسولْمانان برایه‌تی یان قولْ و فراوان بێ كه‌چی له‌سه‌ر ڕێز و حورمه‌ت له‌ بیروبۆچوون و هه‌لْوێست و كاری یه‌كتر گرتن كێشه‌و مشتو مڕیان بێ! ئه‌گه‌ر نا ئه‌و كاته‌ برایه‌تی یه‌كه‌ یان په‌ندی (كۆسه‌ی ریش پان )ی به‌سه‌ردا ده‌چه‌سپێ![4]

******************************

---

[1] سه‌رچاوه‌ی پێشوو-ل-١٥
[2] سه‌رچاوه‌ی پێشوو-ل-١٧
[3] سه‌رچاوه‌ی پێشوو-ل-١٩
[4] سه‌رچاوه‌ی پێشوو-ل-٢٦

٣٢٤.هه‌تا عه‌قڵ و زه‌ینی ئینسان، ئیسلامی فراوانتر و هه‌مه‌لایه‌نه‌تر وه‌رگرتبێ و دڵیشی چاكتر ڕاستی یه‌كانی هه‌زم كردبێ و چێژتبێ و جه‌سته‌ش چالاكانه‌تر و گورج و گۆڵانه‌تر ئه‌ركه‌كانی جێ به‌جێ كردبێ، دیاره ئه‌و ئینسانه ئیمان و دینداری یه‌كه‌ی فراوانتر و قوڵتر و مه‌حكه‌م تر ده‌بێ و، هه‌ر ئه‌و ئیمان و مسوڵمانه‌تی‌یه قووڵ و فراوان و مه‌حكه‌مه‌ش ناچاری ده‌كات كه برایه‌تی یه‌كه‌ی به ئه‌ندازه‌ی تێگه‌یشتن و حاڵی بوونه‌كه‌ی فراوان و به‌قه‌ده‌ر هه‌زم كردن و چێژ وه‌رگرتنی دڵ و ده‌روونی قووڵ و به بارته‌قه‌ی كردو كۆش و تێكۆشانی مه‌حكه‌م و دامه‌زراوبێ، هه‌ر بۆیه‌ش ده‌بینین، ئه‌وانه‌ی زیاتر ئیسلامیان به‌بیرو هۆش و ده‌زگای عه‌قڵ وه‌رگرتوه ئاسۆی بیر كردنه‌وه‌یان كراوه‌ترو بازنه‌ی په‌یوه‌ندی برایه‌تی یان فراوانتره‌و، ئه‌وانه‌ش كه زیاتر وه‌ك هه‌ست و نه‌ستی عاتیفی و دوروونی و زیاتر به‌ده‌زگای دڵ و دینیان وه‌رگرتوه بازنه‌ی په‌یوه‌ندی برایه‌تی یان گچكه‌و ته‌سكه به‌ڵام به‌ناخ و قووڵایی دڵ دا چوته خوارێ ![1]

*******************************

٣٢٥.برایه‌تی ڕاسته‌قینه له‌گه‌ڵ یه‌كتر كردن، چاكترین سه‌نگی مه‌حه‌كی ئیمان و ته‌قوا ومسوڵمانه‌تیمانه و، باشترین پێوه‌ر (مقایس )ی تێگه‌یشتن و پێگه یشتنمانه‌و هه‌تا ئێمه‌ی مسوڵمان و ئیسلامی له‌م بواروه‌یدانه‌ش دا سه‌ركه‌وتن به‌ده‌ست نه‌هێنین و دینداری كردنی خۆمان نه‌سه‌لمێنین و له‌بواری برایه‌تی نێو خۆمان دا شتێك به‌شتێك نه‌كه‌ین، واباشه خه‌یاڵ پڵاوان نه‌كه‌ین و به‌ردی زل زل ده‌ست نه‌ده‌ینێ، چونكه (كه‌س به‌خه‌یاڵ پڵاو نه‌بووه به‌ماڵ )و به‌ردی گه‌وره‌ش نیشانه‌ی پێدا نه‌دانه) ![2]

*******************************

٣٢٦. دینداری و مسوڵمانه‌تیش بێجگه لـــــه‌شوێن كه‌وتنی قورئان و سوونه‌ت و پێوه پابه‌ند بوونیان و پیاده كردنیان چی دیكه‌یه؟ ![3]

---

[1] سه‌رچاوه‌ی پێشوو-لا-٢٨
[2] سه‌رچاوه‌ی پێشوو-لا-٥٩
[3] سه‌رچاوه‌ی پێشوو-لا-٧٢

******************************

٣٢٧.با ئەو ڕاستی یە بزانین کە ئیسلام لەمیانەی "٢٣" ساڵ دا بۆ پێغەمبەری خوا هاتوە و، ئێستاش بەهەڵچوونێکی کاتی و دڵگەرم بوون و بڕیارێکی خێراو سەر کیل نایەتەوە واقیعی ژیان![1]

******************************

٣٢٨.پێویستە زۆر چاك سەرنجی سیرە و ژیانی پێغەمبەری سەروەرمان (ﷺ) بدەین و توانا و بڕستی خۆمان و واقیعی کۆمەڵگاکەمان ودۆست و دوژمنە کانمان باش باش بناسین، تاکو بزانین چۆن و کەی و لەبەرچی چ جۆرە هەنگاوێك دەنێین![2]

******************************

٣٢٩.لەکاری ئیسلامی دا نابێ بڵێین یان هەموو یان هیچ! بەڵکو دەبێ بڵێین لە شتێك شتێك پەیدا دەبێت، بەڵام لە هیچ هیچ پەیدا نابێت![3]

******************************

٣٣٠.ئامانجی شەرعی نەگۆڕ(ثابت)ن، بەڵام شێوازی و کاری ئیسلامی هەمیشە بەپێی هەل و مەرجەکان بەپێی ژینگەو قۆناغەکان دەگۆڕێن![4]

******************************

٣٣١.خوا نەیفەرمووە(سبیلنا )بەڵکو فەرموویەتی (سُبُلَنَا) ♦ بەکو واتە ڕێیەکانی خۆمان، چونکە لەهەر قۆناغ و لەهەر کات و شوێنە دا بە ڕێیەکدا و بەشێوازێك خزمەتی دینی خوا دەکرێت، مەرج نیە تەنیا یەك ڕێ بێت، بەڵکو هەرجارە ڕێیەك و هەرجارە شێواز و چۆنیتی یەك، بۆیە ئێمە دەبێ عەقڵی خۆمان زۆر فراوان بکەین بۆ شێوازەکانی کاری ئیسلامیی، نەك تەنیا لەسەر وەسیلەیەك

---

[1] سەرچاوەی پێشوو-لا-١٠٧

[2] سەرچاوەی پێشوو-لا-١٠٧

[3] کارو پرۆژەیی ئیسلامیی مان -چاپی یەکەم -ساڵی ٢٠٠٥ ز -لا-٦٥

[4] سەرچاوەی پێشوو-لا-٦٦

♦ وَالَّذِينَ جَاهَدُوا فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُم سُبُلَنَاوَإِنَّ اللهَ لَمَعَ الْمُحْسِنِينَ)العنكبوت-٦٩

واتە وەئەوانەی لە ڕێی ئێمەدا خۆماندوو دەکەن و تێدەکۆشن ڕێەکانی خۆمانیان پیشان دەدەین وەبێگومان خوا لەگەڵ چاکە کاران دایە.

چاومان چڕ داگرین و پێمان وابێ کە چەکمان پێ نەما، تازە ئیشمان نەما، یان ئەگەر بارەگات لەفلانە شوێن نەما تازە ئیشت نەما!! کاری ئیسلامیی شێوازەکانی جۆراو جۆرن![1]

******************************

٣٣٢.کوردەواری خۆمان دەڵێن (ئیشکەرت بمرێ مشور خۆرت نەمرێ) خەڵك زۆر یان دەتوانن ئیش بکەن، بەڵام کەمیان دەتوانن مشوور بخۆن، ئێمە ئیشمان هەر بەوەندە پێك نایەت خەڵك مسوڵمان بێ و ئیسلامی بوێت، بەڵکو دەبێ کەسانێك پێ بگەیەنین کە بتوانن لەئاستی ئیسلامدا مشوور بخۆن ئیدارەی وڵات بکەن و دوایی ئیسلام پێیانەوە ناشیرین نەبێ و مسوڵمانان لەسەریان قەرزدار نەبنەوە نەبنە پەڵەیەکی ڕەش بەسەر ئیسلامەوە![2]

******************************

٣٣٣.مرۆ دەبێ، لەپێشدا، لەئیسلامی ڕەسەن تێبگا، ئنجا کەڵك لە ئیسلامی هاوچەرخ وەردەگرێ![3]◆

---

[1] سەرچاوەی پێشوو-ل-٦٦

[2] سەرچاوەی پێشوو-ل-٨٧

[3] سنورە قەدەغەکان مەشکێنن-چاپی دووەم -ساڵی ٢٠٠٤ ز-٥٨

◆ ئەم ووتەیە ماموٚستا عەلی باپیر گوتەنی قووڵە نەزیلەیەکی لەگەڵدایە بۆ زیاتر ڕوون بوونەوەی وتەکە بە پەسەندم زانی نقڵی بکەم، کەبەم شێوەیە دەست پێدەکات:

*لە سولەیمانیی لەپۆلیی سێ و چواری نێوەندی بووم زۆر هاتوچۆی کتێبخانەکانم دەکردو پەڕتوکم دەکڕی. ڕۆژێ چوومە پەڕتوکخانەیەك مەلایەکم بینی تەرپووشی لەسەر دابووماموٚستا محمد تەرپوشی لەسەردەنا، ماموٚستایەکی زیت و وریابوو. نەمزانی ئەوە کێیە؟ زۆرم پێ خۆش بوو ماموٚستای زیرەك و لەو جۆرانە ببینم هەرچەندە من تازە پێدەگەیشتم، بەڵام دڵم پێیان خۆش دەبوو، کاتێ، مەلایەك بەشێوەیەکی هاوچەرخ و لەئاستی خەڵکی ڕۆژدا باسی ئیسلامی دەکرد. من بەدوای لێکدانەوەیەکی (قورئان)دا دەگەڕام لام وابێ (ڕوح ئەالمەعانی )بوو ماموٚستا مەلا محمد منی نەدەناسی، دیارە منیش ئەوم نەدەناسی ، یەکەمین جار بوو، بیبینم .گوتی هیچ پەرتووکی هاوچەرخت بۆ هاتووە؟ بەمنیشی گوت: کاکە !پەڕتوکی هاوچەرخ بخوێنەوە منیش قسەیەکم کردو گوتم ماموٚستا! من بەخزمەت بەڕێزت نەگەیشتووم، بەڵام، مرۆ دەبێ، لە پێشدا، لە ئیسلامی ڕەسەن تێبگا، ئنجا، کەڵك لەئیسلامی هاوچەرخ وەردەگرێ.

ئەویش تەماشایەکی کردم و گوتی: ئەم قسەیە بەقەدەر تۆ نییە! ئەم قسەیە قسەیەکی گەورەیە، گوتی تۆ کێی؟

گوتم وەڵڵا من، قوتابیم لە پەیمانگای ئیسلامیی دەخوێنم ئەدی بەڕێزت کێی؟

گوتی: من مەلا(محمحد مەلا سالح )م

٣٣٤.بنچینه‌ی كاری ئیسلامی، له‌گه‌ڵ خه‌ڵكه، بۆ خه‌ڵكه و هه‌ر له‌نێو خه‌ڵكیش دایه ![1]

******************************

٣٣٥.زاراوه‌ی(ئیسلامی ڕامیاریی) نه‌یارانی ڕه‌وت و ته‌وژمی ئیسلامیی، به‌سه‌ر ئیسلامییه‌كاندا دایان بڕیوه، ئێمه ده‌بێ بڵێین ڕامیاریی ئیسلامیی، ئیسلامی جووڵاو نه‌جوڵاومان هه‌یه ئیسلامێ خه‌باتده‌كاو ئیسلامێ خه‌بات ناكا، ئیسلامی هه‌ڵساوو ئیسلامی دانیشتوومان هه‌یه ئیسلامی هه‌ڵخزاو و ئیسلامی ڕاپه‌ڕیومان هه‌یه، به‌ڵام ئیسلامی ڕامیاری و ئیسلامی ناڕامیاری مان نییه،چونكه یه‌ك ئیسلام هه‌یه، به‌ڵام ڕامیاری ئیسلامیی و ڕامیاری نا ئیسلامییمان هه‌یه ![2]

******************************

٣٣٦.لایه‌نێكی ئیسلامیی، پێی وابێ له‌به‌ر ئه‌وه‌ی له ڕێكخراوێكی ئیسلامیی دایه له‌خه‌ڵكێكی دیكه چاكتره، ئا ئه‌و خۆپێ چاكبوونه‌ی، به‌ڵگه‌یه له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی كه خراپه ![3]

******************************

٣٣٧.هه‌روه‌ك چۆن ده‌وڵه‌تێكی ئیسلامی ته‌واو عیاریشمان نی یه ده‌وڵه‌تێكی دیموكراسی ته‌واو عیاریشمان نییه ![4]

******************************

٣٣٨.پێكه‌وه مه‌داركردن و ساچاندن (المُداراة)ی كۆمه‌ڵی ئیسلامیی له‌گه‌ڵ ده‌وروبه‌ری دا به‌بێ نه‌رم كێشان (المداهنة) و واز له (مبادیء) و سیاسه‌ت و ستراتیژی خۆهێنان، كه بێگومان بۆ هه‌ر كاروجم و جولێكی سیاسی یانه پێویسته، له‌گه‌ڵ لێ دابه‌زین (تنازل)ی بنه‌ما شه‌رعی كان تێكه‌ڵ

---

گوتم: تۆ (مامۆستا شاره‌زووریی )ت

گوتی: به‌ڵێ .

ئیدی گوتم: كاكه! من زۆر به‌ئاواته‌وه‌بووم به‌خزمه‌ت به‌ڕێزت بگه‌م تۆ خاوه‌نی فلان په‌رتووك و په‌رتووكه‌ی

گوتی: به‌ڵێ

ئیدی له‌و كاته‌وه یه‌كدی مان ناسی .

[1] سه‌رچاوه‌ی پێشوو-لا-٦٨

[2] سه‌رچاوه‌ی پێشوو-لا-٨٩

[3] سه‌رچاوه‌ی پێشوو-لا-٩٠

[4] كۆمه‌ڵی ئیسلامیی- ئامانج و هه‌ڵوێسته‌كانی و چه‌ند پرسیارو وه‌ڵامێكی گرنگ له‌باره‌ی ئیسلام و ئیسلامییه كانه‌وه -چاپی یه‌كه‌م -ساڵی -٢٠٠٢ز-لا-٦١

نه‌كه‌ین، چونكه (تنازل) و (مداهنه) هه‌میشه حه‌رامن، به‌لام مه‌داركردن (مداراة) دروست (جائز) و بگره جاری وایه فه‌رزیش ده‌بێت مادام ئامانج و مه‌به‌ستێكی شه‌رعی په‌كی له‌سه‌ر بكه‌وێ![1]

*******************************

٣٣٩.حوكم و كیانی ئیسلامی به‌رله‌وه‌ی هێزێكی ترسێنه‌ر بێت په‌ناو سێبه‌ره، به‌ر له‌وه‌ی پێویستی یه‌كان له‌سه‌ر خه‌ڵك فه‌رز بكات پێداویستی یه‌كان دابین ده‌كات و، له‌پێش ئه‌وه‌دا كه‌موحاسه‌به‌یان بكات و سزایان بدات، هه‌ق و مافه‌كانیان پێده‌دات، تاكو له ناچاری و تێگیراوی لادان و خراپه كاری ڕزگاریان بكات و، وایان لێ بكات كه‌به‌لگه یان بیانووی سه‌رپێچی و سه‌ره‌ڕۆییان به‌ده‌سته‌وه نه‌مێنێ ![2]

*******************************

٣٤٠.دینداری و مسوڵمانه‌تی قه‌ناعه‌ته‌و په‌یوه‌ندی به‌دڵ و عه‌قڵه‌وه هه‌یه، كه‌سێك دینی نه‌چووبێته‌وه دڵ و عه‌قڵه‌وه ئه‌گه‌ر هه‌زار نوێژ و ڕۆژوو بكات خوا لێ ی وه‌رناگرێت و ته‌نانه‌ت مسوڵمانیش ئه‌گه‌ر به‌قه‌لب و قه‌ناعه‌تی خۆی نوێژ نه‌كات و عیباده‌ت نه‌كات، ئه‌وا به‌ریاو نیفاق بۆی له‌قه‌ڵه‌م ده‌درێ![3]

*******************************

٣٤١.ئای چه‌ند سه‌یرو سه‌مه‌ره‌یه (كار) بۆ خوا بكه‌ی، كه‌چی بۆ كرێ و پاداشته‌كه‌ی چاوه‌ڕوانی خه‌ڵك بی![4]

*******************************

٣٤٢.ئه‌وانه‌ی كه له‌كاتی مامه‌ڵه‌و هه‌ڵس و كه‌وتی ئاسایی له‌گه‌ڵ خه‌ڵك دا به‌شێوازی كاتی جه‌نگ و كوشتار ده‌جوڵێنه‌وه و ڕه‌فتار ده‌كه‌ن، سه‌ره‌ڕای ناشه‌رعی بوونی ڕه‌فتاره‌كه‌یان و به‌دبین كردنی خه‌ڵك و سه‌ر لێشێواندنیان سه‌باره‌ت به ئیسلام، وه‌ك كه‌سێكیش دێنه به‌رچاو كه له‌كاتی تازیه و سه‌ره‌خۆشی دا قاقا پێ ده‌كه‌نێ و له‌ده‌می شایی و زه‌ماوه‌ندیش دا پرمه‌ی گریان ده‌دات! دیاره

---

[1] بنه‌ما شه‌رعی یه‌كان و هێڵه گشتی یه‌كانی كۆمه‌ڵێكی ئیسلامی ڕه‌سه‌ن-چاپی یه‌كه‌م -ساڵی ٢٠٠١ز-لا-٨-٩

[2] جیهاد له‌ڕێ ی خوادا و چه‌ند سه‌رنج و ئاگادارییه‌ك-چاپی دووه‌م -ساڵی -١٩٩٨ز-١٢

[3] سه‌رچاوه‌ی پێشوو-لا-٢٨

[4] سه‌رچاوه‌ی پێشوو-لا-٥٠

دەبێتە جێگای گلەیی و گازندەو سەر زەنشتی خەڵکی و بگرە شیاوی نوکتە لەسەر هێنانەوەی گاڵتە و گەمەشیان ![1]*

*******************************

٣٤٣.لەحاڵەتی سروشتی و ئاسایی و لەکاتی جم و جوڵە کۆمەڵایەتیەکان دا بابای مسوڵمان چ موجاهید بێ چ غەیری موجاهید، پێویستە خۆشویستراوو رێز لێ گیراو بێ نەك سام لێ کراوو ترس و بیم لێ کراو![2]

*******************************

٣٤٤.ئەگەر بێت و مسوڵمانان پێش گوزەراندنی قۆناغی تاقیکردنەوە و ساغبوونەوە و پاکبوونەوە و قاڵبوونەوە بچنە قۆناغی دەستەڵات (مرحلە التمکن) و حوکمڕانی یەوە ئەوە بێگومان لەسۆنگەی کەم و کووڕیی و کرچ و کاڵیی یەکانەوە دەبنە نمونەیەکی ناتەواو و سادە و سەرکێڵ و ناشیرینکەر بۆ سیمای گەش و جوان و ڕاستەقینەی ئیسلام و شەریعەت و سیستەمە بێ وێنەکەی![3]*

*******************************

٣٤٥.کەسانێك کە بەڕاستی بەتەمای ئەوە بن کە لە کۆمەڵگاکەیان دا شەریعەتی خوا بەرپا بێت، پێویستە لە سازکردنی زەمینەو دابینکردنی پێداویستی یەکانی یەوە دەست بەکاربن، نەك تەنها

---

[1] سەرچاوەی پێشوو-لا-٥٦

* هەڵبەتە بەپێچەوانەشەوە: ئەگەر لەکاتی شەڕ و جەنگ دا بەشێوازی کاتی ئاشتی و ئاسایی لەگەڵ دوژمن و ناحەزانی دا ڕەفتار بکات، دیسان دەبێتە جێگای پێ کەنین و گاڵتە جاڕو مەسخەرەی دۆست و دوژمن!

[2] سەرچاوەی پێشوو-لا-٦٢

[3] تاقی کردنەوەی خوا بۆ (جلَّ جلاله) بۆ بەندەکانی چی یەو چۆنە؟!-چاپی یەکەم- ســــــاڵی ٢٠٠٣ ز لا-١٢-١٣

* بەڵێ پێویستە مسوڵمانان بەرلەوەی ئەرکی قورسی حوکم و سیستەمی ئیسلامی یان بکەوێتە سەرشان پێشتر چاك چاك تەزکیەو پەروەردەبووبن و لەگەڵ ئیسلام دا تەفاعولیان کردبێ و بەها بەرز و بێ وێنەکانی شەریعەتی خوای کاربەجێ یان لەخۆیاندا بەرجەستە کردبێ و چووبنە ئاستی بەرزی ئیسلامەوە ، ئەگەرنا بەتەئکید ئەگەر بەبێ پەروەردەبوون و خۆ ئامادەکردن کت و پڕ بەسەر هەڵگرتنی ئەرکی قورسی بەڕێوەبردنی حوکم و سیستەمی ئیسلامی و پیادە کردنی شەریعەت بکەون ،مەحاڵە کەلەجێ بەجێ کردنی ئەو ئەرکەیان دا سەرکەوتووبن ،وەك چۆن بابای وەرزشکار ناتوانێ هەر لەسەرەتاوە و یەکتەکان ئەو کێشە قورس یە بەرز بکاتەوە کە بابایەکی دیکەی مەشق دیتوو و ڕاهاتوو دەیتوانێ !

وه‌ك دروشم و شیعارێك باسی ئه‌و مه‌سه‌له‌یه بكه‌ن و جێ به‌جێ كردنی شه‌ریعه‌ت(تطبيق الشريعة) بكه‌نه ویردی سه‌ر زمانیان![1]

*******************************

٣٤٦.با شه‌ریعه‌ت جێبه‌جێ بكه‌ین! به‌بێ كاركردنی جیددی و هه‌نگاونانی كرده‌یی پله پله و قۆناغ به قۆناغ، هیچی لێ سه‌وز نابێت و سه‌ری به هیچ ئه‌نجامێك ناگات، پێشینانیش جوانیان گووتوه (به‌حه‌ڵوا حه‌ڵوا ده‌م شیرین نابێ)! هه‌روه‌ها قسه‌یه‌كی به‌جێ یان كردوه كه گوتوویانه (نه هه‌موو خوڕه‌یه‌ك ئاوه و نه‌هه‌موو چنراوێك جاوه)![2]

*******************************

٣٤٧.نابێ هه‌موو بابایه‌كی به‌ڵادار (مُبتلى)و گرفتار و ڕه‌نج و مه‌ینه‌تی دیتوو پێی وابێ هه‌ر له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ناوی (مسوڵمان)ی له‌سه‌ره، له‌سه‌ر ناڕه‌حه‌تی و ڕه‌نج و ده‌رده‌سه‌رییه‌كانی پاداشتی لای خوا هه‌یه، به‌ڵكو به‌بێ ڕێباز و ئایینی خوا گرتن كابرا ئه‌گه‌ر به‌شمشێر هه‌وران دابێنێ له‌لای خوای دادگه‌ر كاره‌كه‌ی فلسێك ناهێنێ و سه‌پانی پووشێیه![3]

*******************************

٣٤٨.حه‌رام بۆ كه‌س حه‌ڵاڵ مه‌كه‌ن بۆ ئه‌وه‌ی دینداریيان بۆ ئاسان بكه‌ن، به‌ڵام دیسان مه‌شجن هه‌چی حه‌ڵاڵ و حه‌رام هه‌یه و هه‌رچی فه‌ڕز و سوننه‌ت و قه‌ده‌غه‌و ناپه‌سه‌ند (مكروه) هه‌یه، به‌یه‌ك لیست بۆ یان ڕیزمه‌كه‌ن، تالێی ڕابكه‌ن![4]◆

*******************************

٣٤٩.دین بۆ خه‌ڵك ئاسان بكه‌ن، به‌ڵام نه‌ك به‌و شێوه‌یه‌ی كه حه‌رامیان بۆ حه‌ڵاڵ بكه‌ن![5]

*******************************

---

[1] سه‌رچاوه‌ی پێشوو–لا–١٤

[2] سه‌رچاوه‌ی پێشوو–لا–١٥

[3] سه‌رچاوه‌ی پێشوو–لا–٢١

[4] ئافره‌تی مسوڵمانی كورد مافه شه‌رعییه‌كانی و ئه‌ركه گرنگه‌كانی –چاپی یه‌كه‌م –ساڵی ٢٠٠٣ ز–لا–٣٨

◆ پێغه‌مبه‌ریش ده‌فه‌رموێ (ص) (يسروا ولاتعسروا )متفق عليه )واته ئاسان كه‌رین و زه‌حمه‌ت خه‌ر مه‌بن .

[5] سه‌رچاوه‌ی پێشوو–٣٨

٣٥٠. ئیش کردن و خۆمادووکردن بەبێ بەرنامە و ڕێبازێکی ڕاست و ڕوون، وەك ئەوایە بابایەکی ڕێبوار (مسافر) بەپێچەوانەی (لاجهة)ی جێی ئامانج و مەبەستی یەوە هەنگاو بنێ کە دیارە هەتا زیاتر شەقاوان هەڵێنێ و خێراتر بڕوات زیاتر و خێراتر لەمەنزڵ و ئامانج و مەبەستی وە دوور دەکەوێ، ئەگەر گریمان – کەئیحتیمالێکی زۆر دوورە – لە هیچ چاڵ و کەندەڵانیش نەکەوێ![1]

*******************************

٣٥١.خـــــۆ گۆڕین بنچـــــینەی گـــــۆڕینی واقیعـــــــە ![2]

*******************************

٣٥٢.پێش دەست پێ کردن توانای خۆمان بناسین و بە ئەندازەی ئەو توانایەی کە لە خۆمان دا شکی دەبەین دەست پێ بکەین نەك دیواری کارەکەمان لەسەر بنچینەی گوماناوی و گفت و بەڵێنی خەڵکی بنیات بنێین، پێشینانیش گووتویانە (تێگوشینی بەتەمای جیرانان ئیشکە) و (پشتیش بەدەستی خۆت نەیخورێنی خرووی ناشکێ) ![3]

*******************************

٣٥٣.کەسێك کە کاری ئیسلامیی دەکات، لەنێو موعانات و ئێش و ژاندایە، بەبێ بەهێزکردنی لایەنی ڕوحی و مەعنەوی لە خۆیدا ناتوانێ باری کاری ئیسلامیی بخاتە سەرشانی خۆی![4]

*******************************

٣٥٤.هەرکاتێك ئینسانییەت گیرۆدەی خراپەو خوارو خێچی بوو و لەڕاستە شەقامی خواو فیطرەتی ساغی خۆی هەتڵەو لاڕێ بوو مانای وایە ئوممەتی دواپین پێغەمبەر (ﷺ) کەئەرکی مامۆستایەتی و ڕێ پیشاندەرێتی پێ سپێردراوە لەئەرك و کاری خۆی دا کەمتەر خەمی کردوە ![5]

*******************************

---

[1] زنجیرەی باچاکتر ئیسلام بناسین ئەڵقەی یەکەم – خودا جَلَّ جَلالُهُ –چاپی دووەم –ساڵی ١٩٩٠ز–لا–٤

[2] سەرچاوەی پێشوو–لا–١٣

[3] چارەسەری کێشەی کورد لە نێوان ئیمان و پەرلەمان دا –چاپی یەکەم –ساڵی ١٩٩٢ ز –لا–١٦

[4] نەشکەنجەو زیندان –پێشمەرگەیەك بیست و دوومانگ لەزیندانی داگیرکەردا–چاپی یەکەم –ساڵی ٢٠٠٦ ز–لا–٣٠٩

[5] گۆڤاری پەیڕەو ژمارە (٢) بابەتی" کەی ئوممەتی ئیسلامی شیاوی مامۆستایەتی و مرۆڤایەتی و میراتگرێتی زەوی دەبێ "؟!ساڵی ١٩٩٥ز–لا–٤

٣٥٥. شوان خەوتووە بۆیە گورگ زەفەری بە(ڕان) بردوە و باغەوان كەمتەرخەمە بۆیە (باغ) ڕەنگ زەردو پەژموودەیە و گەڵاڕێزان و كرمۆڵ بوونی تیَ كەوتوە![٦]

٣٥٦. كاتێك ئوممەتی ئیسلام دەتوانێ ڕابەرو چاوساغی مرۆڤایەتی بیَ و نەیەڵیَ بەرەو هەڵدێر بڕۆن كە باڵادەست و میراتگری زەوی بن![١]

*******************************

٣٥٧.كاتێك ئوممەتی ئیسلام مەرجی میرتگرێتی و پاشان مامۆستایەتی یان تێدا دێتە دی كە هەم عەقیدەیان هەم خواپەرستی یان هەم خووو ڕەوشتیان هەم ئیدارەیان هەم سیاسەتیان هەم جیهاد و خەباتیان ... هتد چاك (صالح) بیَ و وەك شەریعەت فەموویەتی ئاوابیَ ![٢]

*******************************

٣٥٨.كۆمەڵ و كۆمەڵگای مسوڵمان لە سۆنگەی ئەوەوە كەتاك تاكی ئەندامەكانیان لە سەر یەك بناغەی عەقیدەیی و لە نێو یەك قاڵب و بۆ تەی خواپەرستی و لە بازنەو جوغزی یەك ڕەوشت و ڕەفتاردا، كە عەقیدەی ئیسلامیی و خواپەرسیی ئیسلامیانەو ڕەوشت و ڕەفتاری مسوڵمانانەیە كەسایەتی یان بنیات نراوە و پەروەردە كراوە، كۆمەڵ و كۆمەڵگایەكی پێكەوە گونجاو و جۆشدراوو یەك هەست و نەست و هەڵوێست و لەگەڵ یەك پەیوەستن، وەك چۆن ئەو خشتانەی دیواری خانوویەكیان لیَ پێك دیَ لە سۆنگەی ئەوەوە كە بەیەك شێوە و لەیەك كەرەسە دروست كراون و لە قاڵب و بۆ تەیەك دا داڕێژراون زۆر باش پێكەوە ڕیز دەبن و لەگەڵ یەك پەیوەست دەبن![٣]◆

*******************************



[٦] سەرچاوەی پێشوو-لا-٥

[١] سەرچاوەی پێشوو-لا-٥

[٢] سەرچاوەی پێشوو-لا-٥

[٣] مسوڵمانی كامڵ-بەشی دووەم-بەرگی یەكەم-چاپی یەكەم-ساڵی ٢٠٠٠ ز-لا-٩٩

◆ دیارە پێغەمبەری داناو پێشەواشمان (ﷺ) بەخۆڕایی نیە كە كۆمەڵ و كۆمەڵگای بڕواداری بەخشتە پێكەوە جۆشدراوو تێك ترینجاوەكانی دیواری چواندووە:(المُؤمنُ للمؤمْن كالبُنیان یَشُدُّ بَعْضُه بَعْضاً)متفق علیه واتە: بڕوادار بۆ بڕوادار وەك خانوو وایە هەندێكی هەندێكی مەحكەم دەكات.

٣٥٩.مسوڵمان پێویستە نەرم و نیان و تەباو گونجاو بێ، نەك شرو درو ڕەق و تەق و بێ سەلیقەو نەگونجاو !(٤)

******************************

٣٦٠.مسوڵمانەتی ناوی بێ نێوەڕۆك و عیبادەتی بێ سیاسەت نیە !(١)

******************************

٣٦١.مادام من کار بۆ ئیسلام و بۆ کۆمەڵی ئیسلامی دەکەم و خەمی خەڵکی دەخۆم، ئەگەر بۆ خۆشم کەمتەر خەمی بکەم مەسەلەیەك نیە ! نەخێر، تا بە کەڵکی خۆت نەیەی بە کەڵکی خەڵك نایەیت، تا بۆ خۆت ئەهلی طاعەت و عیبادەت و تەقواو پارێز نەبی، بۆ خەڵکی دیکە کارەکەت بەرەکەتی نابێ و بەرهەمی نابێ!(٢)

******************************

٣٦٢.ئەوە ئازایەتی و هونەر نیە کە بابایەکی گۆشەگیر و دوورەپەرێز و داماو و فەقیر هەمیشە خوای لە یادبێت و لەبیری نەچێ! بەڵکو هونەر و ئازایەتی ئەوەیە کە سەرگەرمی بازارگانی و مامەڵە یان سیاسەت و مشوور خواردنی کارو باری خەڵك و وڵات بی و لە خوا بێ ئاگا نەبی و لەڕێبازی شەرع لانەدەی!(٣)

******************************

٣٦٣.ئەگەر کەسێك ئیشی خۆی پێ لەهی کەسانی تر باشتر بێت با بەکردارو بەرهەم پیشانی بدات نەك بەگوفتار!(٤)

******************************

٣٦٤.دەبێت ئێمە بڵێین ئێمە لەمسوڵمانانین ولاف و ئیدیعای ئیمتیازو زیادی لێ نەدەین!(٥)

---

(٤) سەرچاوەی پێشوو-١٥٩

(١) کوردو پێناسی حیزبی بەعس -لا-٥٢

(٢) مزگەوتەکانی کوردستان لەنێوان ئاوەدانکردنەوەو وێرانکردندا-چاپی یەکەم -ساڵی١٩٩٩ ز-لا -٢٧

(٣) مزگەوتەکانی کوردستان لەنێوان ئاوەدانکردنەوەو وێرانکردندا-چاپی یەکەم -ساڵی١٩٩٩ ز-لا-٢٣

(٤) هەڵس و کەوت لەگەڵ خەڵکی دا و چەند ئامۆژگاری یەك بۆ ئەندام و موجاهیدانی کۆمەڵی ئیسلامی - چاپی یەکەم -ساڵی ٢٠٠١ ز -لا-٢٥

(٥) سەرچاوەی پێشوو لا-٢٥

******************************

٣٦٥.هەندێك كەس وادەزانێ كە ئێستا ئێمەی ئیسلامی بەئەركی سەرشانی خۆمان دەزانین هەركەسێك ئەو ناشەرعی و خەتاو خراپانەی كرد(حدود) و (قصاص)ی لەسەر جێ بەجێ بكەین و سزای بدەین، نەخێر ئەوە وانیە، نەك هەر بەئەركی خۆمانی نازانین بەڵكو بەهەقی خۆشمانی نازانین و جائیزیش نیە، زانایان دەڵێن (عقوبات) سوڵتەی شەرعی واتە حكومەت و دەوڵەتی ئیسلامی بەسەر خەڵكی دا جێبەجێ یان دەكات![1]

******************************

٣٦٦.موسوڵمان نابێ بابایەكی سەلبیی بێ، بەڵكو دەبێ هەمیشە ئیجابی بێ![2]

******************************

٣٦٧.ئیخلاص و خوا پێ مەبەست بوون ڕووح و كاكڵی هەموو كردەوەو چالاكیەكەو هەوێنی مەیینی هەموو شیرێكەوە بەبێ وی هەموو گەنج و ڕەنجت بایی پولێكە![3]

******************************

٣٦٨.لە ڕوانگەی ئیسلامەوە وشەی پێشمەرگە بە تەنها یەك مانای ڕاست هەڵدەگرێت: ئەویش ئەوەیە كە پێشمەرگەی ئیسلام كەسێكە كە مەرگی خۆی پێش مەرگی ئیسلام دەخات یان گیانی خۆی پێشكەشی ئیسلام دەكات![4]

******************************

٣٦٩. بەهیوای ئەوەی لە ئەنجامی چاك تێگەیشتنی ئایین و بەرنامەی خوا دا تۆفیقی ئەوەمان هەبێ كە هەر شتە وەك خۆی تەماشای بكەین و هەموو شتێك لە شوێنی شیاوی خۆی دابنێین و، هێندە ئەمییەت و گرنگی یە بە عەقڵ و دڵمان بدەین كە شایستەینی و هەرهێندەش خەم لە ڕیش و سمێڵمان بخۆین كە لێیان دەوەشێتەوە و لەسەر حیسابی عەقڵ و دڵ و عەقیدە و ئیمان و تێگەیشتن و عیبادەت و جیهادمان بەڕیش و سمێڵ و قیافە و سیمامانەوە سەرگەرم نەبین و،

---

[1] ئیسلام و كێشە هەنووكەییەكان-چاپی یەكەم-ساڵی ١٩٩٨ ز-لا -٤٣

[2] زنجیرەی بابەتە هەنووكەییەكان ئەڵقەی دەیەم قوتابیان لەم هەلومەرجەدا پێویستە چۆن بن و چی بكەن؟!-چاپی یەكەم -ساڵی٢٠٠٨ ز -لا -٤٢

[3] سەرچاوەی پێشوو-لا-٢٠

[4] سەرچاوەی پێشوو-لا-١١

هێنده‌ش عه‌قڵ گه‌وره‌ و سینگ فراوان و لێزان بین كه‌ هه‌ر كاتێك كار و جیهادی ئیسلامیی مان په‌كی له‌سه‌ ئه‌وه‌ كه‌وت ریشی بۆ لابه‌رین و هه‌ڵی پاچین یان ته‌نانه‌ت بیتاشین، بێ سێ و دوو دڵ له‌ دڵ دان لای به‌رین و، پێمان وانه‌بێ كه‌ مسوڵمانه‌تی یه‌كه‌مان نوقصانی هێناوه‌ و كه‌لێنی تێ بووه‌![٥]

٣٧٠.هه‌روه‌ك چۆن شاره‌زای ده‌رباره‌ی ئایین گرنگ و پێویسته‌ ، ناسین و شاره‌زایی ده‌رباره‌ی واقیعی ژینیش به‌هه‌مان شێوه‌، به‌ڵێ هه‌م (الفقهُ في الدِّين) و هه‌م (فقهُ الواقع) هه‌ردوكیان پێویستن![١]

******************************

٣٧١.پیاو بۆ ئیش په‌یدا بكرێ نه‌ك ئیش بۆ پیاو، واته‌ ئیشێكی واقیعی و راسته‌ قینه‌مان هه‌بێت و ئنجا بۆی به‌دوای كه‌سێكی گونجاودا بگه‌ڕێین، نه‌ك پیاوێكی بێ ئیش و كارمان مه‌حته‌ل بێ و بۆسه‌ر گه‌رمكردن و دڵ ڕاگرتنی ئیشێكی یان هه‌رناوی ئیشێكی بۆ بدۆزینه‌وه‌ كه‌ پێیه‌وه‌ بخافڵێ![٢]

******************************

٣٧٢.پشت به‌ستن به‌كه‌می پوخت و ساغ نه‌ك زۆری بۆرو بێ ده‌ماغ![٣]

******************************

٣٧٣.له‌به‌ر ئه‌وه‌ی هه‌زار دۆست كه‌مه‌و دوژمنێك زۆره‌، به‌ قسه‌و ره‌فتاری نه‌رم و شیرینی شه‌رعی خه‌ڵكی بكه‌ینه‌ دۆست، نه‌ك به‌وشه‌ی بریندار كه‌رو زه‌ق و ره‌ق خه‌ڵكی بره‌نجێنین و دۆستان نیشمان بتۆرێنین![٤]

******************************

---

[٥] پیشمه‌رگه‌ی ئیسلام یان مسوڵمانی موجاهید كێ یه‌و چۆنه‌؟-چاپی سێ یه‌م ساڵی ١٩٩٨ ز-لا-٦١

[١] بزوتنه‌وه‌ ئیسلامیی و قۆناغی نوێ ی -چاپی یه‌كه‌م ساڵی ١٩٩٤ ز-لا-٦

[٢] سه‌رچاوه‌ ی پێشوو -لا-٢٣

[٣] سه‌رچاوه‌ی پێشوو-لا-٢٣

[٤] سه‌رچاوه‌ی پێشوو -لا-٢٤

٣٧٤.لەسەر بنچینەی قسەو گفت و بەڵێنی عاتیفی و سەر زارەکی پشت بە خەڵك نەبەستن ، چونکە ئی وا هەیە حە جیشمان لەگەڵ دەکات و پاشانیش نەك هەر بنکەو بارەگا ماڵەکانیشمان تالان دەکات![5]

*******************************

٣٧٥.سافیلکەیی و خۆش باوەر نەبوون سەبارەت بەدوژمن و باوەڕ نەکردن بە سینگ هێنانە پێشوو کلکە سووتەو ماستاو کردنی، چونکە دوژمنی بێ بڕواو لاڕێ وەك مشك وایە نانیش دەخوات و "ناندێن"یش دەدڕێ![1]

*******************************

٣٧٦.تەنیا کاتێك یەکگرتن و یەکریزی ڕاستەقینەی ئیسلامیی دروست دەبێت، کە بەر لەوەی لاشەکان پێکەوە کۆببنەوە ڕیز بن، دڵ و دەروون و بیرو بۆ چوونەکان لەسەر بنچینەی یەکتر خۆشویستنی برایانەو باوەڕ و متمانە پێك بوونی مسوڵمانانە، پێکەوە گرێ بدرێن و، بچنە سەر یەك خەت و ڕێبازی ڕوون و ئاشکرا![2]

*******************************

٣٧٧.ئێمە دەڵێین ئیسلام هەڵەی تێدا نییە نەك بڵێین مسوڵمان هەڵە ناکات ، مسوڵمانیش بەئەندازەی ئەوەی کەپابەند دەبێت بەئیسلامەوە و تەفاعول لەگەڵ ئیسلامدا دەکات و بە پێی ئیسلام ڕەفتار دەکات لەهەڵە دوور دەبێ، بەڵام هەرگیز ئینسان نابێتە مەلائیکەت![3]

*******************************

٣٧٨.جەنگی دژە تیرۆر بە بەرژەوەندی کورد دابنرێ یاخود دانەنرێ و ئەمریکا بەرژەوەندی خۆی تێدا دێنێتەدی، ئەوە دوو بۆ چوونە وەك چۆن هەر برادەرێك بۆی هەیە بڵێت من پێم وایە خێر و بەرەکەتی ئەو جەنگی دژی تیرۆرە هەمووی بەسەر میللەتی کورددا دەڕژێ منیش هەروەك کوردێك بۆم هەیە بڵێم نەخێر ئەو خێر و بەرەکەتە ئێمە ناگرێتەوە و بەوەش کە بۆچوونێکی خۆم

---

[5] سەرچاوەی پێشوو -ل-٢٤

[1] سەرچاوەی پێشوو -ل-٢٤

[2] دەردو دەرمانی بزوتنەوەی ئیسلامیی -چاپی یەکەم -ساڵی ١٩٩٠ ز -ل-١٠٠-١٠١

[3] کۆمەڵی ئیسلامیی -ئامانج و هەڵوێستەکانی و چەند پرسیارێکی گرنگ لەبارەی ئیسلام و ئیسلامیەکانەوە -چاپی یەکەم -ساڵی ٢٠٠٢ ز-ل-٥٣-٥٤

دەخەمەڕوو ئەوە ناگەیێنیٚ کە ئێمە دژی خەڵك و میللەت ین، ئەی بۆچی ئـەو دژی خـاك و خـەڵك و میللەت نەبیٚ کە بۆ چوونەکەی دژی بۆ چوونەکەی منـە کـە بـۆی هەیـە بـۆ چـوونەکەی مـن ڕاسـت بێت؟ ئایا کیٚ ئەو دادوەرییە دەکات ؟! جا خۆ ئەگەر وابکەین ئەوە وەك کۆرسمان لێدیٚ بۆ نمونـە تیپێکی کۆرس کە یەکێکیان شتێك دەڵێت هـەموویان پێکـەوە دەیڵێنـەوە ! !نـەخێر دەبـیٚ جـۆراو جۆری هەبیٚ و گویٚ بۆ یەکترگرتن و لەیەکتر حاڵی بوون هەبیٚ لەوەدا بەڕاسـتی ژیـان بـەرەو پـێش دەچیٚ کۆمەڵگا جوان دەبیٚ وەلەوەشدا ئیبداعات دەبیٚ، بەڵام یەکێکمان شـتێکی گـوت هـەمووما‌ن وەك ئەو بیڵێینەوە، بێگومـان ئەوکاتـە ڕاسـتیش ناکـەین، چـونکە لـە حالـەتێکی وادا ئـەو کۆرسـە زۆریان لەترسان دەیڵێنەوە یان لەبرسان بـۆ نموونـە ئـەمریکا شـتێك دەڵـیٚ هـەموویان بڵـێین ئەمـە حەقە ئەوە بەڕاستی بەس لەترسانە، ئەگەر نا باشە چەپەکانی کوردستان کە دونیا پـڕە لەچـەپ و دەیانگوت ئەمریکا هەرشەیتانێکی ڕەجیمە و بەکەڵکی هیچ شـتێك نایـەت و جیهـانی سـەرمایەداری دەبیٚ هەر فـڕیٚ بدرێتـە بـەحرەوە ، زۆر چـاك لـە بیرمـە چـەند جـار موناقەشـاتمان کـردوە لەگـەڵ چەپەکاندا ئەی باشە ئێستا واتای چی خەڵك بۆتە ئەمریکی و لەگـەڵ قەناعـەت و بۆچـوونی خۆیـدا ڕاست ناکات، بەڵام بەپێی ئەو بایەی کە لە ئەمریکاوە دێت شەنی خۆی دەکات! من دەڵێم ئینسان نابێت لە کوێوە باهات لەوێوە شەنی خۆی بکات دوایی خەرمانەکەت خراپ لیٚ تێکەڵ دەبیٚ!کەواتە ئێمەش بۆمان هەیە بڵێین ئـەمریکا بەرژەوەنـدی خـۆی بێنێتـە دی ، بـەڵام جـاری واهەیـە ئـەمریکا دەیەوێت بەرژەوەندی خۆی بێنێتەدی ، بەڵام تـۆش دەتـوانی قـازانج بکـەی ئەگـەر بایەکـە کـەدیٚ بەئاڕاستەیەك هات کە کەشتییەکەی تۆ بەرەو ئامانج بەرێت، لێرەدا قازانج دەکەی ، بەڵام وانەزانی ئەو بۆ تۆی دەکات، ئەگەر بۆ تۆی بکات کاتێکی تر دەیکرد کە کـورد خەریکـە بـوو قەڵاچۆدەکراو جینۆساید دەکرا، ئەگەر بۆ تۆی بکردایە ئەو کات دەیکرد ![1]

******************************

٣٧٩.فاشلترین کەس بابایەکە بیەویٚ بەڕووخانی خەڵکی خۆی بینا بکات ![2]

---

[1] سەرچاوەی پێشوو –لا- ٥٤-٥٥

[2] ڕۆژنامەی ئاوێنە ژمارە (١١٨)

٣٨٠.ئینسان هەتا بەدڵسۆزی بۆ خوای گەورە کار نەکات خۆشی ناوێ و نای کاتە دۆستی خۆی، کەسێکیش خوا خۆشی نەویست هەر بەتەنێ دەبێ لەکارەکەی دا و خوای لەگەڵ نابێت، کەسێکیش خوای لەگەڵ دا نەبوو دڵی بەندەکانی لەقاردا دادەخرێ و ناتوانێ تەئسیریان تێ بکات ![1]

******************************

٣٨١. ئینسان هەر لە خواپەرستی لادات دووچاری بت پەرستی دەبێت و دەبێتە کۆیلە، جایان کۆیلەی یەکێك لە دیاردە سروشتی یەکان، وەك دارو بەرد و ڕووەك و ئاژەڵ و ئینسان و ڕۆژ و ئاگرو شەیتان و فریشتە و...هتد یان کۆیلەی نەفسی خۆی ![2]

******************************

٣٨٢.کێ دەیەوێ شەیتانی بەد و نەفرین کراو بەسەر دڵ و دەروونی دا زاڵ نەبێ و، قەڵای دڵی داگیر نەکات، با هەمیشە و دایم ودەرم خوای لەیاد بێت، چونکە هەر دڵ و دەرونێك بەتیشکی ڕۆژی بروا بەخوا بوون و یادی خوا ڕووناك بووبێتەوە، هیچ حەشارگە و نەدیوو پەناو پەسیوی تێدا نامێنن کە شەیتانی نەگبەت و بێ خێر، خۆی تێدا مەڵاس داو سەنگەری تێدا لێدات ![3]

******************************

٣٨٣.بابای خواناس و مسوڵمان لەکاتێك دا سەرگەرمی یادی خواو ڕاز و نیاز لەگەڵ کردنی دەبێت، دڵی بەتیشکی تەجەللای جوانی و سام و هەیبەتی خوا پڕ پڕ دەبێت لە ئارامی و ئۆخژن و ڕازی بوون و دڵنیایی و هەست کردن بەعیززەت و سەربەرزی و ئازایەتی و بەجەرگی و غیرەت.[4]

******************************

٣٨٤.یادی خوا◆ مرۆڤ ڕزگار دەکات لە شەوە زەنگی ڕەوشت نزمی و ئاکار بەدی و بێ بەندو باری و کەچ ڕەفتاری و نا لەباری، کە لەئاکامی دوور کەوتنەوە لەئیسلام و بڵاو بوونەوەی بیردۆزە قڕپۆکە مرۆڤکردە شەیتانی یەکان دا پەیدادەبێ ![5]

---

[1] پوختەیەك دەربارەی ئیسلام لەبەر ڕۆشنایی سورەتی فاتیحەدا -چاپی دووەم -ساڵی ٢٠٠٦ ز ل-١١١

[2] سەرچاوەی پێشوو ل-٢١٧

[3] یادی خوا گرنگی یادی خوا لە ژیانی ئینساندا -چاپی یەکەم -ساڵی ١٩٨٧زل-٨٠

[4] سەرچاوەی پێشوو ل-٨٣

◆ ئەوەی خەتی بەژێردا هاتوە خۆم بۆم زیاد کردووە، چونکە سیاقی وتەکە دەیخواوێ پاشان بابەتەکانی پێش ئەمیش باس لە یادی خوا دەکەن وەهەروەها وتەکانی ٣٨٥-٣٨٦-٣٨٧ یش بەهەمان شێوە. ئامادەکار .

٣٨٥.یادی خوا مرۆڤ ڕزگار دەکات کە هەر ڕۆژە بەدەهۆڵێك هەڵپەڕێ و بەئاوازێك گەرم بێ، کە بێجگە لە ماندوو بوون و ئارەق ڕشتن هیچی دیکەی لەو هەڵپەرین و داپەڕین و هاتن و چوون و جەزبە گرتن و گەرمبوونە دەستگیر نابێ![1]

******************************

٣٨٦.یادی خوا مرۆڤ ڕزگاری دەکات لەوەی هەروەك نەخۆشێکی فرزە لێ براوو بێ حاڵ هەر ڕۆژە کۆڵەکە برین پێچێکی نا کارامە و نەشارەزا خۆی لێ بکاتە لوقمانی حەکیم و یەکێکیان چەقووی تێدا بەکاربێنێ و ئەوی دیکە بڵێ ئی پێشێ نەیزانیوەو، کە چەمووسێکی لێ وە کارخاو یەکی دیکە کولە مقەستێکی ژەنگاوی و وە هەروەها![2]

******************************

٣٨٧.یادی خوا مرۆڤ ڕزگار دەکات لە وەی کەڕۆژ بۆ ڕۆژێ بە هۆی ڕێچکەی شەیتانی و بەپێ ی نەخشە و پیلانی ئیمپریالیزمی جیهان خۆر نەتەوەکەی پتر پارچە پارچە و کوت کوت بێت![3]

******************************

٣٨٨.یادی خوا مرۆڤی موسڵمان و گەلی موسڵمان ڕزگار دەکات، لەتاریکی و شەوە زەنگی چەوسێنرانەوە بەدەست هەر ڕژێمێکی ستەمکاری خۆسەپێنەری بێ دینی لاڕێ!.[4]

******************************

٣٨٩.دڵی مرۆڤی خوا لەیاد و خواپەرست وەك زەوی یەکی نەرم و بەپێز وایە، هەروەك چۆن زەوی نەرم و بەپێز ئەو ئاوە هەڵ دەمژێ کە بەسەری دا دەبارێ و دوایی ڕووەك و شیناوردی تێدا دەڕوێ، دڵی بابای خواناس و خوا لەیادیش ئەو ڕێ ڕوونی و ئامۆژگاریانەی کە بەسەری دا دەخوێندرێتەوە، وەریان دەگرێ و دوایی ئەو دڵە کەبەتیشکی یادی خوا

---

(٥) سەرچاوەی پێشوو لا-٨٧

(١) سەرچاوەی پێشوو لا-٨٧-٨٨

(٢) سەرچاوەی پێشوو لا-٨٨

(٣) سەرچاوەی پێشوو لا-٨٨

(٤) سەرچاوەی پێشوو لا-٨٨

ڕۆشن بۆتەوە، دەبێتە زەمیـــــــنەیەکی لە بار و گونجاو بۆ تێدا ڕووانـی هـەموو جۆرە کـردار و گوتارێکی مسوڵمانانە![1]

*******************************

٣٩٠.دڵی مرۆڤی لە خوا دور و بێ ئاگا، وەك زەویەکی ڕەقەن و بێ پیت وایە کە لە بەر ڕەقی و بـێ پیتی توانای هەڵمژین و هەڵگرتنی ئەو ئـاوەی نیـە کـە بەسـەری دا دەڕژێ و هـەر بـۆ یـەش هیـچی چاکی تێدا ناڕوێ![2]

*******************************

٣٩١..دینداری ڕاستەقینە بناغەی دنیاداری سەر ڕاستانەیە و (دین)هەوێنی (ژیـن)ەو (ئیمـان )یـش ڕووح و هەناوی (ئینسانە)![3]

*******************************

٣٩٢.لە نێوان فرمێسکی چـاوو خـوێنی هـەناو دا پەیوەندیـەکی زۆر نێزیـك هەیـە، چـونکە کەسـێك هێندە لەخوا نیزیك بوبێتەوە و هێندە دڵی بە یادی خـوا بێـدار بووبێتـەوەو، سـۆز و کـەف و کـوڵی گەرمی نێو دڵی پڕ لـە ئـەوینی لـەڕێی فرمێسکی چـاوی‌یەوە بڕێـژێ، ئینسـانێکی وا، چـەند دڵۆپـە خوێنێکی لەڕێی ئەو خوایەدا کەهێندەی خۆش دەوێ لێ وەچاو نیە![4]

*******************************

٣٩٣.ئەو کەسەی دڵی بەخواوە بەستراب‌ێ و ئامانج و مەبەستی گەیشتن بەڕەزامەنـدی خـوا بێـت و، زەوی گیانی تێراوی یادی خوا بێت، دەبینی دڵ و دەرروونی هەتا بڵێ ی سپی و ساف و بێ گەردەو سروشتی بۆتە سروشتێکی فریشتانە و، ژیانی دیمەنی بەهارێکی بـەخۆ وەرگرتـوە کەسـەدان گوڵی نیاز و مەبەستی گەش و والا و، نەمامی گوتار و ڕەفتاری بەرزە باڵای تێدا هاتوونـەدی کـە مرۆڤـی ژێر ناچار دەکات لەبەرامبەری دانیشێ و تێیدا بکەوێتە سەرنج دان و موتالا![5]

*******************************

---

[1] سەرچاوەی پێشوو لا-٨٩

[2] سەرچاوەی پێشوو لا-٨٩

[3] دەبەرێك ڕاچوونی ئیسلام ڕیچکان -چاپی سێیەم -ساڵی ٢٠٠٦ ز- لا-١٣

[4] یادی خوا گرنگی یادی خوا لەژیانی ئینساندا -بەرگی یەکەم -ساڵی ١٩٨٧ ز - لا-157

[5] سەرچاوەی پێشوو لا-١٨٣

٣٩٤.هەم فیطرەتی ساغ و هەم عەقڵی سەلیم هاندەر و پاڵنەری ئینسانن بۆ خواناسین و بڕواپێ هێنانی و بەندایەتی بۆ کردنی و پەرستنی ![١]

******************************

٣٩٥.ئەگەر مرۆڤ لە دەروونەوە شەیدای خواناسی نە بوایەو، بۆی تینوو نەبوبا، مەحاڵ بوو خوا بەرنامە و پەیڕەوی خواناسی بۆ ڕەوانە بکات![٢]

******************************

٣٩٦.هەستی خواناسیی هەستێکی بەرز و دا خوازییەکی ڕەسەنی سروشتی مرۆڤە ![٣]

******************************

٣٩٧.هەرچەندە هەستی خواناسی لەسەرەتاوە پێویستی بەڕێنماییکەر و هاندەر نیە، بەڵام دواتر بۆ ئەوەی لەڕێی ڕاست لاریێ نەبێ و تووشی سەرگەردانی نەبێ، ئەو هەست و سۆزە نەرم و ناسکە سادەیە حەوجێی ڕێڕوونی و ئاڕاستەکردنێکی ڕێك و ڕاستە ![٤]

******************************

٣٩٨.هەستی خواناسیی و ئایینخوازی بریتیە لە عەودالّی و شەیدایی مرۆڤ دەربارەی ئەو خوا پەروەردگارەی کە بەدیهێنەر و سەرچاوەی هەموو ئەو جۆرە ڕێکوپێکی وردەکاریانەیە ![٥]

******************************

٣٩٩.هەستی خواناسیی وێرای ئەوەی کە داخوازییەکی سروشتییە، هەرگیز لە سروشتی مرۆڤیش ناسرێتەوە و لاناچێ، بەڵکو لە ڕاستیدا سروشتی مرۆڤ و هەستی ئایینی وەك ئارد و ئاو تێك هەڵشێلراون و هەویری کەسایەتی مرۆڤیان پێك هێناوە ![٦]♦

******************************

---

[١] خواناسیی ئایین ئیمان –ڕاتسییەکانی ئیسلام دەدرەوشێنەوە ئەفسانەکانی ڕێچکان دەپووچێنەوە–چاپی یەکەم –ساڵی ٢٠٠٠ ز لا–٢٠

[٢] سەرچاوەی پێشوو لا–٢٣

[٣] سەرچاوەی پێشوو لا–٣١

[٤] سەرچاوەی پێشوو لا–٣٩

[٥] سەرچاوەی پێشوو لا–٤١

[٦] سەرچاوەی پێشوو لا–٥٧

♦ ئەو وتەیەی سەرەوە هەڵهێنجانی مامۆستایە لە ئایەتی (لاتَبْدِیلَ لِخَلْقِ اللّه )

٤٠٠.هەستیی خواناسی لـەپێکهاتنی کەسایەتی ئینسان دا بەشێکی بنـەڕەتی و گرنگـە و، بەکـەم بوونی لە ئینسانەتی دەشۆرێ، بێگومان خوای کابەجێ و میهرەبانیش زۆر لەوە بەرزترە کە کاری نارێك و نەگونجاوی لێ بوەشێتەوە![1]

******************************

٤٠١.هـەروەك چـۆن ئـاو پێکهێنـەرێکی بنەڕەتیـە لـە جەسـتەی مـرۆڤ دا، بڕوابـە خـوا بـوون و خواپەرستیش بنەڕەتی ترین پێکهێنەری ڕووحیەتی![2]

******************************

٤٠٢.خەڵکی ئێستا لـەم ڕاستییە بـێ ئاگـان و پێیـان وایـە بـڕوا بـە خوابـوون و خواناسـی شـتێکی سـەربەخۆ و جوێیـە لـە خواپەرسـتی و پابەنـدی و، ئینسـان بـەبێ هـیچ جـۆرە گەردنکـەجی و فەرمانبەرییەکیش دەتوانێ خۆی بە بڕوادار و خواناس لەقەڵەم بدات![3]

******************************

٤٠٣. ♦ –باشە ئەگەر، ڕاستە بڕوات بە خوا هەیە، بۆ بەقسەی ناکەی؟!

ئایا لێی دەترسێی؟ئەگەر لێی دەترسێی بۆ فەرمانەکانی جێ بەجێ ناکەی؟!

خۆشت دەوێ ؟کوا!ئەدی بۆ لەخۆتی ڕازی ناکەی؟!

بڕوات بە بەهەشتێ هەیە؟ئەدی بۆ ڕەنجی بۆ نادەی؟!

لە دۆزەخێ دەترسێی؟ئەدی بۆ ناتبینم لە بەری ڕاکەی؟!

بڕوات بەلێ پرسینەوەی دوارۆژ هەیە؟نەخێر وانیە ڕاست ناکەی، دەنا کوا بۆ خۆی بۆ ئامادە ناکەی؟![4]♦



[1] سەرچاوەی پێشوو لا-٥٨

[2] سەرچاوەی پێشوو لا-٦٢

[3] سەرچاوەی پێشوو-لا-١٦٨

♦ ئەم پرسیارانە ئاڕاستەی ئەو کەسانەیە کە دەڵێن بڕوامان بە خوا هەیە، بەڵام فەرمانەکانی جێ بەجێ ناکەن – ئامادەکار

[4] سەرچاوەی پێشوو لا-١٧٠

♦ ڕەنگە لە وەڵامی هەموو ئەم پرسیارانە دا بەرە و تە لیسمی نەتوانین و قالب گرانی و تەنبەڵی ڕاکەی! بەڵام سور سور بزانە، تە لیسمی گۆڕین ئەفسانەیەکی ڕووتە و، بێ هودەیە، بە قسەم دەکەی بەخوت و خۆڕایی خۆت ماندو ناکەی، چونکە قەت قەت بەکلیلێکی ئەفسانەیی چاری دەرگای پۆڵایینی ئەم پرسیارانە ناکەی

٤٠٤.پەیوەندی نێوان پابەندیی بە بەرنامەی خواوە و بە ڕەزامەندی خوا گەیشتن، وەك پەیوەندی نێوان بە پەیژەدا سەرکەوتن و چوونە سەربانە، جا بێگومان کە سێکیش بە پەیژەدا سەرنەکەوێ مەحاڵە بتوانێ بگاتە سەربان![1]

*******************************

٤٠٥.بڕوای بێکردەوە و، یادکردن و ڕازو نیاز و پاڕانەوە و کروزانەوەی بێ جموجووڵ و تێکۆشان، لە تەرازووی بەرنامەی خوادا، دەعوای بێ شایەدەو دەعوای بێ بەڵگەو شایەدیش لە دادگادا بەفلسێکی قەڵبیش ناقەڵبێندرێ![2]

*******************************

٤٠٦.لە ڕاستیدا ئیمان بەخوا و خواناسیی و یاساکانی ئیسلام پەیوەندی نێوان کارەباو گڵۆپ و، ڕۆژ و ڕووەك و، دڵ و ئەندامەکانی لە شیان لەنێواندا هەیە، چونکە ئەو ژیان و جوانی و ڕەونەقەی کە لە یاساکانی ئیسلامدا دەبینرێ لە دینەمۆی بڕوابە خوابوون و، ڕۆژی خواناسی و، دڵی خوا خۆشویستنەوە وەریان گرتوە، ئاخر بێجگە لەسەرچاوەی بەهێز و خاوەن پیت و پێزی ئیمان بەخوا چ شتێکی دیکە وا لەمرۆڤی خواناس و مسوڵمان دەکات کە هەموو چالاکییەکانی ژیانی— لەسیاسی و سوپایی و کۆمەڵایەتی و پەروەردەیی و ئابووری — بەعیبادەت و خواپەرستیی لەقەڵەم بدات[3]؟![4]

---

ئەگەر ڕاستە تەوەزەل و قاڵب گران و تەپڵۆسی، ئەدی بۆ چی لە مەیدانی کار و کاسبی و گوزەران دا ، بە هیچ ڕەنگێك بەهانەی نەتوانین و قاڵب گرانی، ڕێ بەخۆت و بەهی کەسێکی دیکەش نادەی کە پێت بڵێ: لێی دانیشە و گوێ مەدە هیچ ئیش و کارێك، تو خوا پێم بڵێ کەسێك دوای وات لێ بکات زۆر یش خۆی لێ تورە ناکەی!!

[1] سەرچاوەی پێشوو لا-٣٠٣

[2] سەرچاوەی پێشوو لا-٣٤٤

[3] سەرچاوەی پێشوو لا-٣٤١

[4]ئنجا هەروەك چۆن بڕوا بەخوا بوون والەجموجووڵ و چالاکییە جۆراو جۆرەکانی مرۆڤ دەکات کە بۆی بەخواپەرستی (عبادە) لە قەڵەم بدرێن، بەپێچە وانەشەوە بڕوا بەخوا نەبوون دەبێتە هۆی بێ نە نجامی و قبولێ نەبوونی هەر کردەوەیەك وەك خوای زانافەرموو یەتی( مَثَلُ الَّذِينَ كَفَرُوا بِرَبِّهِمْ أَعْمَالُهُمْ كَرَمَادٍ اشْتَدَّتْ بِهِ الرِّيحُ فِي يَوْمٍ عَا صِفٍ) ابراهيم١٨

واتە وێنەی کردەوەی ئەوانە کەبڕوایان بەپەروەردگاریان نیە، وەك خۆڵەمێشك وایە کەلە ڕۆژێکی گێژەڵووکاویدا دەکەوێتە بەر تەوژمی بایەکی توند و ڕای دەماڵێ. ⟵

٤٠٧.هەروەك چۆن گڵۆپی بێ کارەبا بێ شۆق و خامۆشە و، ڕووەکی بێ ڕۆژ زەرد و سیس و ئیشکەرو، جەستەی بێ دڵ کە لەشێکی ساردو سڕە دینەمۆیەکیش گڵۆپی پێ ڕۆشن نەکرێ و، ڕۆژێك ڕووەکی پێ سەوز نەکرێ و، دڵێکیش خوێنی پێ دابەش نەکرێ، بە دینەمۆ و ڕۆژ و دڵ دانادرێن!

بەڵێ هەروەك چۆن یاساو دەستوورەکانی ئیسلام بەبێ بڕوا بەخوا بوون، وەك کە لەشێکی بێ گیان و مردوون، بڕوابە خوا بونیش بەبێ بەڕێوەبردنی یاساو چالاکییەکانی بەرنامەی خوا، وەك گیانێکی ڕووتی بێ جەستە وایە ئنجا بێگومان هەروەك چۆن جەستەی بێ گیان بەتەنێ داری پێ لەسەر بەردی ڕۆنانرێ، گیانی بێ جەستەش بەتەنێ، مێشی پێ لەخو دەرناکرێ![1]

*******************************

٤٠٨.(دڵ) فەرمان ڕەوای شاری لەشەو ئەندامەکانیش کاربەدەست و سەربازنی، جا دیارە سەربازیش بەپێی فەرمانی سەرۆکیان بەڕێوە دەچن، جا چاك بێ یان خراپ، ئنجا هەروەك چۆن چاکیی و خراپیی سەربازان نیشانەو شایەدی چاکیی و خراپیی سەرۆکیانە، چاکیی و خراپیی ئەندامەکانی لەشیش سەبارەت بەدڵ بە هەمان شێوە![2]◆

*******************************

٤٠٩.هەروەك چۆن کەسێك مەلەوانێکی زۆر کارامە و لێهاتوو نەبێ ناتوانێ بە دەریادا بچێتە خوارو، ئەو گەوهەر و مروارییانە بهێنێتە دەرێ، کە لەبنەوەی دەریا قووڵەکان دان، بابایەکیش دەتوانێ ڕاز

---

جێی سەرنج ئەوەیە کە کردەوەی بێبڕوایان وە خۆڵە مێش چوێنراوە! جامن پێم وایە حیکمەتی ئەو وێچواندنە ئەوەیە، کە هەروەك چۆن خۆڵەمێش لە ئەسڵدا شتێکی چاك - دار و سوتەمەنی- بووە، بەڵام بەهۆی ئەوەوە کە سوتێنراوە بێ کەڵك بووە، کردەوەی چاکی کافرانیش لە خودی خۆیدا چاك و پەسەندە، بەڵام چونکە کافرەکان بە ئاگری بێبڕوایی سووتاندوویانە بۆتە خۆڵەمێش!

[1] سەرچاوەی پێشوو ل-٣٤٢

[2] سەرچاوەی پێشوو ل-٣٤٦

◆ ئەم وتەیە ڕوونە کەرەوەی ئەو فەرمودەیەی پێغەمبەرە(ﷺ) کە مامۆستا وتەکەی لە فەرموودەکەوە وەرگرتووە کە بەم شێوەیە لە کتێبی ناوبراودا هێناویەتی پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی (پارچە گۆشتێك لە جەستەدا هەیە کە ئەو چاك بوو جەستە هەمووی چاك دەبێ) ئامادەکار.

و نهێنییەکانی دەریایی قووڵ و بێ سنوری خواناسیی بدۆزێتەوە کە خاوەنی دڵێکی ئازاد و چاو کراوە و چاك و بێ غەوش بێ و، بتوانێ بێت و بچێ و قووڵ ڕۆبچێ![1]

******************************

٤١٠.مرۆڤـ کە بیەوێ ڕێیەکی ئەو تۆ بگرێتە بەر کەپێیدا بگاتە خواناسیی تەواوو بێ پەڵە، بە هیچ کام لە عەقڵ و دڵ و بە هەردوکیشیان ئەو کارەی بۆ پێك هەڵنایەت، و ئەوەی مەبەستیەتی بۆی وەدی نایەت، بەڵکو دەبێ پێشەکی پشت بە عەقڵ ببەستێ و لە دەریایی قوڵی بیرکردنەوە و تێوەڕاماندا بیخاتە کار، ئنجا پشت بەدڵ و دەرونیش ببەستێ و لەشۆردن و پاڵاوتن و پاککردنەوە و سپی کردنەوەی وەخۆ بکەوێ، ئنجا دەبێ لە ئیش پێکردن و دەعەمەل هێنانی هەرکام لە عەقڵ و دڵدا پشت بەدەقەکانی دوو سەرچاوەی ڕوونی ئیسلام (قورئان و سوننەت) ببەستێ و لەبەر تیشکی ڕێڕوونییەکانیاندا بەڕێوەبچێ![2]

******************************

٤١١.ئیبلیسی بەد و نەگریس بەس لە کاتی بێ ئاگایی و دوور لە خواییدا دەتوانێ پێ بنێتە نێو قەڵای دەروونی مرۆڤەوە، هەروەك چۆن بابایەکی دزو جەردە لە کاتی نوستن و چرا کوژانەوەی ماڵاندا دەرفەتی چەنگ دەکەوێ، واتە هەتا ڕۆژی یادی خوا و لەگەڵ خوا بوون لە ئاسمانی شاری دڵ دا هەڵاتوو و شوعلەوەر بێ، دەبێ شەیتانی جەردەو دز هەر دەرکراوو شار بەدەربێ ![3]

******************************

٤١٢.قورئان خوێندن ئەو قورئان خوێندنە یە کە هێندە بەتاو تینە بتوانێ شەیتانی بەد فەڕ بڕەتێنێ و ژەنگی سەر دڵ بوەرێنێ و بڕوا بە خوا بوون بخەملێنێ، ئەو قورئان خوێندنە یە کەخوا داوای کردووە و فەرمانی پێکردوە و پێغەمبەر(ﷺ) بەکردار بەڕێوەی بردووە ![4]

******************************

٤١٣.هەروەك چۆن هەتا دەست نوێژت نەبێ و جەستە و جل و بەرگت و ئەو شوێنەی کە لەسەری ڕادەوەستی پاك نەبێ بۆت نیە نوێژ بکەی، هەروەك چۆن هەتا لە لەش پیسی خۆت پاك نەکەیەوە،

---

[1] سەرچاوەی پێشوو ل-٣٧٣

[2] سەرچاوەی پێشوو ل-٣٧٦

[3] سەرچاوەی پێشوو ل-٤١٦

[4] سەرچاوەی پێشوو ل-٤٢١

ڕێی چوونە نێو مزگەوت و دەست لە قورئان دانت نی یە، هەروەك چۆن هەتا جوتیار زەویەکەی نەکێڵێ و هەڵی نەوێژێرێ هیچی تێدا ناچێنێ. بەهەمان شێوەش هەتا لەبێ دەست نوێژیی سەرگەرم بوون بەدنیاوە و، لە لەش پیسی خراپە و تاوانەکان و لە گژو گیاو چرپ و چاڵی سیفەتە بەدەکان و خوو خدە پیسەکان پاك نەبیەوە، مەودای بەرەو خواچوون و لە خوا نزیك بوونەوەت نیە، چونکە بەدیداری خوا شادبوون ئامانج و مەبەستێکی یەکجار بەرز و پیرۆزە ![1]◆

*******************************

٤١٤.ئەوانەی بەزمان دەڵێن (استغفرالله وأتوب اليه)، بەڵام بەکردەوە و حاڵ هەر بەردەوامن لەسەر حاڵ و وەزعی پێشوویان، بەس زمانیان گۆڕانی بەسەردا هاتووە، دەنا ئەندامەکانیان هەرلەسەر بەزم و ڕەزمی پێشوویانن و لەسەر تاوان و گوناح کردن بەردەوامن! ئەوانە لەڕاستیدا نەك هەر بە تۆبە کردو لە قەڵەم نادرێن، بەڵکو بەگاڵتە کردوو بە تۆبە لەقەڵەم ئەدرێن![2]◆

*******************************

٤١٥.وەك چۆن لاڕێ بوون و لە خوا یاخی بوون ماك و کانگای بەڵاو گرفتەکانن، چاکەکای و بۆ لای خوا گەڕانەوەش مەڵحەمی سارێژکەری زۆر بەی هەرە زۆری برین و زامە ماددی و مەعنەویەکانن![3]

*******************************

٤١٦.زۆربەی هەرە زۆری ئەوانەی بە نەزانی و بێ ئاگایی بەڕێی بەرەو خواچوون دا کەوتونەتە ڕێ، نەك هەر نەگەیونەجێ، بگرە زۆر بەیان سەریان لە زەندەقە و لاڕێ بوون و گومڕایی یەوە دەرچووە ![4]

---

[1] ڕێگای صالح بوون و بەرەو خواچوون –تەزکیەی نەفس لەبەر ڕۆشنایی قورئان سوننەت دا –چاپی یەکەمی نوسینگەی تەفسیر –ساڵی ٢٠٠٥ ز–لا–٣٧–٣٨

◆ لَا يَمَسُّهُ الْمُطَهَّرُون پاك بووەوان نەبێ دەستیان نایگاتێ.

[2] سەرچاوەی پێشوو لا–٤٠

◆ چونکە تۆیەکێك بانگت بکات بۆلای خۆی و بڵێ: بگەڕێوە لام و تۆش بەزار بڵێی: ئەوە گەڕامەوە. یان ئەوە دەگەڕێمەوە !! بەڵام بەکردار بەردەوام بێ دیارە ئەو جۆرە ڕەفتارەت جگە لەگاڵتە پێ کردن هیچ تە فسیرێکی دیکەی نیە.

[3] سەرچاوەی پێشوو لا–٤٧

[4] سەرچاوەی پێشوو لا–٥٠

٤١٧.ئه‌گه‌ر كرده‌وه‌كان تۆ و بن و ته‌مه‌ن زه‌وی بیٚ، ئیخلاص و خوا پیٚ مه‌به‌ست بوون (ئاو)ه‌و بیٚگومان هیچ ڕووه‌كیٚكیش به‌بیٚ ئاو ناڕویٚ و گه‌شه ناكات، كه‌واته هیچ كرده‌وه‌یه‌كی چاكیش به‌بیٚ خوا مه‌به‌ست بوون نایه‌ته دی و وه‌رناگیریٚ![1]

******************************

٤١٨.هه‌روه‌ك چۆن شیر هه‌تا (هه‌ویٚن) ی تیٚنه‌كریٚ نامه‌یٚی و نابیٚته ماست هیچ جم و جولٚ و چالاكی یه‌كیش به‌بیٚ هه‌ویٚنی ئیخلاص نامه‌یٚ و به‌كه‌لٚك نایه‌ت![2]

******************************

٤١٩.به‌ر له‌وه‌ی بجولیٚی ڕووی دلٚ و نیاز و مه‌به‌ستت بكه قیبله‌ی هه‌ره به‌رزت كه خوای به‌رزو مه‌زن و به‌خشه‌ر و داهیٚنه‌رو خاوه‌ن لوتف و به‌زه‌یی یه‌و، ته‌واو ته‌واو دلٚت ساغ و یه‌كلا بكه‌وه‌و بیٚجگه ( له‌خوا نزیك بوونه‌و به‌ره‌و به‌رزایی به‌رز بوونه‌وه‌و به‌ڕه‌زامه‌ندی خواشاد بوون و كاملٚ بوون و تیٚگه‌یشتن و پیٚگه‌یشتن) هیچ نیاز و مه‌به‌ست و ئاوات و ئامانج و خولیایه‌كی دیكه له دلٚت دا مه‌هیٚله و پاك پاك نیازه‌كانی دلٚ و ده‌روونت به بیٚژنگی قورئان وسوننه‌ت دابیٚژه و، بیٚجگه له ده‌غلٚی كاكلٚ دارو ساغی خوا مه‌به‌ست بوون و به‌ره‌و خواچوون .ئه‌وی دیكه هه‌مووی فریٚ بده![3]

******************************

٤٢٠. (شیر) هه‌رچه‌نده زۆر چاك بیٚت به‌بیٚ هه‌ویٚن نامه‌یٚ و ده‌ترشیٚ، ئه‌گه‌ر دنیایه‌ش به‌تۆوی دابچیٚنی به‌بیٚ (ئاو) سه‌وز نابیٚ، كه‌واته هه‌تا ڕووی دلٚت له‌گه‌لٚ خوادا ڕاست ڕاست نه‌كه‌ی و ته‌واو ته‌واو خۆت بۆ خوا خاویٚن و یه‌كلا نه‌كه‌یه‌وه هیچ مه‌كه، چونكه دیواریٚك له‌سه‌ر زبلٚی دابنریٚ سه‌ره‌نجامی هه‌ر ڕووخان و هه‌ره‌س هیٚنانه![4]

******************************

٤٢١.خوا له‌لای تۆ چۆن بیٚ تۆش له لای وی ئاوای![5]

******************************

---

[1] سه‌رچاوه‌ی پیٚشوو ل-٥٢

[2] سه‌رچاوه‌ی پیٚشوو ل-٥٢-٥٣

[3] سه‌رچاوه‌ی پیٚشوو ل-٥٤

[4] سه‌رچاوه‌ی پیٚشوو ل-٥٤-٥٥

[5] سه‌رچاوه‌ی پیٚشوو ل-٥٥

٤٢٢.تەقوا پەرستنی خوایە، بەڵام ئیحسان چاك پەرستنی خوایە، بابای پارێزکار (متقی) هەوڵ دەدات هەموو دەمێ لە نێوان چاکەو خراپە دا چاکە هەڵبژێرێ، بەڵام بابای چاکەکار (محسن) هەوڵ دەدات لەنێوان چاکەو چاکتردا چاکتر هەڵبژێرێ![1]

*******************************

٤٢٣.ئاشکراو بەڵگە نەویستە کە لەڕێی خواوەنەبێ بەرەو خوا ناچی و، تاکە ڕێگایەکیش کە خوا پیشانی بەندەکانی داوە بۆ بەندایەتی کردنی و لێ نزیك بوونەوەی و بەرەو لاچوونی ئەو ئیسلامەیە کە لەدوو سەرچاوە ڕوون و بێ چەندو چوونەکەی دایە کە قورئان و سوننەتن![2]

*******************************

٤٢٤.بناغەی بەندایەتی بۆ خواکردن ئەمەیە کە ئینسان خوا بناسێ و خۆی بناسێ و ئەرکی سەرشانی بەرامبەر بە خوا بزانێ، بەبێ ئەمە ناتوانێ، یەك هەنگاوی دروست بنێ، هەرچی لەسەر بناغەی نەزانی ی (جهل) یش بنیاتی بنێ هەر لەسەری قەرزدار دەبێتەوە![3]

*******************************

٤٢٥.خوا بەجەهل ناپەرسترێ دیواری دینداری و پارێزکاریش لەسەر بناغەی نەزانی بنیات نانرێ![4]

*******************************

٤٢٦.گرنگترین لایەنی ئامادەکاری و زەمینەسازیش لەڕوانگەی ئیسلامەوە، لایەنی مەعنەوی یە، چونکە بێگومان ڕووح ئەسڵی ئینسانە و جەستە زیاتر دەوری توێکڵ و دیکۆر و سێبەر دەبینێ![5]

*******************************

٤٢٧.ئەم ژیانە دنیایی یە مەیدانی تاقیکردنەوە و کێڵگە تێدا چاندنە، نەك تاقە هەل و دەرفەتی ڕەخساوی لە زەت وەرگرتن و ڕابواردن![6]

---

(٣) سەرچاوەی پێشوو ل-٦٧

(٤) سەرچاوەی پێشوو ل-١٣٨

(٣) سەرچاوەی پێشوو ل-٢١٢

(٤) سەرچاوەی پێشوو ل-٢١٢

(٥) سەرچاوەی پێشوو ل-٢٢٩

(٦) مسوڵمانی کامڵ -بەشی یەکەم بیرو باوەڕی مسوڵمان -چاپی یەکەم -ساڵی ١٩٩٧ز-ل-٨٨

٤٢٨.ئەو کەسەی بە بیانووی خۆ ئامادەکرن بۆ سەفەری قیامەتێ ژیانی دنیای وەلادەنێ وە بە کەم بایەخ تەماشای دەکات، نەك هەر دژی ئایین جوولاوەتەوە، بەڵکو ئەو توێشوو پەیداکردنەش – کە دنیای بۆ وەلانەوە – بۆتە خەیاڵێکی پووچ! چونکە پەیداکردنی توێ شووی سەفەری قیامەت بەواز لەدنیا هێنان پێك نایەت، دەنا ئەگەر وابا خوای کاربەجێ هەر لەسەرەتاوە دنیای دروست نەدەکرد و یەکسەر دەیبردینە قۆناغی قیامەتەوە ! [1]

*******************************

٤٢٩.هەروەك چۆن بەڕێوە بردنی دادگەری و یەکسانی و ئازادی ئەنجام و بەرهەمی سروشتیی بیری خواناسیی ڕاستەقینەیە، ستەم و چەوساندنەوە و چینایەتیش قەڵەفسەی بڕکە کوژاڵگی بێ بڕوایی یە ! [2]

*******************************

٤٣٠.ئینسان بۆ تاقی کردنەوە بەدیهێنراوە و تاقی کردنەوەکەشی لە وەدا بەرجەستە دەبێ کە بەندایەتی بۆ خوا بکات، وە بەندایەتی بۆ خوا کردنەکەشی لە وەدا خۆی دەنوێنێ کە کردەوەی باش ئەنجام بدات، کردەوەی باشیش لەوە دایە کە پابەندیی ئایینی خوابێ و دوای بەرنامەو شەریعەتی خوا بکەوێت، چونکە هەرکاتێك ئینسان دوای شەریعەتی خوا کەوت دیارە لە خراپە و لاریی دوور دەبێ و کردەوەی باش ئەنجام دەدات، وشەی (العمل الصالح) یش لە زاراوەی قورئان دا، هەم نیەتی نێو دڵ و هەم دەربڕینی زمان و هەم کردەوە و چالاکی ئەندامەکانیش دەگرێتەوە ! [3]

*******************************

٤٣١.(سابق بالخیرات) ئەو بابایە کە ئیمانەکەی هێندەی بەگوڕ و تین کردوە لە مەیدانی دینداریی و چاکەکاریی دا کە هەردەم لە ڕێزی پێشەوەیە و سەرقافڵە و پێشڕەوە [4]

---

[1] سەرچاوەی پێشوو لا-٢٠١

[2] سەرچاوەی پێشوو لا-٢٧٦

[3] ئیسلام و مسوڵمانەتی و کاری ئیسلامیی لە ژێر ڕۆشنایی قەرئان سوننەت دا -چاپی یەکەم -ساڵی ٢٠٠٦ ز لا-٣٧

[4] زنجیرە دەرسی ئیمان و عەقیدە ئیسلامیی بەرگی یەکەم -ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی چی یەو چۆنە - چاپی یەکەم -ساڵی ٢٠٠٦ ز لا-١٥٠

٤٣٢.ئینسان بە هۆی هیدایەتی خواوە (جهل)ە کەی دەگۆڕێ بۆ(علم ) و (ظلم)ە کەیشی دەگۆڕێ بۆ (عدل) ![1]◆

*********************************

٤٣٣.کەسێك وەك لە خوا دەترسێ و شەرمی لێ دەکات هێندە لە هیچ نەترسێ، لە ڕاستیدا ئەو کەسە لە دیلی و کۆیلەیی قوتاری دەبێ و کۆت و زنجیری دەست و پێ یانی دەپسێنێ و ئازادی ڕاستەقینە وەدەست دێنێ، وە بابای وا دەبێتە شێری چەنگ بەخوێن و شەرمێ لە شای ناکاو لە هیچ سڵ ناکات ![2]

*********************************

٤٣٤.ئینسان تەنهابە هۆی بەندایەتی یەوە بۆ خوا ڕێز و کەرامەت و کەسایەتی سەلامەت و پارێزراو دەبێ و لەخەم و پەژارەی دنیاو دواڕۆژ دەڕەخسێ ![3]

*********************************

٤٣٥.بێگومان شەریعەتی خوای پەروەردگار هەموو ئەو ئەرکانەی خستوونیەتە سەرشانی ئینسان پێش قیامەت بۆ دنیای لێیان بەهرەمەند دەبێ، ئەگەر نا خوای پەروەردگار پێویستی بەخۆ ئەزیەت دان و خۆماندو کردن و خۆبرسی کردن و خۆتینوو کردنی هیچ کەس نیە، بەلام ئەوە ئینسانەکانن کە پێویستیان بەوە هەیە کە بەوشێوەیەی خوای پەروەردگار بۆی دیاری کردوون بژین، وە ئەو کارانە کە لە شەریعەت دا خوای پەروەردگار بۆی ڕوون کردوونەتەوە، جێ بەجێیان بکەن بۆ ئەوەی لە دنیاو دواڕۆژدا بەختەوەربن ![4]

---

[1] سەرچاوەی پێشوو ل-٣٤٥

◆ (جهل) یش بریتیە لە تێکچوونی هێزی فیکریی (القوة النظرية) و (ظلم)یش تەعبیر لە تێکچوونی هێزی کردەیی (القوة العلمية)ی ئینسان دەکات، چونکە ئینسان دووجۆرە هێزی هەن، هێزێکی فیکری کەشتی پێ دەزانێ و، هێزێکی کردەیی کە کردەوە و چالاکییەکانی پێ ئەنجام دەدات!

[2] زنجیرە دەرسی ئیمان و عەقیدە ئیسلامیی لە ژێر ڕۆشنایی قورئان و سوننەت دا-بەرگی سێیەم-خوا بە یەکگرتن لەناو سیفەتەکان و لە پەرستراوێتی دا-چاپی یەکم سالی ٢٠٠٦ ز - ل-٤٢١

[3] چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم سەرنجێکی واقیعییانەو هەلسەنگاندنێکی شەرعییانە -چاپی چوارەم - سالی ٢٠٠٥ ز-ل-١٥٥

[4] سەرچاوەی پێشوو-ل-١٥٩

٤٣٦.ته‌قوا به هه‌موو كه‌سێك وه ده‌ست دێ چونكه نه په‌یوه‌ندی به نێرایه‌تی یه‌وه هه‌یه نه به‌مێیایه‌تی وه نه به ده‌وڵه‌مه‌ندی و نه به‌نه‌دارییه‌وه نه به‌خوێنده‌وارو نه به نه‌خوێنده‌وارییه‌وه هه‌یه، په‌یوه‌ندی به هیچ شتێكه‌وه نییه كه ئینسان نه‌توانێ به‌ده‌ستی بهێنێ وه‌ك جینس و ره‌گه‌زو ره‌نگ و زمان و ره‌چه‌ڵه‌ك..هتد![1]

******************************

٤٣٧.ته‌جره‌به‌ی تاڵی یه‌كه‌مین ئینسان سه‌لماندی كه ئینسان به‌بێ رێڕوونی خوا نا توانێ ژیانێكی دروست و به‌خته‌وه‌رانه به‌رێته سه‌ر! [2] ♦

******************************

٤٣٨.به‌س له رێی قورئانه‌وه ده‌زانین خوا چی لێمان ده‌وێ و ته‌نها له رێی سوننه‌ته‌وه ده‌زانین پێغه‌مبه‌رمان(ﷺ) فه‌رمانی له‌سه‌ر چی یه![3]

******************************

٤٣٩. گرنگی و قیمه‌تی ژیانی دنیا به‌س له‌و رووه‌وه‌یه كه ئینسان خوای تێدا بپه‌رستی و به‌ندایه‌تی تێدا بكات، جا هه‌ركاتێك ئه‌و جه‌وهه‌ر و حه‌قیقه‌ته له ژیانی ئینسان دا نه‌ما، ئینسان و ژیانه‌كه‌یشی ده‌بێته گوێزی قرپۆك و فلێسكی قه‌ڵب ناهێنێ![4]

******************************

٤٤٠.هه‌روه‌ك چۆن شادی و به‌خته‌وه‌ری ژیانی نه‌براوه‌ی به هه‌شت به‌رهه‌م و ئه‌نجامی ژیانی خوا په‌رستانه و، خه‌م و په‌ژاره و ژیانی به‌ژانی بێ پسانه‌وه‌ی دۆزه‌خ به‌ری تاڵی ژیانی نا ئیسلامی

---

[1] سه‌رچاوه‌ی پێشوو–ل–١٨٦–١٨٧

[2] پرۆژه‌ی به‌رنامه‌ی فكری‌ی كاری ئیسلامیی –چاپی یه‌كه‌م سالی ١٩٩٦ ز –ل–١٢

♦وعصی ادم ربه فغوی  چونكه شه‌یتان هه‌موو ده‌مێ بۆ ئینسان له‌بۆسه (كمین) دایه‌و مرۆڤیش حاڵی له دوولایه‌ن نی یه،یان ده‌بێ (ره‌ببانی) بێ یان (شه‌یتانی )! به‌ڵام كاری ئینسان به‌وه چاك بووه كه هه‌وه‌ك چۆن ئاماده‌یی فریو خواردن و خلیسكانی هه‌یه (فأزلهما الشیطان...) ئاماده‌یی گه‌رانه‌وه (توبه) و دووباره وه‌رگرتنه‌وه‌ی رێڕوونیشی هه‌یه (فتلقی ادم من ربه كلمات فتاب علیه...)!

[3] سه‌رچاوه‌ی پێشوو–ل–١٦

[4] سه‌رچاوه‌ی پێشوو–ل–٣٣

یانەو دنیا پەرستانەیە، خۆشی و بە ختیاریی ڕواڵەتی و دەروونی و ناخۆشی و ژینتاڵیی تاکی و کۆمەڵی ی ئەم دنیایەش هەر زادە و بەرهەمی خواپەرستی و دنیا پەرستی یە[1]

*******************************

٤٤١.مادم ژیانی دنیا مەیدان و دەرفەتی تاقی کردنەوەی ئینسان بیّ و، بابەت و ماددەی تاقی کردنەوەکەش بریتیبیّ لە بەڕێوەبردنی ئەرکی خەلیفایەتی و ئاوەدان کردنەوەی زەوی، کەواتە: گۆشەگیری و دنیا نەویستی و لە پەراوێزی کۆمەڵگادا ژیان بە سەربردن لە ڕوانگەی ئیسلامەوە شتێکی پووچ و هەڵەیە ![2]

*******************************

٤٤٢.دۆستایەتی خوای بەرز و مەزن لە (خوایەتی ) و (پەروەردگارێتی) کردن بەسەر بەندەکانی داو، ئی بەندەکانیش لە بەندایەتی (عبودیة) و خواپەرستی یاندا بۆ خوا دەدرەوشێتەوە ![3]

*******************************

٤٤٣.شەیتانی لە عنەتی و ئیبلیسی نەگریس سەرکردەی بەرەی ناهەق و چەقی دوژمنایەتی کردنی خوا و پێغەمبەر و ئیسلام و مسوڵمانانە، وەك پێشینان گووتویانە (خەتی خوار لەبن سەری گای پیر دایە) ![4]

*******************************

٤٤٤.وە بڕواداران کە خوا لێیا دەبووریّ و بەزەیی یان لەگەڵ دەنوێنیّ نمونەی ئەو جۆرە ئینسانانەن –بەڵکو هەر ئەوان ئەو جۆرە ئینسانانەن–کە هەردووك ئەمانەتی شەریعەت و فیطرەتیان پاراستوون و ،هەردووك هێزی فیکری و کردەیی خۆیانیان لە شوێنی خۆیان دا بەکار هێناون و بە ئەرك و کاری بەندایەتی و جیّ نشینایەتی و ئەمینداریّتی خوای بەرز و مەزن هەستاون ! ![5]

*******************************

[1] سەرچاوەی پێشوو–ل–٣٢

[2] سەرچاوەی پێشوو–ل–٣٣

[3] سەرچاوەی پێشوو–ل–٢٠٢

[4] سەرچاوەی پێشوو–ل–٢١٦

[5] سەرچاوەی پێشوو–ل–٢٣١

٤٤٥.بابایەك مە بەستی بە دیداری خوا شادبوون و خوا لەخۆ ڕازی کردن و گەیشتنە بە هەشتی بەرین و قووتار بوون لە دۆزەخی ئاگر بەتین بێ، بێگومان دڵ و مێشکی دەبنە کانگای بیرو خولیای بەرز و پاك و، ژیان و گوزەرانیشی دەبێتە کێڵگەی تێدا چاندنی دانەوێڵەی هەموو هەڵس و کەوتێکی شەرعی یانە و، زەویی تێدا ناشتنی نەمامی درەختی هەموو کردار و هەڵوێست و ئاکارێکی ڕەببانی یانەی جوان و چاك ! [١]

******************************

٤٤٦.بتپەرستیی نزمترین فیکرەیە و خواپەرستیی بەرزترین فیکرەیە ! [٢]

******************************

٤٤٧.هەر کەسێك بەڕاستی ئیمانی بە خوا بێت بۆ خوا عابید دەبێ، کەسێکیش بۆ خوا عابید بوو پارێزکار (متقی) دەبێ، کەسێکیش ئەهلی تەقوا بوو نەفسی پاك و چاك (مزکاة) دەبێ، ئەم سێ یانە هەموویان تێك هەڵکێشن ! [٣]

******************************

٤٤٨.ئەگەر ئینسان ئیمانی هەبوو عیبادەتی دەبێ ئەگەر عیبادەتی بوو تەقوای دەبێ، ئەگەر تەقواش هەبوو نەفس تەزکیە دەبێ! [٤]

******************************

٤٤٩.ئەگەر تەقوات هەبێ تەزکیەت دەبێ، وەهەرکات نەفست تەزکیە بوو ڕەوشتت بەرز و جوان دەبێ، کاتێکیش تەقوات دەبێ عیبادەتت هەبێ، وەکاتێکیش عیبادەتت دەبێ کە ئیمان و عەقیدەیەکی باشت هەبێ! [٥]

******************************

---

[١] سەرچاوەی پێشوو-ل-٢٤٢

[٢] زنجیرەی بابەتە هەنوکەییەکان ئەڵقەی یەکەم -گەنجەکانمان لەنێوان ڕەسەنایەتی و لاسایی کردنەوەدا - چاپی یەکەم -ساڵی ٢٠٠٦ ز-ل -٢٨

[٣] زنجیرەی بابەتە هەنوکەییەکان -ئەڵقەی چوارەم -چۆنیەتی بوونە پێشەنگ و بنیاتنانی بنکەی جەماوەری -چاپی یەکەم -ساڵی ٢٠٠٧ ز-ل-٢٢

[٤] سەرچاوەی پێشوو-ل-٢٥

[٥] سەرچاوەی پێشوو-ل-٢٧-٢٨

٤٥٠.خـوای پـەروەردگار دەفـەرموێ: ئینـسانم بۆیـە دروسـتکردوە تـاکو تـاقی بکەمـەوە، تاقیکردنەوەش لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کەبەرنامەو ڕێبازی خوا بگرێ و گرتنی ڕێبـاز و بەرنامـەی خواش لەلایەن ئینسانەوە ئەوەیە کە بەندایەتی بۆ خوا بکات، بەندایەتی کردنیش بـۆ خـوا ئەوەیـە کەسـەر زەوی ئـاوەدان دەکاتـەوە بـەپێی بەرنامـەی خـوا، وە ژیـانێکیش دەگـوزەرێنێ کـە خـوای بەدیهێنەر بۆ ئینسان هەڵیبژاردوە کە بریتیە لە ژیانێکی ئینسانانە، ژیانێك کەڕێز و پایەو حورمەتی ئینسانی تێدا دەپارێزرێ لە دنیاو لە دواڕۆژدا![1]

******************************

٤٥١.ئینسان ئەگەر خۆی بە بەندەی خوا زانی مافی ئەوەی نیە بڵـێ خوایـە ئـەوەت لێ وەردەگـرم، بـەڵام ئـەوەیانت لێ وەرنـاگرم، خوایـە فـڵان لایـەن لـە دینەکـەت بەکـەڵك دێ، بـەڵام فـڵان شـتەی دینەکەیانت بە کەڵك نایەت![2]

******************************

٤٥٢.لێتـان وەسـیەت بـێ، بـە ئەنـدازەی ئـەوە کەئینـسان عابیـد دەبـێ بـۆ خـوا زانیارییەکەشـی بەرەکەتی دەبێ وە خەڵك لێی بەهرەمەند دەبێ ![3]

******************************

٤٥٣.ئینـسان هـەتا خـۆی پاکـسازیی و جاکـسازیی نـەکات چاکـسازیی و پاکـسازیی خـەڵکی پێناکرێ ![4]

******************************

٤٥٤.کاتێك دەتوانین خەڵك بۆ خوا فەرمانبەربکەین کە بۆ خۆمان فەرمانبەری خوا بین![5]

******************************

---

[1] زنجیرەی بابەتـە هەنووکەییـەکان ئەڵقـەی پێنجـەم –سیاسـەتی ئیسلامیی و چـەند ڕوونکردنـەوەك –چاپی یەکەم ساڵی ٢٠٠٧ ز–لا –١٠٦–١٠٧

[2] سەرچاوەی پێشوو–لا–١١٣

[3] زنجیرەی بابەتە هەنووکەییەکان ئەڵقەی حەوتـەم قوتابیانی زانیاری شـەرعیی و چـەند سـەرنج و ڕێنمایی یەك –چاپی یەکەم –ساڵی ٢٠٠٧ ز–لا–٣٩

[4] زنجـیرەی بابەتـە هەنووکەییـە کـان ئەڵقـەی هەشـتەم –خوڕەوشـتی بـەرز و پەسـەند سـەنگی مەحـەکی مسوڵمانەتی یە–چاپی یەکەم ساڵی ٢٠٠٧ ز–لا–٤٤

[5] بانگەواز بۆلای خودا چیەو چۆنەو بەکێ و بۆچی دەکرێ؟ ساڵی –٢٠٠٧ز–لا–٣٤

٤٥٥.شاره‌زایی و سه‌ر ڕاستی به‌بێ پارێزكاری به‌س بابایه‌كی (زۆر زان و جه‌ربه‌زه) یان لێ په‌یدا ده‌بێ و هیچی تر![1]

******************************

٤٥٦.هه‌ركه‌سێك دینداریی به ڕواڵه‌ت و بێ ڕوح وه‌رگرت، زیاتر گرنگی به قه‌باره و چه‌ندییه‌تی (الكمیة) ده‌دات، له‌جیاتی نێوه‌ڕۆك و چۆنیه‌تی (الكیفیة)، بێ خه‌به‌ر له‌وه‌ی كه خوای كاربه‌جێ فه‌رموویه‌تی (لیبلوكم أیكم أحسن عملا.. ) واته كرده‌وه‌ی چاكتر، نه‌ك زیاتر! كه دیاره چاكتربوونی كرده‌وه‌ش به هه‌ردووك مه‌رجی (الاءخلاص)و (الاتباع) ده‌بێ ![2]

******************************

٤٥٧.گه‌ڕانه‌وه لای خوا چه‌نده پاكسازیی و خۆ بژاركردنه له خراپه‌و له هه‌ڵه و سه‌رپێچییه‌كان، هێنده‌و پتریش چاكسازیی و خۆ ڕازاندنه‌وه‌یه به طاعه‌ت و فه‌رمانبه‌ری چاكه‌كان![3]◆

******************************

٤٥٨.مسۆگه‌ر مسۆگه‌ر تۆبه‌ی ڕاست و ساغ مایه‌ی جۆشانی ده‌ریای بێ بنی ڕه‌حمه‌ت و كه‌ره‌م و به‌خششی خوای په‌روه‌ردگاری به‌خشنده‌یه‌و بێگومان هیچ گوناح و تاوانێكیش خۆی له‌به‌رامبه‌ر شه‌پۆله‌كانی ده‌ریای ڕه‌حمه‌تی خوادا ناگرێ![4]

******************************

٤٥٩.خۆبه‌كه‌م گرتن و دان به‌هه‌ڵه و كه‌م كورتی خۆ دا هێنان و عوزر هێنانه‌وه و په‌شێمان بوونه‌وه خه‌سڵه‌تێكی به‌رزو په‌سه‌ندی باپیره گه‌وره‌مان–ئاده‌م–ه سه‌لامی خوای لێ بێ و، خۆبه‌زلگری و

---

[1] بزوتنه‌وه‌ی ئیسلامیی و ئاسۆیه‌كی گه‌ش و ڕوون بنه‌ما شه‌رعی یه‌كان و بنچینه ئه‌خلاقییه‌كان–چاپی یه‌كه‌م ساڵی ١٩٩٧ ز–لا –١٣

[2] سه‌رچاوه‌ی پێشوو–٥٩–٦٠

[3] گه‌ڕانه‌وه‌لای خوا(سبحانه وتعالی) به‌ره‌و خوا وه‌رچه‌رخان و واز له‌گوناح و سه‌رپێچی هێنان و گۆڕانكاری‌ڕیشه‌یی به‌سه‌ر خۆدا هینان –چاپی سێیه‌م –ساڵی ٢٠٠٥ز–لا–٣

◆ ئه‌گه‌ر وانه‌بێ ده‌بێ تۆبه‌و گه‌ڕانه‌وه لای خواو په‌شیمانی و داوای لێبوردن كردنی پێغه‌مبه‌ران به‌گشتی و سه‌روه‌ر و خاته‌میان به‌تایبه‌تی (علی نبینا وعلی الأنبیاء جمیعا الصلوات والتسلیمات)بۆ چی بووبێ، له حاڵه‌تێكدا كه‌هه‌ڵه‌و گوناح پارێزرو بوون؟!! هه‌مان سه‌رچاوه –لا–٣

[4] سه‌رچاوه‌ی پێشوو–لا–١١٠

سووربوون له‌سه‌ر هه‌ڵه‌و خۆپێ باش بوون و لووت به‌رزكردنه‌وه‌ش سیفه‌تێكی پیس و به‌دی ئیبلیسی نه‌گریسه![1]

*******************************

٤٦٠.ئه‌وه‌نده به‌سه بۆ ئیسپاتی گه‌وره‌یی و به‌رزی خه‌سڵه‌تی دان به‌هه‌ڵه‌ی خۆدا هێنان و پێ له‌كه‌م و كووڕی خۆنان، كه ویردی سه‌ر زمانی سه‌رجه‌م پێغه‌مبه‌رانی پایه به‌رزی خوداو به‌نده چاك و پاكه كانیه‌تی له‌سه‌ر له‌به‌ری قورئانێ دا هه‌ر له ئاده‌مه‌وه هه‌تا خاته‌م (علیهم من الله أفضل الصلوات وأتم التسلیمات ) به‌تایبه‌ت سه‌روه‌رو گه‌وره‌ی هه‌موویان "محمد" (ﷺ)كه فه‌رموویه‌تی "یاءیُها الناس توبو إلى الله واستغفروه فأنّي أتوبُ في الیوم مائة مرة"![2]

*******************************

٤٦١.ئه‌وه‌نده به‌سه بۆسه‌لماندنی شوومی و بێ خێری خه‌سڵه‌تی نزم و په‌ستی پێ له هه‌ڵه‌و په‌ڵه خۆ نه‌نان، كه زه‌قترین و سه‌ره‌كی ترین دروشم و نیشانه‌ی ئیبلیسه و مایه‌ی دوور خرانه‌وه‌شیه‌تی له ڕه‌حمه‌تی خوا![3]

*******************************

٤٦٢.خوا ئینسانی بۆ به‌ندایه‌تی كردن خوڵقاندووه و به‌ندایه‌تی ئینسانیش بۆ خوا له‌میانه‌ی تاقی كردنه‌وه‌ی دا ده‌بێ![4]

*******************************

٤٦٣.ئه‌م ژیانی دونیایه بریتییه له هۆڵی تاقی كردنه‌وه، ته‌مه‌نه‌كه‌یشی بریتیه له ده‌فته‌رێك كه دراوه‌ته ده‌ستی تاوه‌ڵامه‌كانی له‌سه‌ر بنوسێ![5]

*******************************

[1] چه‌ند ڕێڕوونی یه‌ك بۆ ئیسلامی یه‌كانی كوردستان -چاپی یه‌كه‌م -ساڵی ١٩٩٧ ز-ل -٦٦

[2] سه‌رچاوه‌ی پێشوو-ل-٦٨

[3] سه‌رچاوه‌ی پێشوو-ل-٦٨

[4] تاقی كردنه‌وه‌ی خوا بۆ به‌نده‌كانی چی یه و چۆنه ؟!چاپی یه‌كه‌م -ساڵی ٢٠٠٣ز-ل-٥

[5] ئه‌شكه‌نجه‌و زیندان پێشمه‌رگه‌یه‌ك بیست دوو مانگ له زیندانی داگیركه‌ردا -ئاماده‌كردنی: هاوژین عومه‌ر -چاپی یه‌كه‌م -ساڵی ٢٠٠٦ ز-ل-٣٨٣

٤٦٤. مەبەست لە صالح بون کە بەرهەمی(عابد) بوونە تەنیا شتێك و دووشت نیە وەك نوێژکەری باش بوون و ڕۆژوگری باش بوون بەڵکو مەبەست چاك بوون و لێهاتوویی و زانایی و توانایی یە لەهەموو بوارو لایەنەکانی دین و ژین دا ![1]

******************************

٤٦٥.ئاشکرایە کە لەنێوان "بە نوێژ ئاسوودەبوون و حەسانەوە "کە عادەتی پێغەمبەری خواو مسوڵمانە کامڵە شوێن کەوتووەکانیەتی و "لە نوێژ قوتاربوون و حەسانەوەش کەعادەتی مسوڵمانانی کرچ و کاڵە، جیاوازیان هێندەی ئاسمان و ڕێسمان هەیە ![2]

******************************

٤٦٦.لە سۆنگەی ئەوە کە یادی خواو خواپەرستیی خۆراك و بژێوی دڵ و گیانی ئینسانە و، دڵ و دەروونێك خۆری خواپەرستی تێدا هەڵنەهاتبێ زیندانەو تاریکستانە، وە لە سۆنگەی ئەوەوە کە یادی خوا مایەی ئۆخژون ئارامی دەروون و دڵدامرکانە (ألا بِذِكْرِ الله تَطْمَئِنُّ القُلُوبُ) وەنوێژیش گەورەترین و بەرزترین جۆری بەندایەتی و یادی خواکردنە: (وَأَقِمِ الصَّلاةَ لِذِكْرِي) بۆیە بابای نوێژکەر هەمیشە دڵ و دەروونی وەك ئاوێنەی مشت و ماڵ کراو سپی ڕوونەو، وەك باخی تەڕو پاراو گەش و جوانە ![3]

******************************

٤٦٧.ماڵ و سامان بەخشین بەبێ نیازو مەبەست ساغ و یەکلابوونەوەی خاوەنەکەی بۆ خوای پەروەردگار و بژارکردن و پاککردنەوەی دڵ و دەروونی لەهەر جۆرە نیاز و مەبەست و هاندەر و پاڵنەرێکی دیکە، وەك شیری بێ هەوێن جەستەی بێ هەناوو دەنك و تۆوی بێ کاکڵ و نێوەڕۆکە ![4]

******************************

---

[1] گۆڤاری پەیڕەو –ژمارە (٢) ل-٥

[2] مسوڵمانی کامڵ–بەشی دووەم خواپەرستی مسوڵمان –بەرگی یەکەم –چاپی یەکەم –ساڵی ٢٠٠٠ز–ل٧٩

[3] سەرچاوەی پێشوو–٥٨٧

[4] مسوڵمانی کامڵ –بەشی دووەم خواپەرستی مسوڵمان –بەرگی دووەم –چاپی یەکەم –ساڵی ٢٠٠١ز–ل–١١٦

٤٦٨. ئه‌گه‌ر ستایش و مه‌دح و ثه‌نا به‌دڵ و زمانه‌، سوپاسگوزاری بۆ خوا به‌ دڵ و زمان و ئه‌ندامه‌كانیشه ![1]

*******************************

٤٦٩.سوپاسگوزاری بۆ خوا به‌وه‌ ده‌بی كه‌ ئینسانی بڕوادار چاكه‌و نیعمه‌ته‌كانی خوا به‌خشه‌ر له‌ ڕه‌زامه‌ندی وی دا به‌كاربێنێ![2]

*******************************

٤٧٠. شتێكی ڕوون و بێ چه‌ندو چوونه‌ كه‌ماڵ و سامان به‌خشین به‌ ئومێدی پاداشتی خواو سه‌ربه‌رزی و ڕووسوری دواڕۆژ شمشێرێكی تیژو بڕنده‌یه‌ كه‌ملی خۆشویستنی دنیاو دڵ به‌پاره‌و سامان به‌ستنه‌وه‌ ده‌په‌ڕێنێ و ڕووی ئینسان به‌ره‌و خواو ژیانی ڕاسته‌قینه‌ی دواڕۆژ وه‌رده‌چه‌رخێنێ![3]

*******************************

٤٧١.له‌گه‌ڵ خه‌ڵكی چاك بوون به‌ره‌هه‌م و زاده‌ی له‌گه‌ڵ خوادا ڕست و ساغ بوونه‌ ![4]

*******************************

٤٧٢.گه‌ڕانه‌وه‌ لای خوا به‌س ئه‌وه‌نده‌نیه‌ كه‌ به‌زار بگوترێ (أستَغفِرُ اللهَ وأتُوبُ إليهِ ) چونكه‌ ئه‌مه‌ قسه‌ و ده‌عوایه‌كه‌ ڕاست و درویان هه‌ڵده‌گرێ و په‌ڕێزو به‌هه‌میش به‌لای یه‌كێكیانی دا ده‌خات ![5]

*******************************

٤٧٣.(وَلیُّ الله ) كه‌سێكه‌ كه‌ هه‌رچی زیاتر و چاكتر به‌هێزی تیۆری خۆی به‌رنامه‌ی خوای قبوڵ كردووه‌ و هه‌زم كردووه‌ وه‌به‌ هێزی كرده‌یش پێیه‌وه‌ پابه‌نده‌و ڕه‌فتاری پێ بكات، به‌ واتایه‌كی دی، دۆستی خوا ئه‌و كه‌سه‌یه‌ كه‌ ده‌رو ده‌روون"ظاهر و باطن" ی بۆ خوا ساغ و یه‌كلا بۆته‌وه‌و نه‌مێشك و دڵ و زمانی و ئه‌ندامامه‌ ڕواڵه‌تی یه‌كانی هیچ جۆره‌ ژه‌نگ و خڵته‌یه‌كی سه‌رپێچی و لادانیان پێوه‌نه‌ماوه‌ ![6]



---

[1] سه‌رچاوه‌ی پێشوو-٢٢٨

[2] سه‌رچاوه‌ی پێشوو-ل-٢٢٨

[3] سه‌رچاوه‌ی پێشوو-ل-٢٢٨-٢٢٩

[4] مزگه‌وته‌كانی كوردستان له‌نێوان ئاوه‌دانكردنه‌وه‌و وێرانكردندا-چاپی یه‌كه‌م -ساڵی١٩٩٩ ز-ل -٥

[5] پێشمه‌رگه‌ی ئیسلام یان مسوڵمانی موجاهید كێ یه‌ و چۆنه‌ ؟!-چاپی سێیه‌م -ساڵی ١٩٩٨ ز-ل -١٨

[6] بزوتنه‌ی ئیسلامیی و قۆناغیی نوێ ی -چاپی یه‌كه‌م ساڵی ١٩٩٤ ز -ل-٣٣

٤٧٤.نەسۆشیالیزمی ڕۆژهەڵات بەفری بێ پەڵەیە و نەسەرمایەداریتی یەکەی ڕۆژئاواش پەڵاسی ڕەش و بڕشە ![1]◆

*******************************

٤٧٥.مەی مادده پەرستە بیر تەسکەکان چۆن ماددەیەك کەهیچ کام لەو خەسڵەتانەی تێدا نیە◆◆ دەتوانێ ئینسانێك بخولقێنێ و هەموو ئەو خەسڵەتانەشی بەش بدات کە بۆ خۆی لێیان بێ بەشە ! مەگەر ئەو جۆرە بیر کردنەوەو ئەو تەرزە قسەکردنە، ناماقووڵانەتر و ساویلکانەتر نیە لەقسەی کابرایەك کەهیچ جۆرە میوەیەك شك نابات بەڵام دەڵێ: هۆ خەڵکینە کێ سێوو هەنجیر و هەنار و ترێ و پرتەقاڵ و هەرمێ وقەیسی و ... هتدی گەرەکە بابێتە لام، هەر جۆرە میوەیەکی بیەوێ پێ ی دەبەخشم ؟![2]

*******************************

٤٧٦.دارخورما چەند لەسەر شاخی قەندیل شین دەبێ و دەڕوێ مارکسیزمیش هەر هێندە لەنێو کوردەواری دا دەچەسپێ![3] ◆◆◆

*******************************

٣٨٧.شتێکی ڕوونە کە ئیسلام بە چەند قۆناغی تاقی کردنەوەدا تێپەڕیوە و لەکڵ[4] ها تۆتە دەرێ، بەڵام ئەو بیردۆزە دەست کردانە لەژێر تین و فشاری چەکوچی واقیعی ژینی مرۆڤدا بوونە

---

[1] دەبەرێك ڕاچوونی ئیسلام و ڕێچکان/ چاپی سێ یەم – ساڵی٢٠٠٦ ز–لا–٩

◆ بەڵێ کاتێ وام پێ دەگوتن(بەمارکسی یەکانی کوردستان ) ڕقیان هەڵدەستاو دەماری لاملیان ڕەق دەبوو پێیان وابوو قسەیەکی یەکجار هەڵەو بێ ویژدانانە کروە ، چونکە ئەوان ئەو سەردەمی قەناعەتیان وابوو کەڕۆژئاوا بەگشتی و ئەمریکا بەتایبەت هەرچی خێرە بەنێو چەوانیەوە نیە و، هەرکەسێك ناونیشان بەچاکە بێنێ کۆنەپە رست و نۆکەری بێگانە و ئیمپریالیستە.

◆◆ خەسڵەتەکانی (ژیری ،ئیرادە، زانا، بیناو، گۆیا، بیسەر ..هتد .ئامادەکار

[2] سەرچاوەی پێشوو لا–٥٨

[3] سەرچاوەی پێشوو لا–١٤٦

◆◆◆ ئەوەی مامۆستا وەختی خۆی بەمارکسییەکانی کوردستانی وتوە ئێستا وەك خۆی دەرچووە، هەڵبەت شتی تریشی پێوتون کە ئێستا لەسەر ئەرزی واقیع بەرجەستەیە بۆ ئاشنابوونی زیاتر دەتوانی سەیری کتێبی ناوبراو بکەیت ، کە چەند دێڕێك دوای ئەم وتەیە ڕاستیەکی تری پێوتون کە ئەمڕۆ زۆر بەڕوونی بەرچاو دەکەوێت و کەس ناتوانێت حاشای لێبکات. ئامادەکار .

[4] کڵ:بڵێسەی تینی ئاگر .

تۆزو گەردو بەهەوادا چوون و، لەنێو کوورەی گەرمی تاقیکردنەوەی مێژوودا بوونە گازو دوکەڵ و بێ سەرو شوێن بوون![1] ◆

*******************************

٤٧٨.سەیر لە وەدایە کە هەرکام لەو بەرەچەڵەك مسوڵمانانەی کە بە ئیسلام رازی نین لەبەر ئەوەی لە نیشتیمانێکی عەرەبی و لە هەل ومەرجێکی وادا نێرراوە، هیچ پێی نەنگ و شوورەیی نیە، کە لە ڕۆژگارێکی ساردی زستان دا پاڵتۆیەکی رووسی دەربکا و، چەترێکی ئەمەریکی لە سەرخۆ هەڵبدا و (گۆری یەکی ئینگلیزی دەپێ بکا)![2] ◆

*******************************

٤٧٩.پاش هەرەسهێنان و لەبەریەك هەڵوەشانەوەی یەکیەتی سۆڤیەتی بەزەبری ئاگرو ئاسن و هێرش و پەلاماری دەبابە و دابەزاندنی چەتربازان (مظلات) پێکەوە نوسێنراو، زۆربەی هەرەزۆری ئەگەر نەڵێین تێکرای پیر و تاقمە کۆمۆنیست و مارکسیەکان لە کوردستان و جیهانی ئیسلامم دا بەگشتی لە سۆنگەی ئەوەوە کە زیاتر لەسەر بناغەی وەهم و لاساکردنەوە و عاتیفە بنیات نرابوون، نەك وەك ئیددیعایان دەکرد (عیلم و فەلسەفە)!! وەك داوەڵی چەقێنراو کە گێژەڵوکە و بایەکی بەهێز لێی دەدات و سەرەو بن دەبێ، یەك لە دوای یەك رووخان و شوێنکەوتوانیان پرژوبڵاو بوون![3]

*******************************

---

[1] سۆزی نەتەوایەتی و بیری ناسیۆنالیزم لەتەرازوی ئیسلامدا - چاپی یەکەمی نوسینگەی تەفسیر -ساڵی ٢٠٠٥ز لا-١٢٤

◆ سپارت بوونەوەو لەبرەو کەوتن و بازاڕ شکانی بیردۆزەو ڕێچکە مرۆڤ کردەکان لەم سەردەمەدا لە هەموو کاتێك چاکتر دەبینرێ و بۆتە دیاردەیەکی هەرە زەق و بەرچاوی ئەم رۆژگارە.

[2] سەرچاوەی پێشوو لا-١٢٧

◆ ئێمە هەر نموونەمان بەکەل و پەل هێنایەوە، ئەگەرنا ئەو جۆرە کەسانە بەرلەوەی کەل و پەل لەو نەتەوە بیانیانە وەر بگرن، بیروبۆ چوون وبیردۆزەیان لێ وەردەگرن، مەگەر بیردۆزەی (مارکسیزم و لینینیزم) زادەی بیرو هۆشی کوردەکانی سلێمانی و دیاربەکرو سابلاغە یان ئی مارکسی ئەڵمانی و لینینی ڕوسیایی یە !
یان مەگەر بیردۆزەی داریونیزم مام پیرۆتی هەڵشۆیی بنیاتی ناوە یاخود داریونی ئینگلیزی.
یان ئایا بیری بوونایەتی (الوجودیە)هەڵقوڵاوی زەینی کوردێکی شارباژێری یە یان بابایەکی ئەمریکی؟!

[3] خواناسیی ئایین ئیمان ڕاستیەکانی ئیسلام دەدرەوشێنەوە ئەفسانەکانی ڕێچکان دەپووچێنەوە-چاپی یەکەم - ساڵی ٢٠٠٠ ز- لا-٩

٤٨٠.هه‌ندێك له‌سه‌رانی ئه‌و پێرو تاقمانه‌ی كه‌ هه‌تادوێنێ ده‌یانگوت ماركسیزم حقیقه‌تی موتله‌ق و نه‌گۆڕی تێدایه‌ [1] به‌ ڕاشكاوی دانیان پێدا هێناو گوتیان به‌ڵێ هه‌تا دوێنێ شوێنی بیردۆزه‌ی ماركسیزم كه‌وتبوین، به‌ڵام ئه‌مڕۆ عه‌قڵمان په‌یدا بووه‌ ! [2]

******************************

٤٨١.ئێمه‌ و مانانی ئیسلامی كه‌ پێشتر به‌پێویستمان ده‌زانی بۆ به‌رپه‌رچ دانه‌وه‌ی قسه‌و قاڵ و پروپاكه‌نده‌ ژه‌هراویه‌كانی كۆمۆنیست و ماركسیه‌كان بابه‌تی وه‌ك (سه‌لماندنی بوونی خوا) و (ئیسلام وریاره‌كه‌ره‌وه‌یه‌ نه‌ك تلیاك) و (ئیسلام ئیسلامه‌ نه‌ئایدیالیزمه‌ نه‌ ماتریالیزم) بنووسین، براده‌رانی چه‌پگه‌را(الیساریون) هه‌ر بۆ خۆیان له‌و خه‌مایان ڕه‌خساندین و ئه‌و گرفته‌یان له‌كۆڵ كردینه‌وه‌ پێشتر چه‌ند به‌گوڕوتین و دلگه‌رمی وه‌ك دێوانه‌ی تازه‌ ته‌ریقه‌ت وه‌رگرتوی جه‌زبه‌ لێهاتوو به‌رگریان له‌ ڕێچكه‌ی كۆمۆنیزم و ماركسیزم ده‌كرد و نه‌فره‌تیان له‌جیهانی سه‌رمایه‌داری و بلۆكی ڕۆژئاوا و فه‌لسه‌فه‌ی كاپیتالیزم ده‌كرد، ئه‌م جاره‌ش هێنده‌ به‌گوڕوتین و به‌لام به‌پێچه‌وانه‌وه‌ كه‌وتنه‌ ڕه‌خنه‌ لێگرتن و توانج و پلار تێگرتنی كۆمۆنیزم و ماركسیزم و سۆسیالیزم و مه‌دح و پێهه‌لاگوتنی جیهانی ڕۆژئاوا و ڕێچكه‌و بیردۆزه‌كانی وه‌ك: كاپیتالیزم و لیبرالیزم و دیموكراسیه‌ت و سۆسیال دیموكراسی ! [3]

******************************

٤٨٢.ڕێكه‌وت وێڕای ئه‌وه‌ی كه‌ ڕێكه‌وت په‌رستان نازانن چییه‌ و، هیچ به‌لگه‌یه‌كیان به‌ده‌سته‌وه‌ نییه‌ له‌سه‌ر ئیسپاتی بوونی، سه‌ره‌ڕای ئه‌وه‌ش به‌دان پێدا هێنانی ئه‌وانه‌ی بروایان پێیه‌تی ڕێكه‌وت هیچ جۆره‌ ژیری و زانیاری و توانا و ده‌سه‌لاتێكیش شك نابات، كه‌واته‌ ئه‌گه‌ر گریمان هه‌شبێ له‌ به‌ر نه‌بوونی ژیری و زانیاری و توانا ناگونجێ دروستكرانی بوونه‌وه‌ر و ڕێكخستنی مادده‌ی پاڵده‌ینه‌لا، ئه‌و كه‌سه‌ش كه‌ له‌گه‌ڵ بروابوونی به‌وه‌ كه‌ ڕێكه‌وت شتێكی بێ گیان و بێ ئیراده‌ و نه‌زان و كه‌ڕ و كوێر و ده‌سته‌ پاچه‌یه‌، بروای به‌وه‌ش هه‌یه‌ كه‌ ڕێكه‌وت، بوونه‌وه‌ر دروستكردن و

---

[1] له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا كه‌بناغه‌و بڕبڕه‌ی پشتی ماركسیزم (ماتریالیستی مێژوویی ) و (ماتریالیستی دیالێكتیكی ) ین كه‌ده‌ڵێن هیچ حه‌قیقه‌ تێكی موتڵه‌ق بونی نیه‌و هه‌موو شتێك له‌گۆڕان دایه‌!!

[2] سه‌رچاوه‌ی پێشوو لا-٩-١٠

[3] سه‌رچاوه‌ی پێشوو لا-١٠

مادده رێكخستنى له‌ده‌ست دێ، ئه‌وه وه‌ك ئه‌و كه‌سه‌وایه كه بڕوای به‌بوونى ( كۆسه‌ى ریش یان هه‌یه !) چونكه ئه‌گه‌ر كۆسه‌بێ ریش یانى چى؟![1]

******************************

٤٨٣.وه‌رن با تێفكرین تاكو زۆر چاك په‌ى به‌فه‌قیر حاڵى ى ئه‌وانه‌ى خوا ناناسن به‌رین!چونكه ئه‌و به‌سته زمانانه ده‌ڵێن: مادده مردووه و ئینسان زیندوو، مادده نه‌فام و مرۆڤ زانا، مادده كه‌ڕه و مرۆڤ بیسه‌ر ، مادده لاڵه و مرۆڤ گۆیا، به‌ڵام ده‌ڵێن ئه‌و مادده كه‌ڕ و كه‌ر و كوێر و داماو و مردو و لاڵ و هیچ پێ نه‌كراوه، مرۆڤى بیسه‌ر و زانا و بینا و خاوه‌ن توانا و زیندو و گویاو گورج و پێ كراوى خوڵقاندوه ![2]

******************************

٤٨٤. ئه‌و ئه‌سڵ و بنچینه‌یه‌ى كه بێ بڕوایان به به‌ڵگه‌یان له قه‌ڵه‌م دابوو كردبوویان به بناغه‌ى بیرى قرپۆكیان و، كۆشكى ئه‌فسانه‌یى خوانه‌ناسى یان له‌سه‌ر هه‌ڵچنى بوو، نه به‌ردو نه‌كه‌سته‌ك و نه‌قوڕ و ... به‌ڵكو به‌ڵمیش ده‌رنه‌چوو! ![3]

******************************

٤٨٥.هه‌ر كه‌سێك رێگاى توندو تیژى و رێگاى كوشتن و برین و رێگاى دا پڵۆسین و تۆقاندن بگرێته به‌ر بۆ هێنانه‌دى ئامانجى سیاسى ئه‌وه تیرۆریسته، وه رێبازه‌كه‌یشى تیرۆریزمه و كاره‌كه‌یشى تیرۆره، ئیدى ئه‌و كه‌سه هه‌ركه‌سێك بێت مسوڵمان بێت یان كافر بێت، رۆژهه‌ڵاتى بێت یان رۆژئاوایى فه‌رق ناكات و هه‌مان حوكمى هه‌یه ![4]

******************************



---

[1] سه‌رچاوه‌ى پێشوو لا-١٦١

[2] مسوڵمانى كامل – به‌شى یه‌كه‌م –بیروباوه‌ڕى مسوڵمان –چاپى یه‌كه‌م –ساڵى١٩٩٧ز–لا–٥١

[3] زنجیره ده‌رسى ئیمان عه‌قیده‌ى ئیسلامى له‌به‌ر رۆشنایى قورئان وسوننه‌ت دا /به‌رگى سێیه‌م /خوا به‌یه‌كگرتن له‌ناووسیفه‌ت و له‌په رستراوێتى دا–چاپى یه‌كه‌م –ساڵى ٢٠٠٧ز–لا–٣٩١

[4] چه‌ند مه‌سه‌له‌یه‌كى باوى سه‌رده‌م – سه‌رنجێكى واقیعیانه‌و هه‌ڵسه‌نگاندنێكى شه‌رعییانه ئه‌ڵقه‌ى یه‌كه‌م تیرۆرو تۆقاندن –چاپى چواره‌م–ساڵى ٢٠٠٥ز –لا– ١٤

٤٨٦.تیرۆریزم واته: فه‌رزکردنی بیروڕایی خۆت له‌سه‌ر غه‌یری خۆت به تۆ بزی و به‌زۆری زۆرداریی و بێ ئه‌وه‌ی قه‌ناعه‌تی پێی بێت له‌سه‌ری فه‌رز بکه‌ی و دای بپلۆسی و ئیراده‌ی پێشێل بکه‌ی ئا ئه‌وه تیرۆریزمه![1]

******************************

٤٨٧.بێ دینایه‌تی یان دونیاگه‌رێتی (عه‌لمانیه‌ت) هه‌ڵقوڵاوی جیهانی ڕۆژئاوایه و، وه‌ك كێم و زوو خاوێك ده‌رهاویشته‌ی جه‌سته‌و لاشه‌ی خه‌ڵكێكی بێ دین و نه‌خۆش و ده‌رده‌داره که‌په‌یدا بووه و به ئێمه و مانان گه‌یشتووه ![2]

******************************

٤٨٨.سیكوّلاریزم ده‌رمانی ده‌رد و زامی غه‌یری ئێمه‌یه، سیكوّلاریزم كه‌فی بێ هوده‌ی سه‌رده‌ریای ئه‌ندێشه‌ی خه‌یاڵ پلا و پووش و په‌ڵاشی ده‌ستی بابای به‌ئاودا چووه که له‌به‌ر خنکان ده‌ستی بۆ بردوه، هه‌رچه‌نده دادیشی نادات![3]

******************************

٤٨٩.ئه‌گه‌ر سه‌رنجی مێژو بده‌ین زۆرچاك ده‌زانین داخۆ چ سیسته‌مێك ئیستیفاده‌ی له‌و سێ كوچكه شومه كردووه؟[4] دیاره ته‌نها سیسته‌مه طاغوتیه‌كانن، چونكه ئه‌و ڕژێمه دیكتاتۆریانه به‌هۆی زێڕه‌وه خه‌ڵك برسی ده‌كه‌ن و، به‌هۆی زۆره وه خه‌ڵك ده‌ترسێنن و، به‌هۆی ته‌زویره وه خه‌ڵك فریو ده‌ده‌ن! [5]

******************************

٤٩٠.با به‌ڕاشكاوی و بوێرانه به ڕۆژئاواو جیهانگیرییه‌كه‌ی بڵێین: چاكه و خێره‌كانت به‌سه‌رچاو، به‌ڵام خراپه‌كانت، به‌ڵام عاده‌ت و نه‌ریتی خۆت بیردۆزه و فه‌لسه‌فه‌ی پووچی خۆت بۆ خۆت، تۆ كه پیاو له پیاو ماره ده‌كه‌ی، ئه‌وه له‌لای ئێمه شتێكی نا مه‌عقووڵه، یان ژن له‌گه‌ڵ ژن، وه كچ پێش ئه‌وه‌ی شوو بكات لای ئێوه‌سێ چوار منداڵی ده‌بێت و ده‌وڵه‌تیش ناچاره ده‌بێ به‌خێوی بكات!!

---

[1] سه‌رچاوه‌ی پێشوو-ل-١٦

[2] سه‌رچاوه‌ی پێشوو-ل-٩١

[3] سه‌رچاوه‌ی پێشوو-ل-٩١

[4] سامان -ده‌سه‌ڵات -ڕاگه‌یاندن / به ته‌عبیری قورئان (المال- القوه ،الخداع)

[5] سه‌رچاوه‌ی پێشوو-ل-١٨١

ئائەو شتانە عادەت و شایستەی خۆتانن و بە کەڵکی ئێمە نایەن، چونکە دینمان ڕێمان نادات و عەقڵیشمان پەسەندی ناکات![1]

*******************************

٤٩١.دیموکراسییەت وەکو زەرفێك وایە چی تێی بکرێ دەیگرێ، وە بەڕاستی زۆر ئامادەیە بۆ گۆڕان بەسەردا هێنان و لێکران و بە ملاو لادا بران، چونکە چوارچێوە و قالبێکی دیاری کراوی نییە کە ڕێگە بگرێ لەوەی (إنحراف) ی پێ بکرێت![2]

*******************************

٤٩٢.دیموکڕاسی چاکی نێوخراپانە![3]

*******************************

٤٩٣.هیچ کەسێك نی یە هیچ شتێکی بە کەڵك نەیەت و، هیچ فکرەیەك نی یە هیچ شتێکی باشی تێدا نە بێت![4]◆

*******************************

٤٩٤.ئیسلام و عەلمانیەت سەرچاوەی فیکرو کارو هەڵوێستی تەوژمی ئیسلامیی و عەلمانیین و، هەر کاتێك سەرچاوەش ناسرا ئەو ئاو و جۆگەیەش کە لێیەوە هەڵدەقوڵێ، دەناسرێ و بگرە بە هۆی ناسین و ئاشنایەتیمانەوە لە بارەی ئیسلام و سیکۆلاریزمەوە تەرازوویەکمان بەدەستەوە دەبێ کە بەشێوەیەکی ڕاست و دروست تەوژمی ئیسلامیی و عەلمانی و کۆمەڵ و گروپە پێکهێنەرەکانیان هەڵسەنگێنین![5]

*******************************

[1] سەرچاوەی پێشوو-ل-١٩٤

[2] سەرچاوەی پێشوو-ل-٢١٢

[3] سەرچاوەی پێشوو-ل-٢٣٢

[4] سەرچاوەی پێشوو-ل-٢٣٣

◆ بۆ نموونە سۆسیالیزم کە بۆ خۆی لە کاردانەوەی سەرمایەداریی (کاپیتالیزم) پەیدا بوو و لەکاردانەوەی چەوساندنەوەی چینی کرێکار سەری هەڵدا، چۆن هیچی بە کەڵك نایەت ؟! بێگومان شتی باشی تێدایە ،بەڵام فەلسەفەکەی و کرۆکەکەی بەکەڵك نایەت.

[5] تەوژمی و ئیسلامی و عەلمانی خاڵە هاویەش و جیاوازەکانیان-چاپی یەکەم -ساڵی ٢٠٠٨ز-ل-٩-١٠

٤٩٥.جیهانگیری بێ لایەنی (محاید) قبووڵ ناکات، بەڵکو دەڵێ: یان دەبێ لەگەڵم بی یان دەبێ ئامادەی ڕوو بەڕووبوونەوەو شەڕبی ![1]◆

*******************************

٤٩٦. تەوژمی عەلمانی ئەو کۆمەڵە خەڵکەن کە دەیانەوێ ئایین و شەریعەتی خوا لە ڕێکخستنی ژیان و گوزەرانی تاکیی و کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووری و ... هتد خۆیان و کۆمەڵگاکەیاندا پرسی پێ نەکرێ و حیسابی بۆ نەکرێ ، مەگەر لەچەند مەسەلەیەکی شەخصی و ڕووحی دا ![2]

*******************************

٤٩٧.فەلسەفەی ئایدیالیزم بەهەموو جۆرو شێوەکانیەوە بەدرێژایی مێژوو –هەرچەندە دانی بەبونی خواو ڕووح و دیوی نادیار(غیب)ی دنیا هێناوە – بەڵام نەیتوانیوە نە پێناسەیەکی ڕاست و شایستەی خوا –تبارك وتعالى – بکات و نەچۆنیەتی و جۆری پەیوەندی بەدنیا و مرۆڤەوە دیاری بکات و، نە وەڵامێکی ڕاست و مەنتیقی هیچ کام لەو شەش پرسیارە◆ بداتەوە، کە وەڵام دانەوەیان کاکڵە و جەوهەری (بووناسی) یەکی ڕاست، پێك دێنێ![3]

*******************************

٤٩٨.هەرکام (ماتریالیزم ) و (ئالدیالیزم ) تێڕوانینی هەڵەو پووچن لە بارەی بوون (وجود) هوە، یەکەمیان (بوون) لە(مادده) داکورت هەڵدێنێ و دان بە غەیری ماددەو ڕواڵە تەکانی دا ناهێنێ و،

---

[1] سەرچاوەی پێشوو–لا–١٩

◆ ئەمەش (جۆرج Wبۆش) زۆر بەڕوونی ڕایگەیاند پاش ڕووداوی یازدەی ئەیلول، کە گوتی ( هەرکەسێك لەگەڵمان نەبێ، دژمانە!)

[2] سەرچاوەی پێشوو–لا–٢٠

◆ ١–ئەم بوونە (وجود)ە چی یە ؟

٢–کێ هێنا و یەتەدی ؟

٣–چۆنی دروستکردووە ؟

٣–کەی دروستی کردوەو کەی کۆتایی دێ ؟

٥–بۆچی دروستی کردوە ؟

٦–بەرەو کوێ دەچێ و سەرەنجامی چی دەبێ ؟

[3] سەرچاوەی پێشوو–لا–٤٨

دووه‌میشیان مادده‌و ڕواڵه‌ته‌كانی زیاتر وه‌ك خه‌یاڵ و سێبه‌رێك بۆ جیهانی ئایدیاو مه‌عنه‌ویی ته‌ماشا ده‌كات![1]

******************************

٤٩٩.ڕێچكه‌و بیرۆكه‌یه‌ك كه‌ ماتریالیزم و ئایدیالیزم و دكتاتۆریی و دیموكراسیی و خواناس و خوانه‌ناس و و... هتد بتوانن له‌ ژێر چه‌تر و سێبه‌ری دا كۆببنه‌وه‌، دیاره‌ خاوه‌نی بیروبروا (عقیده‌) یه‌كی زۆر سه‌یرو بێ سه‌ره‌وبه‌ره‌یه‌ و ئه‌و قسه‌ فۆلكلۆری یه‌ ئه‌فسانه‌یی یه‌ مان دێنێته‌وه‌ یاد كه‌ ده‌رباره‌ی ڕۆژگاری حوكمڕا نیی (موحه‌ممه‌ی مه‌هدی) ده‌ڵێ: (گورگ و مه‌ڕ پێكه‌وه‌ ئاو ده‌خۆنه‌وه‌)![2]◆

******************************

٥٠٠.هه‌رشتێك زاده‌ و به‌رهه‌می فیكر و هۆشی به‌شه‌ر بێ هه‌رچۆن بێ هه‌ڵه‌و كه‌م و كوڕی تێده‌كه‌وێ![3]

******************************

٥٠١.ئه‌وه‌ی كه‌ (عه‌لمانییه‌ت ) له‌ ڕۆژئاوا به‌سه‌ری دا زاڵبوو به‌ زاندی و جێی پێ لێژ كرد، ئایینێكی خوایی نه‌بوو، به‌ڵكو ئایینێكی به‌شه‌ریی بوو، هه‌ربۆیه‌ كه‌سانێك كه‌ پێیان وایه‌ چاره‌نووسی (ئیسلام) له‌ به‌رانبه‌ر عه‌لمانییه‌ت دا له‌نێو مسوڵمانان وه‌ك هی نه‌صرانییه‌ت ده‌بێ له‌ نێو خه‌ڵكی ڕۆژئاوادا، خراپ به‌هه‌ڵه‌دا چوون و هه‌موو سمێل سوورێك به‌ هه‌مزاغا حاڵی بوون![4]

******************************

٥٠٢.هه‌ر فیكره‌و بیردۆزه‌یه‌ك كرابێته‌ به‌رنامه‌و ڕێبازی ژیان و گوزه‌ران سه‌رچاوه‌كه‌ی هه‌رچی یه‌ك بێت، له‌ ڕوانكه‌ی ئیسلامه‌وه‌ به‌ئایین (دین) داده‌نرێ و، به‌و پێیه‌ وه‌ك چۆن به‌رنامه‌كانی: ئیسلام و جووایه‌تی و دیانه‌تیی ئایین (دین)ن، به‌هه‌مان شێوه‌ش به‌رنامه‌كانی وه‌ك: كاپیتالیزم و سۆسیالیزم و لیبراڵیزم و سیكۆلاریزم و ... هتد ئایینن![5]

---

[1] سه‌رچاوه‌ی پێشوو-لا-٥١

[2] سه‌رچاوه‌ی پێشوو-لا-٧١

◆ لێره‌دا مه‌به‌ست بیروبڕوای عه‌لمانیه‌ته‌ كه‌چه‌ند بێ سه‌ره‌وه‌و به‌ره‌یی پێوه‌ دیاره‌-ئاماده‌كار

[3] سه‌رچاوه‌ی پێشوو-لا-٨٩

[4] سه‌رچاوه‌ی پێشوو-لا-١٠٠

[5] سه‌رچاوه‌ی پێشوو-لا-١٧٨

٥٠٣.سـيكۆلاريزم ڕه‌وتێكـی فيكـری و سياسـی و كۆمه‌ڵايـه‌تی بـوو كـه‌ له‌كاردانـه‌وه‌ی كلێـساو نه‌صرانييه‌تدا سه‌ری هه‌ڵداو كرۆكه‌كه‌شی بريتيه‌ له‌ دوور خستنه‌وه‌ی خواو ئايين و وه‌حی له‌ بـواری سياسه‌ت و حوكمڕانی، واته‌ ئه‌وه‌ی به‌لای عه‌لمانييه‌ته‌وه‌ گرنگه‌ ئه‌وه‌يه‌ كه‌ (خوا)-سبحانه وتعالی- ده‌ست وه‌رنه‌داته‌ كارو باری ده‌وڵه‌ت و حوكمڕانيی و مرۆڤـ بۆ خـۆی به‌رنامـه‌ی ژيـان و گـوزه‌ران و سيستەمی حومكڕانيی خۆی دابنێ، جا ئه‌و به‌رنامه‌يه‌و ئه‌و سيستەمه‌ هه‌رچـی هه‌يـه‌ بـابێ گرنگ ئه‌وه‌يه‌ هی خوا نه‌بێ و به‌ناوی ئه‌وه‌وه‌نه‌بێ ![1]

*******************************

٥٠٤.ڕاوێژ چوارچێوه‌ی شه‌ريعه‌ته‌، به‌ڵام ديموكراسی هيچ چوارچێوه‌يه‌كی نيه‌ ![2]

*******************************

٥٠٥.سيكۆلاريزم وا ته‌ماشای ژيان و گـوزه‌رانی دنيـا ده‌كـات كـه‌ تاكـه‌ ده‌رفـه‌تی ژيانـه‌و پێويـسته‌ مرۆڤـ هه‌موو تواناو وزه‌ی خۆی لـه‌ پێنـاوی دا تـه‌رخان بكـات و بێجگـه‌ لـه‌ ژيـانی دنيـاو خۆشـی و ئاره‌زووه‌كانی بايه‌خ به‌هيچی ديكه‌ نه‌دات![3]

*******************************

٥٠٦.سـيكۆلاريزم مرۆڤــ به‌سـه‌روه‌ری بوونـه‌وه‌ر (سـيّد الكـون) داده‌نـێ، بـه‌ڵام ئـيسلام مرۆڤــ به‌جێنشين و وه‌كيلـی خـوا -عـز وجـل- داده‌نـێ له‌سـه‌ر زه‌وی و له‌بوونـه‌وه‌ريش دا، هـه‌ر بۆيـه‌ش سيكۆلاريزم يان هه‌ر خوا ناناسێ يان ئه‌گه‌ر بيناسێ، هه‌قی ده‌ستێوه‌ردان (تدخل) ی ژيانی مرۆڤی پێنادات! به‌ڵام ئيسلام ده‌ڵـێ مرۆڤــ ئه‌گـه‌ر بيـه‌وێ به‌ختـه‌وه‌ر و سـه‌رفرازی ئێـره‌ و ئـه‌ولای بێـت پێويسته‌ پابه‌ندی ئايين و به‌رنامه‌ی خوای مه‌ولای بێ ![4]

*******************************



---

[1] سه‌رچاوه‌ی پێشوو-لا-٢٠٠

[2] سه‌رچاوه‌ی پێشوو-لا-٢٣٧

[3] سه‌رچاوه‌ی پێشوو-لا-٢٤٥

[4] سه‌رچاوه‌ی پێشوو-لا-٢٧٥-٢٧٦

٥٠٧.سەردەمێك دەوڵەتە سیکۆلاریستەکانی ڕۆژئاوا دەمارگیریی و تیرەگەری و نەتەوایەتییان کردبوو بە داینەمۆی تاڵان و بڕۆ و جەنگ و هەرا و پاوانخوازی و کۆلۆنیالیزم بەسەرپەرشتی ولآخی ناسیۆنالیزم ەوە هەر غار غارێن و ڕمبازێنیی بوو ![1]

*******************************

٥٠٨.پەنا بردنی خەڵکی ئەوروپا بە سیکۆلاریزم، زیاتر بەرهەمی کاردانەوەبوو نەك بیرکرنەوەو ڕامان ![2]

*******************************

٥٠٩.ئەو سیکۆلاریستانەی کە بەشێوەیەکی عاتیفییانە لە سیکۆلاریزمەوە ڕادەمێنن و، پێیان وایە کانگاو سەرچاوەی هەموو خێرو خۆشی و بەرژەوەندییە کە، حەوجێی چاو بەخۆدا گێڕانەوەیەکی جیدین، چونکە هیچکەس ناتوانێ بیسەلمێنێ کە بۆ نموونە: ئەلمانییەت وەك خودی خۆی سیستەمی دیموکراسی دەخوازێ و لەگەڵ دیکتاتۆری و حوکمی تاکیی دا ناکۆکە، چونکە هەر لەسەرەتای سەرهەڵدانی یەوە حیزب و ڕژێمە سیکۆلاریستەکان چەندان دەوڵەت و قەوارەی دیکتاتۆریی یانەیان بنیات ناون بێ ئەوەی خۆیان هەست بە سەغڵەتیی بکەن، یان هیچ کەس بتوانێ گلەیی ئەوەیان لێ بکات کە بە پێچەوانەی سیکۆلاریزم ڕەفتاریان کردوە ![3]

*******************************

٥١٠.جۆرێك لە چەواشەکارییە کە سیکۆلاریزم وا ڕابنوێنرێ کە خاوەن و کانگاو هۆکاری هەموو ئەو تەکنەلۆژیاو بەرەو پێشچوونە ماددی و گەشەکردنە ڕواڵەتییەیە کە مرۆڤایەتی لەم ڕۆژگارەدا بەخۆیەوە بینیوە، چونکە تەکنەلۆژیا و بەرە و پێشچوونی شارستانیی و گەشەکردنی مرۆڤایەتی، بەرهەم و زادەی کۆمەڵێك هۆکار و فاکتەریی خودیی و بابەتیی یە ئەگەرنا بۆ چی سیکۆلاریستەکانی ئێمە پاش چەندان ساڵ تەبەننی کردنی سیکۆلاریزم و بانگەشە بۆ کردنی هەر لە شوێنی خۆیانن و لەو بوارەدا وڵات و کۆمەڵگاکە یانیان قولآنجێك بەرەو پێش نەبردوە و بگرە لە زۆر ڕووەوە بەرە و دواشیا گێڕاوەتەوە؟![4]

---

[1] سەرچاوەی پێشوو-ل-٢٧٧

[2] سەرچاوەی پێشوو-ل-٢٩٩

[3] سەرچاوەی پێشوو-ل-٣٢٦-٣٢٧

[4] سەرچاوەی پێشوو-ل-٣٢٧

٥١١.سیكۆلاریزم حه‌تمه‌ن وه‌ك هه‌ر ئایین و بیرۆكه‌یه‌كی دیكه‌ی زاده‌ی بیرو هۆشی مرۆڤ، سه‌ره‌نجام پیر ده‌بێ و ده‌فه‌وتێ و شوێنی خۆی بۆ ڕێباز و بیرۆكه‌یه‌ك یان چه‌ند ڕێباز و بیرۆكه‌یه‌كی دیكه‌ چۆڵ ده‌كات! [1]

*******************************

٥١٢. ئه‌و ڕێره‌وه‌ی سیكۆلاریزم زیاتر كه‌ سانێك له‌پشتیه‌وه‌ن و ئاراسته‌ی ده‌كه‌ن كه‌ تاڕاده‌یه‌كی زۆر له‌ ئیسلام نه‌شاره‌زا و بێ ئاگان بگره‌ هه‌ندێكیان بێجگه‌ له‌ قسه‌و ڕه‌خنه‌ی دوژمن و ناحه‌زانی ئیسلام شتێكی دیكه‌ی له‌باره‌وه‌ نازانن و به‌مانای وشه‌ له‌و باره‌وه‌ به‌نه‌خوێنه‌وار (أمی) له‌قه‌ڵه‌م ده‌درێن! [2]

*******************************

٥١٣.له‌ ئاكامی ئه‌و سیاسه‌ته‌ چه‌وته‌ی سیكۆلاریسته‌كانه‌وه‌ ژماره‌یه‌ك له‌ گه‌نج و لاوه‌كانمان به‌ هه‌ردوو ڕه‌گه‌زیانه‌وه‌ دووچار بۆ شایی یه‌كی فیكری و ڕووحی بوون و عه‌لمانی یه‌كان ڕێی ئیمان و ئیسلامیان لێ وه‌گرتوون و نه‌شیان توانیوه‌ به‌دیلێكی دیكه‌یان بده‌نێ و وه‌ك ده‌ڵێ له‌ هه‌ردووك دینان بوو ون! [3]

*******************************

٥١٤.فیكره‌ی ماركسیزم و كۆمۆنیزم لێره‌ دا ناڕوێ! میلله‌تی ئێمه‌ دینێكی ڕاست ته‌واو دروستی هه‌یه‌ و ماركسیزم كۆمۆنیزم كاتی خۆی له‌ كاردانه‌وه‌ی زوڵم و سته‌می ڕژێمی سه‌رمایه‌دایی دا په‌یدا بووه‌، به‌ڵام ئیسلام له‌ كاردانه‌وه‌ی هیچ شتێك دا په‌یدا نه‌بووه‌، به‌ڵكو به‌رنامه‌یه‌كه‌ و خوای په‌روه‌ردگار دایبه‌زاندوه‌ و په‌یوه‌ندیی به‌جیهانبینی و به‌ عه‌قیده‌وه‌ هه‌یه‌، به‌ عیباده‌ت و ئه‌خلاقه‌وه‌، به‌ حوكم و سیاسه‌ته‌وه‌، به‌ ئابووری و لایه‌نی كۆمه‌ڵایه‌تی یه‌وه‌ هه‌یه‌ و حه‌قیقه‌تێكی ڕه‌های خوایی یه‌ دایبه‌زاندووه‌ بۆ ڕێكخستنی ژیانی خه‌ڵك، به‌ڵێ ده‌ركردنی ئه‌م ڕاستی یه‌ یه‌كه‌م هه‌نگاوی چاره‌سه‌ره‌، كه‌ ئێمه‌ی میلله‌تی مسوڵمانی كوردستان ده‌بێ كلتوور و فه‌رهه‌نگ و سیاسه‌ت و حوكم و ڕه‌وشت و هه‌ڵس و كه‌وت و ... هتد مان هه‌ڵقوڵاوی دین و عه‌قیده‌ی ئیسلامی

---

[1] سه‌رچاوه‌ی پێشوو-لا-٣٢٧

[2] زنجیره‌ی بابه‌ته‌ هه‌نووكه‌ییه‌كان ئه‌ڵقه‌ی یه‌كه‌م گه‌نجه‌كانمان له‌نێوان ڕه‌سه‌نایه‌تی و لاسایی كردنه‌وه‌دا چاپی یه‌كه‌م -ساڵی ٢٠٠٦ ز -لا-١٢

[3] سه‌رچاوه‌ی پێشوو-لا-٦٣

مـان بێـت، نـەك شـتێكی دیكـە چـونكە بـە پێـچەوانەوە وێڕایـی ناشـەرعی و بـێ دینـی، دووچـاری حاڵەتێكی سەیر و سەمەرە و نامەنتیقیش دەبین كە بە هیچ پینەو پەڕۆیێك پاساو نادرێتەوە ![1]

******************************

٥١٥.ئێمە مەدحی ئیسلام ناكەین ئەگەر بڵێین: ئیسلام و دیموكراسی یەكن بەڵكو لە ڕاستی دا زەمی ئیسلام دەكەین و مەدحی دیموكراسی دەكەین![2]

******************************

٥١٦.هـەر ئـەو جـۆرە كەسـانە بـوون كـە دوێنـێ دەیـانگوت، ڕێبـاز تـەنها ڕێبـازی ماركسـیزم و سۆسیالیزمی عیلمی و كۆمۆنیزمەو، تاك و كۆمەڵ تەنیا بەو بەرنامەو ڕێ یـەدا بەختـەوەر دەبـێ و، هەر بەوێدا كۆمەڵگایەكی ڕێك و ڕاست و دروست دەبێ، كەچی ئەمڕۆ هەزار لەعنەتی لێ دەكەن !

ئـەمڕۆش دەڵـێن: نـەخێر ئینـسان ڕوو لەسـەرمایەداریی بكـات و ڕوو لـە دیموكراسـی و لیبڕالیـزم و سیكوڵاریزم بكات و، ڕێیەكانی دیكە هەموویان لار و خوار و هەڵەن، بەڵام دڵنیابن سبەینێ نـەفرین لەوەی ئێستاش دەكەن![3]

******************************

٥١٧.ئەگەر گوتمان ئیسلام دیموكراسی یە، مانای وایە چارەنووسی ئسلاممان لەگـەڵ دیموكراسـیدا لێك بەستووەو، هەركات دیموكراسی بەڵایەكی بەسەر هات بەسەر ئیسلامیش دێ ![4]

******************************

٥١٨.ئێمە با متمانەمان هەبێ بـە دینـی خـوای كاربـەجێ وەبـا دینـی خـوای باڵادەست و دادگـەر نەهێنین و بەو بەژن و باڵای بەرز و كەڵە گەتییەوە لەگەڵ بەژنی كورتە باڵای ئەو ڕێچكە و بیردۆزانە پێكی نەگرین و بەراوردی پێ نەكەین![5]



[1] سەرچاوەی پێشوو-ل-٦٨

[2] زنجیرەی بابەتە هەنووكەییەكان چوارەم -چۆنیەتی بوونە پێشەنگ و بنیاتنانی بنكەی جەماوەریی-چاپی یەكەم -ساڵی ٢٠٠٧ ز-ل -٤٨

[3] سەرچاوەی پێشوو-ل-٤٩

[4] سەرچاوەی پێشوو-ل-٤٩

[5] سەرچاوەی پێشوو-ل-٤٩

٥١٩.دیموكراسی كۆمه‌ڵێك شتی باشی تێدان با به‌ باشه‌كانی بڵێین باشه‌، به‌ڵام بائه‌وه‌ وامان لێ نه‌كات چاو له‌خراپه‌كانیشی بپۆشین، واشمان لێ نه‌كات ئیسلامی تێر و ته‌واوی خوای كاربه‌جێ له‌گه‌ڵ شتێك كه‌ زاده‌ی بیرو هۆشی ئینسانێك یاخود كۆمه‌ڵه‌ ئینسانێك پێكه‌وه‌ به‌راوردیان بكه‌ین وه‌ چاره‌نووسیان پێكه‌وه‌ لێك ببه‌ستین![1]

*******************************

٥٢٠.به‌داخه‌وه‌ ئێستا ئه‌وه‌ی خۆی زۆر به‌شاره‌زا ده‌زانێ له‌ عه‌لمانییه‌ كان له‌ ئاستی به‌رز و نزمیان دا تێگه‌یشتنێكی كلێساییان ده‌رباره‌ی ئیسلام هه‌یه‌ له‌ حالێك دا كه‌ ئیسلام زۆر دووره‌ له‌و مه‌فهووم و ته‌عریفه‌ كه‌ ده‌ڵێ دین ده‌وڵه‌تی تێدا نیه‌ و شه‌ریعه‌ت و سیاسه‌ت لێك جیان![2]

*******************************

٥٢١.زلهێزه‌جیهانخۆره‌كان به‌س هه‌تا ئه‌وه‌نده‌ دیموكراسیه‌تیان بۆ مسوڵمانان پێ باشه‌ و ڕه‌واجی پێ ده‌ده‌ن، تاده‌بێته‌ به‌دیلی ئیسلام و دوورخستنه‌وه‌یان له‌به‌رنامه‌ی خوا، به‌ڵام ئه‌گه‌ر هات و دیموكراسیه‌ت به‌هۆی هه‌ڵه‌یه‌كی هونه‌ری یه‌وه‌ بوو به‌هۆی هاتنه‌كایه‌ی حوكمی ئیسلامی و پیاده‌ كرانی شه‌ریعه‌تی خوا، ده‌بێ دیموكراسی قوربه‌سه‌ر له‌و حه‌دده‌ی پێشووی بوه‌ستێنرێ و شه‌ق و زلله‌یه‌كی باشیشی تێ بسره‌وێنرێ، چونكه‌ وادیاره‌ ئه‌و ئه‌ركه‌ی كه‌ پێی سپێرراوه‌ نه‌یزانی وه‌ ئه‌نجامی بدات و، خه‌ریك بووه‌ له‌"ڕێی ڕاست " لابدات![3]

*******************************

٥٢٢.گوشاركردن له‌ خه‌ڵك بۆ ئه‌وه‌ی بیرێ قبوڵ بكا، ئا ئه‌وه‌ خۆی له‌خۆیدا، كاكڵه‌ی تیرۆره‌![4]

*******************************

٥٢٣.بیردۆزه‌ی زاده‌ی بیرو هۆشی مرۆ، وه‌ك چۆن مرۆ ده‌مرێ ئه‌ویش ده‌مرێ، به‌ڵام شتێ له‌خواوه‌ سه‌رچاوه‌ی گرتبێ، چۆن خوای گه‌وره‌ ده‌مێنێته‌وه‌ ئه‌ویش هه‌رده‌مێنێ![5]

---

[1] سه‌رچاوه‌ی پێشوو-ل-٥١

[2] زنجیره‌ی بابه‌ته‌ هه‌نوكه‌ییه‌كان ئه‌ڵقه‌ی شه‌شه‌م-چه‌ند بنه‌مایه‌كی گرنگی وتار بێژی -چاپی یه‌كه‌م ساڵی ٢٠٠٧ -ل-٥٣-٥٤

[3] چه‌ند ڕێڕوونی یه‌ك بۆ ئیسلامی یه‌كانی كوردستان -چاپی یه‌كه‌م -ساڵی ١٩٩٧ ز-ل -٨٧

[4] سنوره‌قه‌ده‌قه‌كان مه‌شكێنن- ده‌قی گفتوگۆیه‌كه‌ دكتۆر حوسێن محمد عزیز له‌گه‌ ماموستادا ئه‌نجامی داوه‌ -چاپی دووه‌م -ل -١٠٣

[5] سه‌رچاوه‌ی پێشوو-ل-١١٠

٥٢٤.ئینسان لەهەر کات و جێ یەکدا هیدایەت و بەرنامەی خوا بزر بکات، چاری ناچارە کە هەوڵ بدات بەهەر شێوەیەك بووە ئەو کەلێن و بۆشایی یە پڕبکاتەوەو بەرنامەو پەیڕەوێك بۆ خۆی دابنێت ![1]

*******************************

٥٢٥.ئەگەر بوونی خوای پەروەردگار و هیدایەت و بەرمەکەی لەگۆڕێ دانەبێ، لە جەنگەڵ و چخوردی نەفامانەی بیردۆزەو ڕژێمە مرۆڤکردەکان دا (دیموکراسی ) لە هەموان ویووترو لەبارترەو لە هەقەوە نیزیکترە، بەڵام هەقیش نیە ![2]

*******************************

٥٢٦.دیموکراسی چ بەشێوەی سادە و سەرەتایی – یەکەی سەردەمی یۆنانی و ڕۆمانەکانی و، چ بە بیمچی نوێ و تازەی ئێستای، پێدا ویستی ژیان و گوزەرانی کۆمەڵگایەکی لەبەرنامەی ڕاست و ساغی خوا بێ هەواڵ هێناویەتەدی و، درەختێکی میوەو بەرتاڵە کە لە زەمینەی بەتاڵ و حەتاڵی بۆشایی فیکری (الفراغ العقائدی) خەڵکێکی بێ بەرنامە و سەرگەردان دا ڕوواوەو خەملاوە ![3]

*******************************

٥٢٧. بەداخەوە چەپەکانمان (لەلای چەپەوە ) دەستیان پێ کردووە و ئیستا نەگەیشتوونەتە لای (ڕاست ) هەوڵیان داوە لە هەموو ڕێچکەو بیردۆزەیەك بگەن، بەڵام لە ئایینی گەلەکەیان بێ خەبەرن، هەر بۆیەش بەپێی پەندی (الناس اعداء ماجهلو )بە ئیسلام نامۆو نا ئاشنان و لەپاش پەردەی ڕەشەوە سەیری دەکەن ![4]

*******************************

٥٢٨.ئەگەر لەسیستەمی سەرمایەداری دا کۆمەڵ بەقوربانی تاك دەکرێ، تاك بەکەیفی خۆی هەڵس و کەوت دەکات بۆ دابین کردنی بەرژەوەندی یەکانی بێ گوێ دانە بەرژەوەندی یەکانی کۆمەڵ، وەئەگەر لەسیستەمی سوسیالیزمی دا کۆمەڵ–کە لە چینی پرۆلیتاریادا خۆی دەنوێنێ –تاك دەکرێتە بەلاگێڕی و لەژێر پێی بەرژەوەندییەکانی دا دەپلیشێنرێتەوە و لەسەر بنەمای فەلسەفەی

---

[1] چارەسەری کێشەی کورد لە نێوان ئیمان و پەرلەمان دا –چاپی یەکەم –ساڵی ١٩٩٢ ز ––ل–٢٨

[2] سەرچاوەی پێشوو–ل–٢٩

[3] سەرچاوەی پێشوو–ل–٢٩–٣٠

[4] گۆڤاری ئەزموون ژمارە (٣)–ل–٢٠

دژایەتی و ناکۆکی چینەکان (صراع الطبقات) چین و توێژەکانی کۆمەڵگا بەردەدرێنە گیانی یەکتر لەسیستەمی سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتی ئیسلام دا تاك و کۆمەڵ لەسەر بناغەی، برایەتی و یەکتر خۆشویستن و بەپێی تەرازوویەکی دادگەرانە دەستیان پێ دەکرێتە ملی یەکتر و توێژەکانی کۆمەڵگاش لە جیاتی لە یەکتر بەردان و لەیەکتر هارکردنیان بۆ هاوکاری و دەستبار بۆ یەکترگرتن هان دەدرێن و بەشێکی زۆری ئەو هاوکاری و برایەتی و دەستبار بۆ یەکتر گرتنەشیان وەك ئەرکێك لەسەر پێویست دەکرێ و لەسەر کەم تەرخەمی تێداکردنی دووچاری لێپرسینەوە و سزاو تۆڵەش دەبن![1]

******************************

٥٢٩.ناتوانم جیاوازی نەکەم لە نێوان دوو عەلمانیدا یەکێکیان گۆشەیەکی لەڕۆژنامەیەکدا بۆ دیاری کراوە و دەبێ پڕی بکاتەوە لەگەڵ یەکێکی تر کە بە عەقڵ و لۆژیك شتەکان هەڵدەسەنگێنێ![2]

******************************

٥٣٠.دیموکراسی وەکو سیستەمی حوکم لەگەڵ یاساکانی شەرعدا خاڵی بە یەکگەیشتنیان لە نێواندا هەیە، لە سیستەمە دەستکردەکاندا لە هەموویان ئیجابیاتی زیاتری تێدایە ![3]

******************************

٥٣١.دڵنیام کە ئەم شەپۆل و تەوژمی سیکۆلاریزم و لیبڕالیزم و دنیاگەرایی و ماددە پەرستی یەی ئێستاش سەرەنجامی هەروەك شەپۆل و تەوژمی ماکسیزم و کۆمۆنیزمەکەی ڕابردوو دەبێ و هێندەی پێناچێ بازاڕی ئەمیش دەشکێ و لەبرەو دەکەوێ ، بەڵام بێگومانیش وەك چۆن کاتی خۆی گەلێك کەس لە زۆنگاوی مارکسیزم دا خنکان و لەبیابانی کۆمۆنیزم دا سەریان بەفەتارەت چوو، زۆنگاوو گێژاوی سیکۆلاریزم و لیبڕالیزمیش خەڵکێك سەری تێیان دا بەفەوتان دەچێ![4]

---

[1] مسوڵمانی کامڵ -بەشی دووەم خواپەرستی مسوڵمان -بەرگی دووەم -چاپی یەکەم -ساڵی ٢٠٠١ز-لا - ٢٣٧

[2] گۆڤاری پەیامی ڕاستی ژمارە (٧٦)ساڵی ٢٠٠٦ز دیداری ڕۆژنامەنوسیی لا-٣٩

[3] ڕۆژنامەی کۆمەڵ ژمارە ١٩٨-لا-٢

[4] زنجیرەی بابەتە هەنوکەییەکان ئەڵقەی سێیەم( بەدوورخستنەوەی ئافرەت لەئیسلام چ زیانێك دەکەین) چاپی یەکەم -ساڵی ٢٠٠٧ ز-٧-٨

٥٣٢.ئینسان کائینێکی ھاڵۆز و پڕوردەکاری یەوە و ھەر لەلایەنێك و دوان پێك نەھاتوە و ناشتوانرێ تەنیا لە گۆشەنیگای لا یەنێکی یەوە بنرخێنرێ، بەڵکو تەفسیر کردنی ئینسان تێڕوانینێکی گشتی و ھەمەلایەنەی گەرەکە، ئەو جۆرە تێڕوانینەش بێجگە لەخوای ئینسان لەژێر ڕکێفی کەس دا نیە ![1]

******************************

٥٣٣.مادام ھەموو پەیدا بوویەك پێویستی بەپەیدا کەر ھەبێ، کەواتە ئەم بوونەوەرەش کە لەچەند شتێکی پەیدابوو پێکھاتوە، پێویستی بە بەدیھێنەر و پەروەردگارێك دەکات ![2]

******************************

٥٣٤.مادام ھەریەك لەو بەشانەی کە خانویەکیان لێ پێك دێ حەوجێی وەستایەك بن، ماقوول نیە بگوترێ خانووەکە یەکی لەسەر وەستا نەکەوتوە ![3]

******************************

٥٣٥.مرۆڤایەتی لە قۆناغی سەرەتاییدا ھەرچەندە زۆر سادە و ساکار بووبێ ھێندەی منداڵێکی چوار پێنج ساڵەی ئێستا بیرو ھۆش و لێکدانەوەی ھەر ھەبووە، کە پاڵی پێوە بنێ و بترسێ و بگەڕێ و بپشکنێ و بەدوای ھۆی پەیداوونی دیاردە و ڕوداوەکاندا بگەڕێ و، لەسەرچاوەی بوون (مصدر الوجود) ی خۆی و دەوروبەری بکۆڵێتەوە ![4]

******************************

٥٣٦.گەڕان بەدوای شتێکی نابەرھەست لەنێو جیھانێکی بەرھەست دا، ھەڵوێستێکی نا ماقووڵەو، لەوەش ناماقوڵتر ئەوەیە کەحوکمی نەبوون بەسەر شتێکدا بدەی بێ ئەوەی لەڕێی سروشتی و گونجاوی خۆیەوە ھەوڵی دۆزینەوەیت دابێ ![5]

******************************

---

[1] پوختەیەك دەربارەی ئیسلام لەبەر ڕۆشنایی سورەتی فاتیحە دا –چاپی دووەم –لا –٣٠٨

[2] خواناسیی ئایین ئیمان –ڕاستییەکان ئیسلام دەدرەوشێنەوە ئەفسانەکانی ڕیچکان دەپووچێنەوە–چاپی یەکەم ساڵی ٢٠٠٠ زلا– –٦٣

[3] سەرچاوەی پێشوو لا–٦٣

[4] سەرچاوەی پێشوو لا–٦٤

[5] سەرچاوەی پێشوو لا–٧٠

٥٣٧.ئەوشتەی کە پەیوەندی نێوان پەیداکەر و پەیداکراو(العلة والمعلول ) لە جۆرە پەیوەندییەکانی دیکە جودا دەکاتەوە، ئەوەیە کە هەرکام لە پەیوەندییەکانی دیکە لەنێوان دووشتی لێك جودا پەیدا دەبێ و، ئەو دووشتە لێك جوێیە پێکەوە دەبەستێ، بۆ وێنە پەیوەندی نێوان مامۆستا و قوتابی، فرۆشیار و کڕیار، پزیشك و نەخۆش، لێخور و ئۆتۆمبێل ...هتد دەبینین هەرکام لە مامۆستا و فرۆشیار و پزیشك و لێخور لەلایەك و قوتابی و کڕیار و نەخۆش و ئوتومبێل لەلایەکی دیکەوە بوونێکی زاتیی سەربەخۆیان هەیەو، بۆ پەیدابوونیان حەوجێی بەرامبەرەکەیان نین، بەڵام (نووسەر و کتێب) کە لە نێوانیان دا پەیوەندییەکی هۆکاری هەیە پەیوەندییەکەیان جۆرێکی دیکەیە، چونکە لەسۆنگەی ئەوەوە کە (نووسەر ) دروستکەر و پەیداکەر (علّة)ی (کتێب)ەو کتێب بەهەم و پەیدا کرا و (معلول) یەتی، کتێبەکە وەك نووسەرەکە خاوەنی بوونێکی زاتیی و سەربەخۆ نیە، بەڵکو بوونی خۆی لە بوونی نوسەرەکەوە دەستگیر کردووە و ئەگەر ئەو نەبوایە چاوی بەدنیایە هەڵنەدەهێنا و، لەدەریایی نەبووندا سەری دەرنەدەهێنا ![1]

*******************************

٥٣٨.ئەم بونەوەرەی ئێستا دەبیینین بەم شێوە و دیمەنەی کە لەسەریەتی، خاوەنی بوونێکی زاتیی و سەربەخۆ نییە، چونکە کاتێك بووە کە نەبووە و دوایی پەیدا کراوە ئنجا هەر شتێکیش خاوەنی بوونێکی زاتیی نەبێ، پێویستی بە بەدیهێنەر هەیەو، بەبێ بەدیهێنەر مەحاڵە بێتەدی، کەواتە ئەم بونەوەرە نیشانەو بەڵگەی خوایەکی بەدیهێنەرە، کە خاوەنی بوونێکی زاتیی و ڕەسەن و تەواوە، حەوجێی هیچ شتێك نیەو ،هەموو شتێك حەوجێی ویە چونکە سەرچاوەی بوونە ! [2]

*******************************

٥٣٩. بابایەك بۆ پەیدا بوون و هاتنە دی (قشپل) ێك ناچار بڵێ: ناچارم بڕوا بەحوشترێك بێنم، بەڵام بۆ دروست بوون و پێکهاتنی یەك (ئینسان) کە هێندەی گەردێکە لە بونەوەردا بڵێ ناچارم

---

[1] سەرچاوەی پێشوو لا-٨٥

[2] سەرچاوەی پێشوو لا-٨٦

نیم بڕوا بەدیهێنەرێك بێنم، هێندەی یەك (قشپل) لە عەقڵ و ویژدان، یەكێكیان یان هەردووكیانی نیە![1]

*******************************

٥٤٠.بەداخەوە زۆر لە مسوڵمانان لەو ڕاستیەیە باش حاڵی نەبوون و نازانن كە ئیسلام بەر هەرشتێك بریتیە لە جیهان بینینی و تێڕوانینی ڕاست و دروست![2]

*******************************

٥٤١.پێویستە باش بزانرێ كەمل كەچ بوون بۆ خوای پەروەردگار (سبحانه وتعالى) هەر بەشتێك و دووشتان تەواو نابێ، بەڵكو دەبێ سەرەتا جیهانبینی و تێڕوانینی دەربارەی خوای بەدیهێنەر ( جلّ وعلا) و دەربارەی بوون (الوجود) بەو شێوەیە بێ كە خوای پەروەردگار لە كتێبی خۆیدا ڕوونی كردوّتەوە و پێغەمبەرەكەی (ﷺ) لە سوننەتی خۆیدا نیشانی داوین، هەروەها دەبێ بەو شێوەیە پێناسەی خوّت (مرۆڤـــ) بكەی كە خوای پەروەردگار فەرموویەتی، وە بەو شێوەیە بڕوانیە ژیان كە خوای پەروەردگار خستوویەتەڕوو، وە بەوشێوەیە تەماشای دۆست و دوژمن و حەڵاڵ و حەرام و چاك و خراپ و ڕاست و هەڵە بكەی كە كتێبی خوا فەرموویەتی![3]

*******************************

٥٤٢.بووناسی: بریتیە لەوەی كە مرۆڤـ خۆی و دەوروبەر و بوونەوەر و خوای بەدیهێنەر و خاوەنی بناسێ و، حیكمەتی دروستكرانی خۆی و بوونەوەر و ئاكام و سەرەنجامیان بزانێ و، لەسەر گوزشتەو بەسەر هاتی ژیانی دنیا تێ بگات و، لێی حاڵی ببێ، ئایا چ پایەو پلەیەكی لەبوونەوەردا هەیە و (مَحلّ الآعراب) ی چیەو چۆنە؟![4]

*******************************

٥٤٣.ئنسان چۆن بیربكاتەوە ئاواش ڕەفتار دەكات![5]

---

[1] خواناسیی ئاینی ئیمان –ڕاستییەكان ئیسلام دەدرەوشێنەوە ئەفسانەكانی ڕێچكان دەپووچێنەوە–چاپی یەكەم ساڵی ٢٠٠٠ ز–لا– ٨٩

[2] ئیسلام و مسوڵمانەتی و كاری ئیسلامیی لە بەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەت دا –چاپی یەكەم–ساڵی ٢٠٠٦ ز لا–٣٠

[3] سەرچاوەی پێشوو لا–٤٨

[4] تەوژمی ئیسلامی و عەلمانی خاڵە هاوبەش و جیاوازەكانیان–چاپی یەكەم –ساڵی ٢٠٠٨ ز– لا–٢٧

[5] سەرچاوەی پێشوو–لا–٢٨

٥٤٤.به‌بێ بوونناسیه‌كی ڕاست و دروست بیروبڕوای ڕاست و دروست په‌یدا نابێ، به‌ڵام ده‌گونجێ مرۆڤ بوونناسیی و دنیابینی یه‌كی ڕاستی هه‌بێ، كه‌چی خاوه‌نی بیرو بڕوایه‌كی پووچ و هه‌ڵه‌بێ![1]

*******************************

٥٤٥.له‌ڕاستی دا مه‌سه‌له‌ی خواناسیی (معرفة الله) دا، دان به‌بونی خوادا هێنان چه‌نده گرنگه، ناسینیشی به‌شێوه‌یه‌كی ڕاست و دروست هێنده گرنگه، چونكه به‌بێ ناسینی خوا (عزَّ وجل) به‌شێوه‌یه‌كی ڕاست و دروست و له‌به‌ر ڕۆشنایی ناوو سیفه‌ته هه‌ره چاك و په‌سه‌نده‌كانی دا، دانپێداهێنانی بونه‌كه‌ی– كه له‌خودی خۆیدا شتێكی خوارسكه – هیچ به‌رهه‌مێكی ئه‌و تۆی نیه له ژیانی مرۆڤدا و نابێته هۆی په‌یدابوونی هیچ گۆڕانكارییه‌كی ئیجابی![2]

*******************************

٥٤٦.مرۆڤ زۆر له‌وه بچوكتره كه وه‌ك پێویست نه‌ك هه‌ربوون (وجود) به به‌دیهێنه‌ر و به‌دیهێنراو (خالق و مخلوق)ه‌وه، بگره ته‌نانه‌ت خۆیشی بناسێ و په‌ی به‌نهێنی یه‌كانی ببات![3]

*******************************

٥٤٧."عه‌قڵ" بوونی خوا به پێویست ده‌زانێ و ده‌ڵێ ناگونجێ به‌دیهێنراوێكی ڕێك و پێك (مخلوق منظَّم) هه‌بێ و به‌دیهێنراوێكی ڕێكخه‌ر (خالق منظِّم)ی نه‌بێ، به‌ڵام په‌یدابوون و بوونی بوونه‌وه‌ر به‌هه‌موو پێكهاته كانییه‌وه به شتێكی گونجاو (ممكن) ده‌زانێ، چونكه ده‌گونجا نه‌بێ![4]◆

*******************************

٥٤٨.تێڕوانین بریتی‌یه له چۆنیه‌تی ناسینی بوون (كيفية معرفة الوجود)، به‌ڵام بیروباوه‌ڕ بریتی یه له‌جۆره هه‌ڵوێستێك ده‌رباره‌ی بوون![5]

---

[1] سه‌رچاوه‌ی پێشوو–لا–٢٨

[2] سه‌رچاوه‌ی پێشوو–لا–٤٩

[3] سه‌رچاوه‌ی پێشوو–لا–٥٢–٥٣

[4] سه‌رچاوه‌ی پێشوو–لا–٥٧

◆ به‌ڵێ هاتنه‌دی دروستكراوه‌كان له خودی خۆیانادا، له‌گه‌ل هاتنه‌دی یان، یه‌كسانن و ئه‌گه‌ر خوای به‌دیهێنه‌ر –عزوجل– ویستی له‌سه‌ر بوو بێنه‌دی دروستیان ده‌كات و، ئه‌گه‌ر نه‌شیویست هه‌ر له‌حاڵه‌تی نه‌بوون (عَدَم) دا ده‌مێنێته‌وه !

[5] پڕۆژه‌ی به‌رنامه‌ی فكری كاریی ئیسلامیی–چاپی یه‌كه‌م –ساڵی ١٩٩٦ ز–لا–٣٩

٥٤٩.یا خوا(صلاح الدین) بە بەهەشتی بەرین شادبی، بۆو خزمەتی کردت بە ئایینی ئیسلام و گەلی کورد، چونکە تۆ سەری ئیسلامت بەکورد و سەری کوردت بەئیسلام بەرز کردەوە ![1]

*******************************

٥٥٠.خوای پەروەردگار و بەخشندە یامەتی ئەوانە بدات کە هەتا ئێستا زەوی دڵ و دەروونیان بە مەبەستی پەیدابوون و چەسپاندنی بڕوا بە خوا بوون پاك نە کردۆتەوە و هەڵنەوێژراوە، ناوی خوای لێ بێنن و لە جومالّ و پاککردنەوەی سەرچاوەی کوێربوەوەی دەروونیان وەخۆ بکەون، وە ئەوانەش سوپاس بۆ خوا – قۆناغی جومالّ و خاوێن کردنەوەی دڵ و دەرونیان بڕیوە و لێی هەڵبڕدوون، لە خوای پەروەردگار و چاکەکار داواکارین هێندە لە یادی مردن و گۆڕ و گۆڕەپان داو خوێندن و موتالای قورئاندا وریاو بەکارو لە بڕشت بن، کە هەتا ماست ڕەش نەبێ و قیرسپی نەبێ و گا بەکونی دەرزییەوە نەچێ، بە تیری وەسوەسەی شەیتان موو لە بڕوایان نە لەخشێ و، قەڵای بەرزی خواناسییان تاقە بەردێکی نەشجوڵێ چ جای بشکێ! ئامین[2]

*******************************

٥٥١.هەر مسوڵمانێك بەتەمای سەرفرازی و لەخەم ڕەخسین و بەختەوەربوون بێ، دەبێ کەم و زۆر پشك و بەشی لە تەزکیەدا هەبێ، ئەگەرنا بەمەردەی ئەو کەسە دەچێ، کە بەبێ مەلەزانین، خۆی بەدەریایە دەدات، یان بەگیرفانی خاڵی کەل و پەلی کڕین سەودا دەکات![3]

*******************************

٥٥٢.تەزکیە و ئیحسان ئەوە هیچ کە دوو ناون بۆ یەك حەقیقەت، شتێکی زیادەش نین لە ئیمان و ئیسلام![4]

*******************************

---

[1] سۆزی نەتەوایەتی و بیری ناسیۆنالیزم لەتەرازوی ئیسلام دا – چاپی یەکەمی نوسینگەی تەفسیر –ساڵی ٢٠٠٥ز–لا–١٥١

[2] خواناسیی ئایین ئیمان ڕاستیەکانی ئیسلام دەدرەوشێنەوە ئەفسانەکانی ڕێچکان دەپووچێنەوە –چاپی یەکەم –ساڵی ٢٠٠٠ ز–لا–٤٢٦

[3] ڕێگای صالح بوون و بەرەو خواچوون –تەزکیەی نەفس لەبەر رۆشنایی قورئان و سوننەتدا – چاپی سێیەمی – نوسینگەی تەفسیر ساڵی–٢٠٠٥–لا–٧

[4] سەرچاوەی پێشوو لا–٣٢

٥٥٣.تەزکیەی نەفس* ئیسلام و تاعەت لە حاڵەتی هەست بە قورسی کردن و (تكلف) ەوە دەگۆڕێ بۆ حاڵەتی چێژ لێ وەرگرتن و (تشرّف)![1]

*******************************

٥٥٤. تەزکیەی نەفس عەقڵ و دڵ لە حاڵەتی پـرژو بڵاوی و سەرقاڵییەوە دەگۆڕێ بۆ حاڵەتی کۆبوونەوە و خۆشحاڵی ![2]

*******************************

٥٥٥.خوایە من لە هەموو ئەو تاوان و خراپانەوە زۆری دیکەش کە من لە یادم نەماون یان هەرنەم زانیون، کردوومن و لێیان پەشیمانم و دان بەهەڵەو ناتەواویی خۆم دا دێنم ،بەڵام لێم ڕوونە کە تاوان و خواپەکانم هەرچەندە زۆر بن، لێبوردوردنی تۆ زۆرترە و، هەرچەندە گەورەبن، بە زەیی تۆ مەزنترە، جا خوایە داوای لێبووردن و چاو پۆشیت لێ دەکەم و تۆش نائومێدم مەکەو بەلوتف و بە زەیی خۆت بمبـوورە، چونکە ئەگەر منیش شیاوی بەخشرا نەبم، تۆ شایستەی لێبـوردن و بەخشینی ![3]

*******************************

٥٥٦.با هیچ کەس بەتەما نەبێ بەلاف و لێدانی ڕووت و ناو لەخۆنانی بێ نێوەڕۆك دەست بگەیەنێتە پلەو پایەی تەزکیە بوون، بەڵکو کێ لەو هەقە کە خوا بەپێغەمبەری خۆی دا (ﷺ) ناردوویەتی شارەزاتر بێت و پێ یەوە پابەندترو بۆی گەردەن کەچ تر بێت، ئەوە نیشانەی تەزکیە تر بوونیەتی، بە پێچەوانەشەوە هەر کەسێك بەهەق نا ئاشناترو لێی دوورتر بێت، ئەوە زیاتر شایەدی نا تەزکیە بوون لەسەر خۆی دەدات![4]

*******************************

---

* ئەوەی خەتی بەژێر داهاتووە خۆم بۆم زیاد کردووە ،چونکە سیاقی ووتەکە دەیخوازێ پاشان هیچ لەواتای وتەکە ناکۆڕێ ، بەڵکو تەواوتری دەکات وە وتەی ژمارە ٢٣٤ یش بەهەمان شێوە . ئامادەکار

[1] سەرچاوەی پێشوو ل-٣٣

[2] سەرچاوەی پێشوو ل-٣٣

[3] سەرچاوەی پێشوو ل-٤١

[4] سەرچاوەی پێشوو ل-١٨٣

٥٥٧.هەموو پارێزکارێك دۆستی خوایە، هەموو دۆستێکی خواش خاوەن ڕێزو کەرامەتە، کەواتە هەموو پارێزکارێك خاوەن کەرامەتە ![1]

*******************************

٥٥٨.حەیفە ئەهلی دڵ ببنە دار دەست و وابەستەو دا بەستەی ئەهلی گڵ![2]

*******************************

٥٥٩. ئینسان بەبێ ئیمان ڕێ ی چوونە بە هەشتی نیە، بەڵام بۆ چوونە بەهەشت لەسەر تەزکیە و تەصەوف پەك ناخرێ، کەواتە: ئیمان بەدیلی تەزکیەیە، بەڵام تەزکیە بەدیلی ئیمان نیە ![3]

*******************************

٥٦٠.تەزکیەی نەفس بەشێکی ئیسلام و لایەنێکی مسوڵمانەتی یەو ئیسلامەتیش جگە لە قورئان و سوننەت و مسوڵمانەتیش جگە لە پابەندیی پێیانەوە شتێکی دیکە نین![4]

*******************************

٥٦١.تەصەوف نە لە ئیسلام جیایە و نەهەموو ئیسلامەتیشی تێدایە، وەمسوڵمانەتی و دینداری ڕاست و ساغیش بەبێ تەزکیە نایەتەدی، بەڵام لە تەزکیەش دا کورت هەڵنەهاتوە ![5]

*******************************

٥٦٢.پێشەوایانی تەزکیە و تەصەووف جگە لە ڕێبازی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێچکەیەکی دیکەیان دا نەهێناوە ![6]

*******************************

٥٦٣.خوایە تۆ دەوڵەمەندی و ئێمەش نەدار، بەخششی تۆ بێ سنوورە و ئێمەش تا بڵێی ئاتاج، سا بەکەرەم و لوتفی بێ وێنەی خۆت هێندەمان لە بەزەیی و بەخشش و بەرەکەتی خۆت بەسەردا برێژە تاکو لە غەیری خۆتمان بێ منەت و بێ نیاز دەکەی و، پڕ بەدڵ دەڵێین: ئۆخەی ![7]

---

[1] سەرچاوەی پێشوو لا-١٩٧

[2] سەرچاوەی پێشوو لا-٢٢٠

[3] سەرچاوەی پێشوو- لا-٢٣١

[4] سەرچاوەی پێشوو- لا-٢٣١-٢٣٢

[6] سەرچاوەی پێشوو- لا-٢٤٤

[7] زنجیرە دەرسی ئیمان و عەقیدەی ئیسلامی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەت دا بەرگی یەکەم /ئیمان و عەقیدەی ئیسلامی چیەو چۆنە- چاپی یەکەم ساڵی ٢٠٠٧ز -لا-٩

٥٦٤.خودایە! ئەی پەروەردگاری میهرەبان و بەخشەر! ئەی دەروو کەرەوەی یامەتی دەر! بە لوتف و کەرەمی خۆت دەستمان بگرە و ڕێنماییمان بکە و سەرکەوتوومان بکە، کە بە هۆی بەندایەتی کردن بۆ تۆوە خۆمان واڵێ بکەین و شایستەی ئەوە بین جێگای ڕەزامەندی تۆ بین و بتوانین هەموو قۆناغەکانی کارو خەباتی ئیسلامی ببڕین و، هەموو پلەو حاڵەتەکانی هەڵ بوێرین، هەتا لە ژیانی دنیاماندا ئامانجی بەرزی (بەرپاکردنی ئایین) جێبەجێ دەکەین و لە دوارۆژیش دا بە باڵاترین (مەبەست) دەگەین کە ڕەزامەندی دیداری خوا و بەهەشتی ڕازاوە و نەبڕاوەیە، تاکو بەختەوەری ئێرەو سەرفراز و بەمراد گەیشتووی ئەوێ بین... ئامین![1]

*******************************

٥٦٥.ئەی خوای پەروەردگارمان! ئێمەش کە شوێن کەوتە و پەیڕەوانی پێغەمبەری تۆین ئەو چی لێ داواکردوی ئێمەش لێت داوا دەکەین، ئومێدەواریشین چیت بەو بەخشیوە لە قەدەر خۆی ئەوەش لە قەدەر ئێمە ببەخشی، خۆ ئەگەر خۆشمان شایستەی ئەوەمان نەبێ مەگەر بەندەی تۆو ئوممەتی ئەو نین!! دەجا خوای پەروەردگار بمانخە بەر ڕێژنەی ڕەحمەت و لوتفی خۆت و سایەی شەفاعەتی ئەوەوە قەت قەت ڕەحمەت و لوتف و کەرەمی خۆتمان لێ دوور مەخەرەوە ..ئامین![2]

*******************************

٥٦٦.خوا بەکەرەم و لوطفی بێ سنووری زانیاری و شارەزایی یە کەمان بکاتە بەڵگەی دەستمان بەسەر خەڵکەوە، نەك بەڵگەی خەڵك بەسەرمانەوە، وە ئێمەش بکاتە بەڵگەی خۆی و بەرنامەکەی بەسەر خەڵکەوە، نەك باربین بەسەر ئیسلامەوە و بیانوو و بەڵگەی خەڵك بین بەسەر ئیسلامەوە![3]

*******************************

٥٦٧.خوایە بەکەرەمی خۆت لە نەزانی بمانپارێزە و، لەوەش خراپتر لەکار و ڕەفتاری نەزانانە و نەشارەزایانە بمانپارێزە![4]

*******************************

---

[1] پرۆژەی بەرنامەی فکری کاریی ئیسلامیی - چاپی یەکەم -ساڵی ١٩٩٦ ز-ل-٩

[2] سەرچاوەی پێشوو-ل-٢٤٧

[3] چەند بنەمایەکی گرنگی وتار بێژیی -چاپی یەکەم -ساڵی ٢٠٠٦-ل-١٤

[4] جیهاد لەڕێی خوادا چی یەو؟! بۆچی دەکرێ و؟! چۆن دەکرێ و؟! چەند قسەیەکی دڵسۆزانە بۆ حوکمڕانەکانی کوردستان-چاپی یەکەم -ساڵی ٢٠٠٢ ز-٣٤

٥٦٤.خودایه! ئه‌ی په‌روه‌ردگاری میهره‌بان و به‌خشه‌ر! ئه‌ی ده‌روو که‌ره‌وه‌ی یامه‌تی ده‌ر! به لوتف و که‌ره‌می خۆت ده‌ستمان بگره و ڕێنماییمان بکه و سه‌رکه‌وتوومان بکه، که به هۆی به‌ندایه‌تی کردن بۆ تۆوه خۆمان والێ بکه‌ین و شایسته‌ی ئه‌وه بین جێگای ڕه‌زامه‌ندی تۆ بین و بتوانین هه‌موو قۆناغه‌کانی کارو خه‌باتی ئیسلامی ببڕین و، هه‌موو پله‌و حاڵه‌ته‌کانی هه‌ڵ بوێرین، هه‌تا له ژیانی دنیاماندا ئامانجی به‌رزی (به‌رپاکردنی ئایین) جێبه‌جێ ده‌که‌ین و له دوارۆژیش دا به باڵاترین (مه‌به‌ست) ده‌گه‌ین که ڕه‌زامه‌ندی دیداری خوا و به‌هه‌شتی ڕازاوه و نه‌بڕاوه‌یه، تاکو به‌خته‌وه‌ری ئێره‌و سه‌رفراز و به‌مراد گه‌یشتووی ئه‌وێ بین... ئامین![1]

*******************************

٥٦٥.ئه‌ی خوای په‌روه‌ردگارمان! ئێمه‌ش که شوێن که‌وته و په‌یره‌وانی پێغه‌مبه‌ری تۆین ئه‌و چی لێ داواکردوی ئێمه‌ش لێت داوا ده‌که‌ین، ئومێده‌واریشین چیت به‌و به‌خشیوه له قه‌ده‌ر خۆی ئه‌وه‌ش له قه‌ده‌ر ئێمه ببه‌خشی، خۆ ئه‌گه‌ر خۆشمان شایسته‌ی ئه‌وه‌مان نه‌بێ مه‌گه‌ر به‌نده‌ی تۆو ئوممه‌تی ئه‌و نین!! ده‌جا خوای په‌روه‌ردگار بمانخه به‌ر ڕێژنه‌ی ڕه‌حمه‌ت و لوتفی خۆت و سایه‌ی شه‌فاعه‌تی ئه‌وه‌وه قه‌ت قه‌ت ڕه‌حمه‌ت و لوتف و که‌ره‌می خۆتمان لێ دوور مه‌خه‌ره‌وه ..ئامین![2]

*******************************

٥٦٦.خوا به‌که‌ره‌م و لوطفی بێ سنووری زانیاری و شاره‌زایی یه که‌مان بکاته به‌ڵگه‌ی ده‌ستمان به‌سه‌ر خه‌ڵکه‌وه، نه‌ك به‌ڵگه‌ی خه‌ڵك به‌سه‌رمانه‌وه، وه ئێمه‌ش بکاته به‌ڵگه‌ی خۆی و به‌رنامه‌که‌ی به‌سه‌ر خه‌ڵکه‌وه، نه‌ك بارببین به‌سه‌ر ئیسلامه‌وه و بیانوو و به‌ڵگه‌ی خه‌ڵك بین به‌سه‌ر ئیسلامه‌وه![3]

*******************************

٥٦٧.خوایه به‌که‌ره‌می خۆت له نه‌زانی بمانپارێزه و، له‌وه‌ش خراپتر له‌کار و ڕه‌فتاری نه‌زانانه و نه‌شاره‌زایانه بمانپارێزه![4]

*******************************

[1] پرۆژه‌ی به‌رنامه‌ی فکری کاریی ئیسلامیی - چاپی یه‌که‌م -ساڵی ١٩٩٦ ز-ل-٩

[2] سه‌رچاوه‌ی پێشوو-ل-٢٤٧

[3] چه‌ند بنه‌مایه‌کی گرنگی وتار بێژیی -چاپی یه‌که‌م -ساڵی ٢٠٠٦-ل-١٤

[4] جیهاد له‌ڕێی خوادا چی یه‌و؟! بۆچی ده‌کرێ و؟! چۆن ده‌کرێ و؟! چه‌ند قسه‌یه‌کی دڵسۆزانه بۆ حوکمڕانه‌کانی کوردستان-چاپی یه‌که‌م-ساڵی ٢٠٠٢ ز-٣٤

٥٧٣.تەزکیەی نـەفس بەشـێکە لـە سـەلەفییەت و لەلایـەکی دیکەشـەوە پـەیڕەوی کـردن و شـوێن کەوتنی سەلەفی صالحمان بەبێ نەفس تەزکیە بوون مسۆگەر نابێ![1]

******************************

٥٧٤.ئەگەر بتەوێ شوێن کەتووی سەلەفی صالح بی دەبێ خاوەنی تەزکیەبی، وە ئەگـەر بـشتەوێ تەزکیەی نەفست دەست بکەوێ پێویستە ڕێبازی سەلەفی صالح بگرێ و بەموو لێی لانـەدەی هـەتا بەمراد و مەنزڵ دەگەی ![2]



[1] ڕێگای صالح بوون و بەرەو خوا چوون–تەزکیەی نەفس لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا چاپی یەکەمی نوسینگەی تەفسیر –لا–٢٤٨

[2] سەرچاوەی پێشوو–لا–٢٤٨

٥٧٥.بەهیچ جۆرێك ئیسلام کەسانێك بەڕابەر و پێشەوا قبوولْ ناکات، کەیان لە ترسا یان لە برسان یاساو دەستورەکانی خواو پێغەمبەریان دەشێرنەوە یان خوارو خێچ دەکەن، چونکە میراتگرانی پێغەمبەر پێویستە لەخوا ترسان و ئازایەتی و ڕاستی تێدا بن، نەك لە خەلْك ترسان و ترسنۆکی و خواری، بەلْێ ئەوانەی خۆیان بەقوتابی و میراتگری پێغەمبەر دەزانن، پێویستە بزانن کە پێشەوایەکەیان خواناسی و ئازایەتی و ڕاستی لەدوای خۆی بەمیرات بەجێ هێشتووە نەك فیرعەون پەرستی و ترسنۆکی و بێ باری ! [1]

********************************

٥٧٦.هەروەك چۆن سەگ هەمیشە تەنگە نەفەسە و زمان دەردێنێ، هەر بەهەمان شێوە زانای دنیاپەرستیش هەمیشە چاوبرسی و چاوچنۆکە و بەهیچ شتێك سێبوری نایەت، هەرچەندە زۆریش خەریکی ماندوو بوون و گەڕان و سوڕان بێ بەدوای دنیاو ئارەزووەکانی دا ! [2]

********************************

٥٧٧.هەروەك چۆن کەر، سود مەند نابێت لەو بارەکتێبەی لەسەر پشتیەتی، بەناو زانایی دین فرۆش و دنیاپەرستیش بەهەمان شێوە، هەرچەندە بەڕوالْەت هەلْگری زانیاری و بەرنامەی خوایە، بەلاّم لەسۆنگەی ئەوەوە کەخۆشەویستی ژیانی دنیا و ئارەزووە ماددی یەکان دلْیان داپۆشیوە، هیچ لەو زانیاری و شارەزایی یە بەهرەمەند نابێ کەهەلْی گرتووە ! [3]

********************************

٥٧٨.ئەو ئیسلامی وا پان و پۆڕو هەمەلایەنە کە لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) و برادەرە بەڕێزەکانیدا رضي الله عنه سەر لەبەری ژیانی تاك و کۆمەلْی وەبەرخۆ دەدا و دەرمان و چارەی بۆ هەموو دەرد و نەخۆشیەك دادەنا ! دەستی ڕیسوا و زەبوونی کرێ وەرگری، بەناو پێشەوایانی زڕ و دلْنەخۆش و بێ هۆش و گۆش و هەموو شت و فرۆش و، بۆ خزمەتی طاغووت بە جۆش، لە قلْت و

---

[1] سۆزی نەتەوایەتی بیری ناسیۆنالیزم لەتەرازووی ئیسلام دا –چاپی یەکەمی نوسینگەی تەفسیر –سالْی ٢٠٠٥ ز–لا–٥٤

[2] سەرچاوەی پێشوو لا–٦٠

[3] سەرچاوەی پێشوو لا–٦١

بڕکردن و کەچ و کرووچ کردنی وەخۆ کەوت و، هێندەی لێ نەهێشتەوە کە بەشی هیچ بکاو، هیچ دەردان چارەبکات!![1]

*******************************

٥٧٩.بەرنامەی ژیانی مرۆڤ بەس ئایینی ئیسلامە، بەڵام گرنگ ئەوەیە لە ناسینی ئیسلامدا بەهەڵەدا نەچی و، بزانی چ جۆرە ئیسلا مێك!

ئەو ئیسلامە کە ڕابەرو پێشەوا قرپۆك و بێ هۆش و دڵنەخۆشەکانی بوونە کرێگرتە و خزمەتکاری طاغووت؟!

یان ئەو ئیسلامەی کە بۆ ڕازی کردنی زۆردارە خۆ بەخوا زانەکان هێندەی لێ کەچ کراوەو، وای پەڕو باڵ کێشراوە، کە لەدەرگای کۆشك و بارەگای هەموو طاغووتێك و، سەردەرە و شیپانەی بنکەی هەموو حیزب و ڕێچکەیەکی شەیتانییەوە دەچێ!!

هەڵبەتە نەء بەڵکو ئەو ئیسلامەی کە لەقورئان و سوننەتدا خراوەتە ڕوو، پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی ﷺ و شوێنکەو توانی ڕاستەقینەی، بەدێڕی درشتی هەڵوێست و ئاکاری مەردانەیان ڕووی مێژووی مرۆڤایەتییان پێ سپی کردووەو، ڕاستی و تەواوی بەرنامەی خواو، لێهاتووی مرۆڤی مسوڵمان و خواناسیان پێ سەلماندووە![2]◆

*******************************

٥٨٠.برپڕەی پشتی ئیسلام و کاکڵ و نێوەڕۆکی بریتیە لە یەکلابوونەوە بۆخواو، بەس ڕووکردنە خواو، بەتەنێ پشت بەستن بەخوا، مادام وابێ کەسێك کە قیبلەی طاغووتە و، دنیا پەرستێکی ڕووتە و، هاوبەش پەرستێکی نابووتە، ڕێی ناکەوێ کە شوێنێکەوتووێکی سادەی ئیسلامیش بێ، چ جای ڕابەر و پێشەوا![3]

*******************************

---

[1] خواناسیی ئایین ئیمان ڕاستی یەکانی ئیسلام دەدرەوشێنەوە ئەفسانەکانی ڕیچکان دەپووچێنەوە چاپی یەکەم -ساڵی ٢٠٠٠ ز لا-١٨٩-١٩٠

[2] سەرچاوەی پێشوو لا-١٩١

◆ ئەم وتەیەی ماموستا، وە هاوشێوەکانی ئاراستەی ئەو زرە مەلا دین فرۆشە بەناو پێشەوا دڵ نەخۆشانەیە، کە لە هەموو جاخ و سەردەمێك دا دین لە خزمەتی دەسەڵاداراندا بەکاردەهێنن لە پێناوی چەند پاروە نانێکی سەر شۆڕکەرانەدا. ئامادەکار

[3] سەرچاوەی پێشوو لا-٢٢٨-٢٢٩

٥٨١.بەڕاستی شتێکی یەکجار ستەم و بێجێ و ناماقووڵە کە بەناو زاناو بە ڕواڵەت پێشەوایەکی ترسنۆك و چاوچنۆك و دنیاویست و طاغووت پەرست، بوختانێکی هێندە زل هەڵبەستێ: خۆی بە جێگیر و میراتگری پێغەمبەرێك لەقەڵەم بدات و، لافی ڕابەرایەتی بەرنامەیەك لێ بدات، کە چەندەیان رق لەشەیتان و طاغووتە، چەند قاقی ئەوە رقیان لەو بەناو زاناو بە ڕواڵەت پێشەوایانی وەك وییە ، کە بۆ ئێسکە گۆشتێکی کرووسراوە وەك سەگێکی زەبوون و برسی چاو دەبڕنە دەستی طاغووت و، بە تەمای گیرفانی پڕو گەرم و پارووی چەورو نەرم دەست دەکەن بەکلك لە قاندن و ئێشکەگرتن و دەڕین و قڕوو سکاندن!!

وە وەك گوێدرێژێك بە ئومێدی مستە جۆیەك و چەنگە کایەك دەبنە بارهەلگری طاغووت و، چۆنیان لێ بخورێ وادەڕۆن، جارجاریش وێڕای زەڕاندن لووشکەو موشکانیش دەوەشێنن!![1]

*******************************

٥٨٢.مەرج نییە تەنیا (مەلا) زانای ئیسلام بێت و زانایەتی بە ئیسلام لە مەلایەتی دا کورت هەڵنەهاتوە و، هەیە زانایە و مەلاش نیە و بگرە هەیە مەلاشە، بەڵام زانا نییە بە ئیسلام، دیارە ناوی بێ ناوەڕۆکیش هیچی لێ هەڵناوەرێ و کورد گوتەنی: بەحەڵوا حەڵوا دەم شیرین نابێ![2]

*******************************

٥٨٣.نە هەموو مەلایەك زانایەو نە هەموو زانایەکیش مەلایە![3]

*******************************

٥٨٤.ئەو کەسە کە بەناو مەلا و زانایە و بەخەیاڵ خۆی پێ چاوساغ و پێشەوایە، بەڵام ڕەفتار کوێخایە و عەودالی دنیایە و گورگە و لە پێستی مەڕدایە، با دڵنیابێ، کە ئەو ناوە خۆشە و ڕواڵەتە بۆشەی ئەگەر بۆ ژیانی زوو تێپەڕێ لە دنیاش تۆزە سوودێکی بۆی هەبێ، لە ڕۆژی دوایی دا کە نهێنییەکان ئاشکرا دەبن (يَوْمَ تُبْلَى السَّرَائِرُ) نەك هەر هیچ دادی نادات و بەکەڵکی نایەت، بگرە دەبێتە مایەی قەرزداریی و شەرمەزاریشی![4]

*******************************

[1] سەرچاوەی پێشوو ل-٢٢٩-٢٣٠

[2] زانایانی ئیسلام کێن و چۆنن؟!-چاپییەکەم - ساڵی ٢٠٠١ز -ل-٩

[3] سەرچاوەی پێشوو- ل-٩

[4] سەرچاوەی پێشوو- ل-١٩

٥٨٥.ئەو کەسانەی کە نەك هەر قسەی پووچ و بۆش بەڵکو زمانیان بۆتە زبڵدانی درۆ و قسەی ناشیرین و بێ جێ و هەڵە و پەڵە، هەرچەندە جبەو مێزەریشیان زۆر چاك و نایاب بێت، جارێ بەو ڕەفتارە یانەوە نە بوونەتە مسوڵمانێکی ئاسایی و عادەتیش چ جای بەچاو ساغ دابنرێن![1]

*******************************

٥٨٦.ئەو کەسانەی لەسەر مینبەری پێغەمبەری ڕەوشت بەرز و مەزن وەك شایەری کارامە هەرچی بەسەر زاریان دابێ نایگێڕنەوە لە قسەی درۆ و هەڵە و چەواشەکاریانەو وشە و تەعبیری زەق و ڕەق و بێ ڕەونەق و بێ نەزاکەت و دوور لە حورمەت، هەرچەندە خۆیان پێ مەلاو زانا و وتاربێژ و قسەڕەوان و زۆر زان بێ لە تەرازوی قورئان و سوننەت دا هیچ و بۆشن وەك پووشن ![2]

*******************************

٥٨٧.زانا و پێشەوایانی ئیسلام پێویستە ڕێز لێ گیراو و پشتیوانی لێ کراوبن ، چونکە ئیمامی بێ ئوممەت زەلیل و ئوممەتی بێ ئیمامیش دیلە و، هەردووکیان بەیەکەوە جوانن و، تەنیا بەدەستبار بۆ یەکتر گرتنیش کۆڵ و باری قورسی دینداری و ئیسلامەتی دەتوانن![3]

*******************************

٥٨٨.دەبێ مامۆستا و شارەزایانی ئیسلام ڕادەنە مەیدان و بەدەنگێکی دلێر و زووڵاڵ لە خەڵك و جەماوەری مسوڵمانیانەوە بخوڕن و بڵێن :

وەرن خەڵکینە باحوکم بە (ماأنزلَ الله )بکەین و، وەرن با شوێن پێغەمبەری خوا (ﷺ) بکەوین!

هەر زانایەکی ئیسلام بیەوێ دەعوای میراتگرایەتی پێغەمبەرانی ( ﷺ ) لێ بسەلمێنرێ و ڕێز و حورمەتی پێشەوایەتی مسوڵمانانی بۆ دابنرێ، دەبێ زۆر بەجیدی و بوێرانەو لێبڕاوانە مشوری پاراستنی ئەو میراتە بەرز و بێ وێنەیە بخوات، بەڵام دەبێ مشوری هەموو میراتەکە بخوات نەك گوڵبژێری بکات! بێنێ ئەوەی کە ئارەقی پێوە ناکات و پێیەوە سەغڵەت نابێ هەر لەگەڵ ئەوە خەریك بێت! چونکە تۆ کە دەڵێی من میراتگر و جێگری پێغەمبەری خوام (ﷺ) نابێ مافی هەڵبژاردن و سەرپشك بوون بەخۆت بدەی! ئنجا ئایا پێغەمبەری کۆتایی (ﷺ) تەنیا نوێژ و ڕۆژووی لە دوای خۆی بەمیرات بەجێ هێشتووە ! یاخود بەرنامە و شەریعەتێکی بۆ کردووینە میرات

---

[1] سەرچاوەی پێشوو- لا-٢٤

[2] سەرچاوەی پێشوو لا-٢٤

[3] سەرچاوەی پێشوو لا-٢٩

و ئەمانەتێکی خستۆتە ئەستۆمان کە سەر تاپایی ژیان و گوزەرانی تاك و کۆمەڵی گرتۆتە نێو خۆی بەرنامە و ئایینێك کە هەم عیبادەت و طاعە تە و هەم حوکم و سیاسەت و، عەقڵ و دڵ و مزگەوت و بازاڕ و حیکمەت و حکوومەت و زانست و تەزکیە و دوانگە و فەرمانگە و دنیا و دواڕۆژ پێکەوە دەبەستێتەوە و هەر هەموویان وەك دەنکەکانی تەسبیحێك بە دەزووی بەندایەتی (عبودیة) و دینداری یەوە دەکات و پێکەوەیان کۆ دەکاتەوە، وە کەسانێك پەروەردە دەکات کە مەردی مەیدانەکانی: طاعەت و کەسابەت و فیداکاری و شەهادەت و حوکم و سیاسەت بن و، مەردی حەرب و میحرابن و، لە پێناوی خوادا شەو نوێژ و شەبەیخوون و تەقوا و تەقەیان هەر پێ وەك یەك بن و جیاوازی یان لەنێوان دا نەکەن و، بەکورتی خوا چی پێ چاکەو ئەوانیش پێیان چاك و چیشی پێ خراپە ئەوانیش پێیان خراپ بێت و، مل کەچی شەرع بن نەك شوێن کەوتەی میزاج و تەبع و پابەندە (هُدی) بن نەك گوێ لەمستی (هَوی)! [1]

*******************************

٥٨٩.هەرکەسێك شوێن غەیری ئیسلام بکەوێ و یان غەیری ئیسلامی وەك بەرنامەو ڕێبازی ژیان و گوزەرانی تاك و کۆمەڵ پێ ڕاست و دروست بێت، ئەوە ئەگەر مەلاش بێت نەك هەر ئیسلامی نیە بکرە هەر مسوڵمانیش نیە !وە بابای وا ئەگەر مەلا و شێخیش بێت ئەوە هیچ کە بۆ پێشەوایەتی و برا گەورایەتی مسوڵمانان ناشێ بگرە هەر بەمسوڵمانیش دانانرێ و مەگەر لەو جۆرە کەسانە بێ کە لەڕووی شەرعەوە بە بیانوو بڕکراو و (إقامة الحجة) لەسەر کراو دانەنرێ، ئەگەر نا پیاوی وا نەك هەر لە میحراب و مینبەری پێغەمبەر (ﷺ) بەڵکو پێویستە هەر لە مزگەوتیش دەربکرێ و لە بازنە و جوغزی مسوڵمانەتیش وەدەربنرێ! [2]

*******************************

٥٩٠.کەسێکیش هەڵە و کەم کورتی یەکانی زانایەك بکاتە پەرچ و بیانووی بەهرە وەرنەگرتن لە خێرو بێر و چاکەکانی ناحاڵی و لێ نەزانە ! ئایا هیچ باخەوانێك درەختێك لەبنەوە دەبڕێ هەر لەبەر ئەوەی چەند دانەیەك میوەی ڕزیوو بەکەڵك نەهاتووی پێوەیە؟! [3]

*******************************

---

[1] سەرچاوەی پێشوو ل-٣٢-٣٣

[2] سەرچاوەی پێشوو ل-٣٥-٣٦

[3] سەرچاوەی پێشوو ل-٥٠

٥٩١.پێشەوا (إمام) بەبێ ئوممەت هیچی پێ ناکرێ، وەك چۆن ئوممەتی بێ ئیمامیش مێشی پێ لە خۆ دەرناکرێ ![1]

******************************

٥٩٢.ئەی زانایانی ئیسلام و پێشەوا و چاوساغانی مسوڵمانان دەبێ هەرکامێکتان کە خۆی بەمیراتگری پێغەمبەران (علیهیم الصلاة والسلام)دەزانێ ئاگاداربێ و هۆشیار بێ نەوەك خوا نەکردە ناوو نیشانەکەی لێ خەسار بێ ![2]

******************************

٥٩٣.ئەی زانایانی ئیسلام و پێشەوایانی مسوڵمانان! هیچ کات و بە هیچ پاساو و بیانوویەك و بەفیت و دەست لە پشت دانی هیچ کەس و لایەنێك هەرچەندە بە ڕواڵەتیش خۆی بە پەرۆش و دڵسۆز پیشان بدات، ئامادەمەبن کە بەگژ ڕەوت و کاروکاروانی ئسلامی دا بکرێن و لە دژایی تیان دا بەکاربهێندرێن، چونکە (تفی بەرەو سەرێ هەر بۆ خاوەنی دەگەڕێتەوە) و زۆریش حەیفە بە(برا) (برا) لە نێو ببرێ و(ڕۆڵە ) بەدەستی (بابی) بکوژرێ و ئینسان بەدەستی (خۆ)ی (خەرمان) ی خۆی پێ بسووتێنرێ ![3]

******************************

٥٩٤.ئەی زاناو پێشەوایانی ئیسلام و مسوڵمانان، لە هەر بەرگ و پۆشاك و دیمەنێك دان، مادام ئێوە میراتگری پێغەمبەری خوان (ﷺ) ئەویش نە حیکمەتی بێ حوکم و نەعیبادەتی بێ سیاسەتی بۆ بەجێ نەهێشتوون! چونکە هەم خۆی و هەم چوارخەلیفە ڕاشیدەکانیشی، حوکم و حیکمەت و عیبادەت و سیاسەت و بازاڕ و مزگەوت و زانست و ڕەوشت و پارێزکاریی و فیداکاری و دینداری و دنیاداریی و ... یان پێکەوە گرێ داون![4]

******************************



[1] سەرچاوەی پێشوو لا-٩٧

[2] سەرچاوەی پێشوو لا-٩٨

[3] سەرچاوەی پێشوو لا-١١٩

[4] سەرچاوەی پێشوو لا-١٢٤

٥٩٥.ڕاست نییە كە ئیسلامی یەكان بەگشتی و تێكڕایان ڕێز و حورمەتی زاناو پێشەوایانیان لەلا نەبێ، بەڵام بێگومان ئیسلامیەكانیش فریشتەی بێ هەڵەو بەفری بێ پەڵەنین و كەم و كووڕی و كرچ و كاڵی یان هەیە و (چەم بێ چەقەڵ ) و (كۆمەڵ بێ دەغەڵ ) نابێ![1]

********************************

٥٩٦.پێویستە زانایانی میراتگری پێغەمبەریش (ﷺ) وەك پێشەوا و میرات لێ گیراوەكەی خۆیان بكەن و تەنیا و تەنیا دڵ بە یارمەتی خواو خەڵكی بڕوادار خۆش بكەن و بەهیوای هیممەت و بەرەكەتی كەسی دیكە نەبن، ئەگەرنا دووچاری نا ئومێدی و پەنجەی پەشیمانی گەزین و دەست لە بنی هەمبانەی خاڵی یەوە دەرچوون دەبن![2]

********************************

٥٩٧.من مەلایەكم پێ خراپە كە كۆلكە مەلایە و دین فرۆشەو، شێخێكیشم بەلاوە بۆشە كە زڕەو دڵنەخۆشە! بەڵام مەلای چاك و شێخی چاك جێی هەموو حورمەت و ڕێزێكمانن![3]◆

********************************

٥٩٨.هەركەسێك دان بەفەزڵ و چاكەی زاناو مامۆستایانی بەڕێز و دڵسۆزی كوردستان دا نەهێنێ كە لە سەخترین هەل و مەرج و دژوارترین بارودۆخی هەمیشە پڕكێشە و گرفت و ناسەقامگیری وڵاتدا دەستیان لەبڵاو كردنەوەی زانستە شەرعی یەكان و تێگەیاندن و پێگەیاندنی فەقێ و قوتابی

---

[1] سەرچاوەی پێشوو لا-٣١٩

[2] سەرچاوەی پێشوو لا-٣٢٢

[3] سەرچاوەی پێشوو لا-٣٢٤

◆ ئەو دەستەواژانەی كەمامۆستا عەلی باپیر بۆ جیاكردنەوەی مەلا و شێخ و مسوڵمان و ...هتد چاك و خراپ بەكاری هێناون بەگشتی ئەمانەی خوارەوەن كە لە كتێبی ( خواناسی ئایین ئیمان ) یش دا لە چەند جێ یەك دا ئاماژەی بۆ كردووە:

١-كوڵكە مەلای دین فرۆش

٢-زڕە شێخی دڵنە خۆش

٣-مسوڵمانۆچكەی بێ هۆش

٤-فەریكە مسوڵمانی بۆ ڕژێمی طاغووتی و شەیتانی بەجۆش

تێبینی: ئەم چوار خاڵەی سەرەوە لە كتێبی زانایانی ئیسلام كێن و چۆنن؟!داهاتووەو سەیری -لا٣٢٤ بكە. ئامادەكار.

یـان هەڵنـە گرتـووە ! دیـارە یـان بابایـەكی بـێ ئاگـا و نەشـارەزایە، یـان سـپڵە و ناسـپاس و بـێ ویژدانە ! [1]

*****************************

٥٩٩.هیچ گومان لەوەدا نیە كە كەم و كووڕیش لە هەموو لایەكەوە زۆر بـووەو زۆرە و حـەیفێ نـەك هەرگشت (مەلاناو)ێكیش مەلانیە، -بگرە - لەگەڵ ڕێز و حورمەتمان بۆ مـەلای چـاك و ڕەسـەن - (مەلا ناوی )ی وا هەیە بەڵایەو بەمل ئیسلام و مـسوڵماناندا هـاتوەو كارێـك بـە ئیـسلام دەكـات بـۆ شێواندن و بێزراندنی و، زەبرێك لـە مـسوڵمانان دەدات بـۆ چەواشـەكردن و هەڵخەڵەتانـدنیان، هـیچ ناحەز و دوژمنێكی ئیسلام و مسوڵمانان ئەوەی لە دەست نەیەت و ئەو خزمەتەی بۆ ئەهلی كوفر و نیفاق پێ نەكرێت ! [2]

*****************************

٦٠٠.مەلاناو كەسێكە كە لە مەلایەتی بەس ناوەكەی پـێ بڕابـێ، وەك (سـەلەفی) نـاو (سۆفی) نـاو (شیخ) ناو ... هتد [3] !

*****************************

٦٠١.تەسلیم بوونی بە موتڵەقی بۆ قسەو بۆچون و بەرهەمی زاناو پێشەوایەك بریتی یە لەبەكردەوە بەبێ هەڵە (معصوم)دانانی! [4]

*****************************

٦٠٢.هەرچی بەرهەم و زادەی كۆشش و هەڵێنجانی زانایانە، وەك تێگەیشتنی ئـەوان بـۆ دیـن(فهم للدین) دادەنرێ و نابێ بەهیچ جۆرێك لەگەڵ خودی دین و دەقەكانی تێكەڵ بكرێ! [5]

*****************************

---

[1] سەرچاوەی پێشوو لا-٣٢٨

[2] سەرچاوەی پێشوو لا-٣٢٨

[3] سەرچاوەی پێشوو لا-٣٢٨

[4] ڕێگای صـالح بـوون و بـەرەو خواچـوون -تەزكیـەی نـەفس لـەژێر ڕۆشـنایی قورئـان سـوننەت دا -چـاپی یەكەمی نوسینگەی تەفسیر -ساڵی ٢٠٠٥ زلا-١٤٥

[5] چەند مەسەلەسەكی باوی سەردەم سەرنجێكی واقیعیانەو هەڵسەنگاندنێكی شـەرعییانە-چاپی چوارەم-ساڵی -٢٠٠٥ ز-لا -٢٢٢

٦٠٣.به‌رهه‌م و كه‌ له‌پوری زانایان جۆری تێگه‌یشتنی ئه‌وانه‌ له‌ ئیسلام نه‌ك ئیسلام ![1]

******************************

٦٠٤.دڵسۆزیی بابایه‌كی زانا و پێشه‌واش بۆ میلله‌ته‌كه‌ی له‌ وه‌دایه‌ كه‌ هه‌رچی خێر و چاكه‌ی ئه‌وانی تێدایه‌ ده‌بێ بۆیان بخاته‌ ڕوو، وه‌ ڕاشكاوانه‌ نوختـه‌یان بـۆ بخاتـه‌ سـه‌ر پیتـه‌كان و، جوان جوان حاڵی یان بكات له‌ حه‌ڵاڵ و حه‌رامێك كه‌ خوا و پێغه‌مبه‌ری خوا فه‌رموویانه‌ و ناردوویانـه‌، وه‌ سـنووره‌كانی حـه‌ڵاڵ و حـه‌رام و سـنووره‌كانی تاعـه‌ت و مه‌عـصیه‌تیان جـوان جـوان بـۆ ڕۆشـن بكاته‌وه‌ ![2]

******************************

٦٠٥.ئه‌هلی عیلم ده‌بێ به‌عیباده‌تی زیاده‌ و به‌ڕه‌وشتی به‌رز و جوان و قورئان خوێندن و بـه‌زیكر و فیكری زیاتر و زوهد و عه‌دل و به‌هه‌موو شتێكی باش لـه‌ خـه‌ڵك جیـا بكرێنـه‌وه‌ نـه‌ك تـه‌نیا به‌قسه‌ كانیان ![3]

******************************

٦٠٦.قوتابی كه‌ زانستی شه‌رعیی ده‌خوێنێ نابێ هه‌ر ئه‌وه‌نده‌ بێ كه‌ مێشكی پڕ بكات له‌ زانیـاری، به‌ڵكو ده‌بێ له‌ ئه‌خلاق و ئاكار و ڕه‌فتار و هه‌ڵسوكه‌وتی مامۆستایه‌كه‌ی ده‌رس وه‌ربگرێ، جا ئایا ئه‌گه‌ر ئه‌و مامۆستایه‌ بۆ خۆی ڕه‌سه‌ن نه‌بێ، فه‌قێ و قوتابی چۆن لێی به‌هره‌مه‌ند ده‌بێ ![4]

******************************

٦٠٧.هـه‌روه‌ك چـۆن پزیـشكێكی حـه‌كیم و دڵـسۆز له‌سـه‌دان جـۆره‌ ده‌رمـان و چاره‌سـه‌ر كـه‌ له‌به‌رده‌ستی دان ته‌نها جۆرێك بۆ نه‌خۆشه‌كه‌ی بـه‌رده‌می دیـاری ده‌كات و وه‌سـف ده‌كـات، زانـاو پێشه‌وایانی ئێمه‌ش له‌ ده‌رمانگای شه‌ریعه‌تدا هه‌ركه‌سه‌ به‌پێی پێداویستی خـه‌ڵكی ڕۆژگـاری خـۆی ده‌رمان و چاره‌سه‌رێكی باس كردوه‌و خستۆته‌ ڕوو![5]◆

[1] پرۆژه‌ی به‌رنامه‌ی فكریی كاری ئیسلامیی–چاپی یه‌كه‌م –ساڵی ١٩٩٦ ز–ل –١٠٦

[2] زنجیره‌ی بابه‌ته‌ هه‌نوكه‌ییه‌كان ئه‌ڵقه‌ی دووه‌م –باوریابین داڕووخانی ڕه‌وشت كۆمه‌ڵگاكه‌مان به‌ره‌و هه‌ڵدێر ده‌بات –چاپی یه‌كه‌می نوسینگه‌ی ته‌فسیر –ساڵی ٢٠٠٧ ز–ل–١٧

[3] زنجیره‌ی بابه‌ته‌ هه‌نووكه‌ییه‌كان ( ئه‌ڵقه‌ی شه‌شه‌م) چه‌ند بنه‌مایه‌كی گرنگی وتاربێژی –چاپی یه‌كه‌م – ساڵی ٢٠٠٦ ز–ل–٧٦–٧٧

[4] سه‌رچاوه‌ی پێشوو–٤٤

[5] چه‌ند ڕێڕوونی یه‌ك بۆ ئیسلامی یه‌كانی كوردستان –چاپی یه‌كه‌م –ساڵی ١٩٩٧ ز–ل–٢٤

٦٠٨.مەرج نیە هەر کەسێك لەم ڕۆژگارەدا پێی گوترا (مەلا) یان (مامۆستا) لە ئیسلامدا زاناو شارەزابێ ![1]

******************************

٦٠٩.زۆر (مەلا) هەن لەزانایەتی و شارەزایی جگە لە پۆشاك و نازناو چی دیکەیان پێ نەبراوە و زۆر کەسیش هەیە هیچ کەواو سەڵتەی لەبەرنین و مێزەری لەسەر نیە، کەچی زاناو شارەزایەکی تێروتەواوە ![2]

******************************

٦١٠. زانای ئیسلام کەسێکە کە جگە لە ئیسلامیی بەرجەستە لە قورئان و سوننەت دا شتێکی دیکە بە بەرنامەو ڕێبازی خۆی و گەلەکەی نازانێ و، لە بەرگی (ئاین) دا بانگەشەکردن بۆ بێ دینی (سیکۆلاریزم) یش، جگە لەلادان و سەرگەردانیی پێناسەیەکی دیکەی نیە ![3]

******************************

٦١١.پێغەمبەرانی خوا، خوای بەرز و مەزن پلەو پایەیان بەرزتر بکاتەوەو لە خۆییان نیزیکتر بخاتەوەو، زیاتر لەدەریایی بێ سنووری لوتف و بەزەیی و بەخششی خۆی بەشیان بدات، کە هەڵبژاردەی مرۆڤایەتی و سەر تۆپی کائیناتن، ئێستاش زۆربەی هەرە زۆری خەڵکی مسوڵمانیش چ جای نامسوڵما ، بیروبۆچوون و تێڕوانینی سەیرو سەمەرەو ناقۆڵایان دەربارەیان هەیە ، کە لەگەڵ کەسایەتی و واقیعی ئەو ئینسانە کامڵ و بەرز و بێ وێنانەدا نێوانیان ئاسمان و ڕێسمانە، بەڵام ڕەنگە ئەو خەڵکەش زۆر جێی گلەیی و گازندە نەبێ، چونکە لە سۆنگەی ئەوەوە کە چەندان جار

---

• بەڕای بەندە (مەبەست مامۆستا عەلی باپیرە ) لەنێو زانایاندا کەم کەس هێندەی (إبن تیمیە )و لەنێو عاریفانیشدا کەم کەس بەقەدەر (سید أحمد السرهندي )ناسراو بە (الإمام الرباني ) ئیسلامیان بەفراوانی و هەمەلایەنی تەرح کردوەو بەکردەوەش پیادە یان کردوە-دیارە ئەم مەدحە ئەوە ناگەیێنێ کە ئەم دوو بەڕێزەش بێ هەڵەو پەڵەن و هەرچی گوتویانە ڕاستەوخۆ بەچاو نوقاندنەوە وەردەگیرێ- لەزاناو پێشەوایانی پێشینانیشمان و لەوانەی هاوچەرخ و تازەش شەهیدان (حسن البنا )و (سید قطب) وە (إبو الإعلی المودودي )ی ڕەحمەتی پەرێز و شوێنەواریان لەم بوارەدا لە خەڵکی تر بەرچاوتر و ئاشکراترە خوای میهرەبان بە چاکترین شێوە پاداشتی هەموو لایەکیان بداتەوەو ئێمەش سەرکەوتوو بکات لە شوێن پێ هەڵگرتن و چاولێکردن و بەهرە لێ وەرگرتنیاندا.

[1] گۆڤاری سەهەند ژمارە (٣) دیداری ڕۆژنامەنوسیی -ساڵی ٢٠٠٧ز-ل-٣

[2] سەرچاوەی پێشوو-ل-٤

[3] سەرچاوەی پێشوو-ل-٥

له گه‌لێك بابای زاناو خۆ به‌زانا زانی به نه‌زانی خۆنه‌زانیان بیستووه كه پێغه‌مبه‌ری خوا علیه الصلاة والسلام فه‌رموویه‌تی (إنّ العلما وارثة الآنبیا ... ) واته: بێگومان زانایان میراتگری پێغه‌مبه‌رانن، جا ئه‌و خه‌ڵكه هاتوون له‌به‌ر تیشكی ئه‌م فه‌رمووده‌یه‌دا ته‌ماشای پێشه‌وایانی ئێستای ئایینیان كردووه و پاشانیش واقیع و چۆنیه‌تی ره‌فتار و كه‌سایه‌تی ئه‌و (پێشه‌وا ) یانه‌یان كردۆته روانگه‌ی لێوه سه‌یركردنی پێغه‌مبه‌ران علیه الصلاة والسلام و ته‌رازووی هه‌ڵسه‌نگاندنیان، چونكه عه‌قڵ و مه‌نتیق ده‌ڵێن: پێویسته جێدار "مُوَكّل"چۆن بێت جێگر "وكیل" یش وابێت و دیاره میراتگر "وارث" یش هه‌ر ئه‌وه به به‌میرات ده‌گرێ كه میراتدار "مُوَرِّث" به‌جێی دیلێ !!

ئنجا له‌به‌ر ئه‌وه‌ی زۆربه‌ی هه‌ره‌زۆری ئه‌وانه‌ش كه ئێستا له واقیعی به‌رچاوی خه‌ڵكی دا له‌سه‌ر میراتگرو جێگرایه‌تی پێغه‌مبه‌ران( علیه الصلاة والسلام ) حیساب ده‌كرێن و زانا و پێشه‌واو چاو ساغ له قه‌ڵه‌م ده‌درێن، یان ساده‌و بێ ئاگا و كه‌م هۆشن، یان هه‌ڵپه‌رست(إنتهازی) و په‌یمان شكێن و دین فرۆشن، خه‌ڵكی ساده‌و عه‌وام و بێ هه‌واڵ وه‌ك ئه‌نجامێكی سروشتی و ژیربێژی یانه قیاسی پێغه‌مبه‌ران (علیه الصلاة والسلام ) له‌و میراتگره‌و جێگیره رواڵه‌تی یانه ده‌كه‌ن و ، سه‌ره‌نجام خراپ ده‌بن و به‌هه‌ڵه‌دا ده‌چن و ، مه‌گه‌ر هه‌ر خوا به‌لوتفی خۆی بیانپارێزێ و دڵی ساده‌و بێ غه‌ره‌ز و سروشتی خوارسك یانه‌ی خۆیان چه‌پاڵه‌یان بدات ده‌نا حه‌تمه‌ن ئایین و پێغه‌مبه‌رانیان له‌به‌ر چاو ده‌بێزرێ و ، هه‌تڵه‌و لارێ ده‌بن و به‌مه‌رده‌ی ئه‌و كه‌سه ده‌چن كه پێشینان گوته‌نی (زاری به "شیر" سووتا بوو فووی له "دۆ"ش ده‌كرد)[1]

******************************

٦١٢. با زۆر چاك بزانین كه پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) به‌س نوێژ و رۆژو و زه‌كات و حه‌جی به‌میرات بۆ به‌جێ نه‌هێشتوین، تا به‌سه‌د باره‌و هه‌زار باره‌م كردنه‌وه‌ی باسكردنی وان بتوانین ئه‌ركی جێگرایه‌تی پێغه‌مبه‌ر ئه‌نجام بده‌ین و، میراته‌كه‌ی بپارێزین به‌ڵكو پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) سه‌ر له‌به‌ری به‌رنامه‌ی خوای به‌سه‌ردا به‌جێ هێشتوین و حه‌واڵه‌ی كردووین، به‌رنامه‌ی خواش، به‌رنامه‌ی خواش، هه‌م عیباده‌ته هه‌م سیاسه‌ته، هه‌م ته‌قوایه هه‌م غه‌زا، هه‌م دواڕۆژه هه‌م دنیا، هه‌م رازی كردنی خوای ده‌وێ هه‌م رزگار كردنی خه‌ڵكی و...هتد[2]

---

[1] زنجیره‌ی باچاكتر ئیسلام بناسین –ئه‌ڵقه‌ی دووه‌م پێغه‌مبه‌ران علیه الصلاة والسلام –چاپی دووه‌م –ساڵی ١٩٩٠ز

[2] خواناسیی ئایین ئیمان ڕاستییه‌كانی ئیسلام ده‌دره‌وشێنه‌وه ئه‌فسانه‌كانی ڕێچكان ده‌پووچێنه‌وه –چاپی یه‌كه‌م –ساڵی ٢٠٠٠ ز–لا–٢٠٦

٦١٣.ئایین بریتیە لەوە کە ئینسان بەدڵ و دەروون بروا و قەناعەتی پێ بێ و بەئە ندامەکانیشی فەرمانەکانی جێبەجێ بکاو پابەندی بێ![1]

******************************

٦١٤.هەروەك چۆن ئایین بۆ ئینسان نێرراوە، ئینسانیش بۆ دینداری خولقێنراوە، بەڵێ (دین) بۆ (ژین)ەو (ژین)یش دەبێ بەپێی (دین) بەرێوە بچێ!هەر (دین) ێك كە لە(ژین) دادەبڕێ◆ دەبێتە شتێکی بۆش و،(ژین) یش ئەگەر بەگوێرەی تەجیهاتی (دین) بەرێوە نەچێ گەندەڵ و پوخەڵ دەبێ◆[2]

******************************

٦١٥.ئایین بۆیە هاتوە کە ئینسان مسوڵمان و بەختەوەربێ![3]

******************************

٦١٦.ئەو کەسەی لە ئایین لاڕێ دەبێ و، سەرپێچی لە یاساکانی دەکات دەکەوێتە بەر لووزەوی ڕەخنان و ڕێژنەی تانەو تەشەران، بۆ وێنە:

بۆ نوێژان ناکەی؟!

بۆ ڕۆژوان ناگری؟!بۆ زەکات نادەی؟!

بۆ هاموشۆی مزگەوتێ ناکەی؟!

بۆ زیادەڕۆ و زیاد خۆری؟!بۆ وانەگبەت و دوو مۆری؟!

بۆ قومارچی و؟ بۆ هێندەساختەچیی؟!

بۆ مەیخۆر و سەر بە شەڕی؟!بۆ هێندە درۆزن و بەدفەڕی؟!

بۆ داوێن پیسی؟!

بۆ هێندەبەد و نەگریسی؟!

---

[1] پوختەیەك دەربارەی ئیسلام لەبەر ڕۆشنایی سوورەتی فاتیحەدا –چاپی دووەم ٢٠٠٦ لا–٢٨

◆ وەك ئایینی گۆڕاوی نەصرانیەت

◆ وەك ژیانی سەرگەردانەی ڕۆژئاواییەکان

[2] سۆزی نەتەوایەتی و بیری ناسیۆنالیزم لەتەرازوی ئیسلام دا –چاپی سێیەمی نوسینگەی تەفسیر –لا–١٨٠

[3] خواناسیی ئایین ئیمان –ڕاستییەکان ئیسلام دەدرەوشێنەوە ئەفسانەکانی ڕێچکان دەپووچێنەوە–چاپی یەکەم– ساڵی ٢٠٠٠ ز–لا–١٦٧

بۆ نێچیری داوی ئیبلیسی؟!

بۆ وابەد ئاکارو پەستی؟!

بۆ هێندە دنیا پەرستی؟!

بۆ هێندەبێ هۆش و گۆشی ؟!

بۆ خۆت بەطاغوت دەفرۆشی؟![1]*

*******************************

٦١٧.پەیوەندی نێوان بڕوا بەخوابوون و ئایین، وەك پەیەندیٔ نێوان دەزوو و دەنکەکانی تەسبیح، یان سەرو جەستە، ڕەگ ڕیشە و لق و پۆپ، یان بناغەو دیوار، یان تیشکی ڕۆژ و ڕووەك، یان هەور و باران، وایە، واتە: هەروەك چۆن تەسبیح بێ دەزوو و، جەستەی بێ سەرو لق و پۆپی بێ ڕەگ و ڕیشە و، دیواری بێ بناغە و، ڕووەکی بێ تیشك و، بارانی بێ هەور، هیچ کامیان لەدنیایٔ واقیعدا نین و نابن، ئایین– خواپەرستی و فەرمان بەری– یش بەبێ بڕوا بەخوا بوون، بوونی مەحاڵە، وەهەرکاتێکیش خواناسی و بڕوابە خوابوون لە دڵ و دەروونێك چەسپی و هاتەدی، ئەوە بەبێ وەخران پابەندی و دینداریش پەلکێش و داخواز دەکات و مەحاڵە لەیەك جیاببنەوە و بترازێن![2]

*******************************

---

[1] سەرچاوەی پێشوو لا–١٦٩

* جا بێگومان بابای لاڕێ و یاخی لە ئاقار ئەم پرسیارانە دا دوو ڕێی لەپێشن:

١–کە خۆی بەبڕوادار پیشان بداو بڵێ: سوێند بە خوا بێبڕوا و بێ دین نیم، بەڵام هەرشتێکە تەنبەڵی و قاڵبم گرانییم بۆتە پەرچ و لەمپەر لەڕێی بەجێ هێنانی ئەرك و فەرمانەکانی ئاییندا.

٢–کە خۆی بەبێ بڕوا و بێ دین بناسێ و بڵێ: ئەوی ڕاستی بێ بۆیە پابەندی فەرمانەکانی ئایین نیم و، لە خەتێم لاداوە و یاخیم، چونکە من بابایەکی بێبڕوام و پێم وایە خوا و بەهەشت و دۆزەخ و سزا و پاداشت و...هتد.ئەفسانەن و هیچی دی.

جا کەسێك کەڕێی یەکەم هەڵبژێرێ، هەر چەندە بە ڕواڵەت لەو کەسە چاکترە کەهی دووەم هەڵدەبژێرێ، بەڵام لە ڕاستیدا هیچ جیاوازیان نیە و لە نێوەڕۆکدا یەکن لەو ڕووەوە کە بە قسەی سەر زارەکی و بێ کاکڵ و دەعوای بێ بەڵگەش واقیعی شتان ناگۆڕێ. سەرچاوەی پێشوو لا–١٦٩–١٧٠

[2] سەرچاوەی پێشوو لا–١٦٧

٦١٨.ئایین بەرنامەی سەر لەبەری ژیانە و لە لایەنێك و دووان دا كورت هەڵنەهاتوە و، لە هەموو وردو درشتی ژیاندا ڕێڕووونی ئینسان دەكات بۆ نواندنی تاقە هەڵوێستی ڕاست لە ئاقار خۆی و خوا و خەڵك و بوونەوەر و ژیاندا![1]

*******************************

٦١٩.سەرچاوەی ئایین خوایەو، سەرەتای پەیدابونیشی دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای نیشتەجێ بوونی ئینسان لەسەر زەوی: چونكە هەر لەبەرەبەیانی مێژووەوە، خوا مرۆڤایەتی فەرامۆش نەكردووە و، لە تیشكی ڕێڕوونی خۆی بێ بەشی نەكردوە و، بە پێغەمبەراندا بەرنامەی ژیانی بۆ ناردووە![2]

*******************************

٥٢٦.(ئایین و خواناسیی، لە باروودۆخی چینایەتی و بە هاندانانی چەوسێنەران و، لەئەنجامی ترسان و، بە هۆی نەزانییەوە و، لەسۆنگەی غەریزەی جنسیەوەوە و، بەهۆی داخوازییە دەروونی و كۆمەڵایەتیەكانەوە)[3]، پەیدانەبووە بەڵكو ئایین بەرنامەی خوایە و، خوا لەڕووی لوتف و بەزەیی و چاكەكاری یەوە بۆ بەرەی مرۆڤی ڕەوانەكردوە، و دیاردەی خواناسیی و ئایین پەروەرریش لە ژیانی مرۆڤدا شتێكی بێ بنەچكەو ناڕەسەن نییە وداخوازییەكی سروشتی ڕەسەنی مرۆڤە و، ژێری و ویژدانی وای لێ دەكەن ڕێ بەرەو خوا بگرێتە بەرو ژیانی بەپێی ڕێڕوونییەكانی خوا بەرێتە سەر![4]

*******************************

٦٢٠.ئایین بۆوە نەهاتووە –وەك سادەو فامكاڵان دەڵێن – كە لەگۆشەی مزگەوت و تەكیەكاندا خۆی كۆشمەڵە بكاو، ئاوێ لە كەس شلوێ نەكاو ، مێشان لەخۆی دەرنەكات، چونكە خوای كاربەجێ زۆر لەوە بەرزترە كەئایین و بەرنامەیەك بنێرێ نەتوانێ كاروباری خەڵكی بەڕێوە بەرێ و

---

[1] سەرچاوەی پێشوو لا-٢٤٦

[2] سەرچاوەی پێشوو لا-٢٤٧

[3] هەر یەكێك لەوانەی لەنێو كەوانەكە دان باس لە دیاردەی پەیدابوونی ئایین دەكەن، بەڵام هیچ كامیان نەیان توانیوە وەڵامێكی ڕاست و دروست بدەنەوە لەمەر دیاردەی چۆنیەتی پەیدابونی ئایینندا هەریەكەیان بەجۆرێك تەفسیری كردووە مامۆستاش سەرجەمی ئەو بەڵگەنەی هەڵوەشادندۆتەوەو سەلماندویەتی ئاین لەئەنجامی جیدا پەیدابووە . ئامادەكار

[4] سەرچاوەی پێشوو لا-٢٨٣

سەرپەرشتیان بکات و، بەندەکانی خوا ناچار بکات بکەونە سوالّ و سەدەقە لە مەلاولا، بۆ بەرنامەیەك کە ژیان و گوزەرانیان بۆ هەڵسوڕێنێ ![1]

******************************

٦٢١. ئایین بۆ ئەوە هاتووە کە مرۆڤ بەهۆی وی یەوە لەم ژیانەدا، خوای تاك لە خۆی ڕازی بکاو، دۆزەخ لە خۆی بەدوور بکاو، بەهەشت لە خۆی حەڵاڵ بکاو بەختەوەری دابین بکات ![2]◆

******************************

٦٢٢.ئایین بۆیە هاتوە تاکو ئینسان ئینسان بێ بە مانای ووشە، وە ئینسان نابێ مەگەر بەس بەندەی خوا بێ، وەبەس بەندەی خوا نابێ، مەگەر مسوڵمانی ڕاستەقینە بێ![3]

******************************

٦٢٣.ئایین چییە؟! بەرنامەی سەر لەبەری ژیانی مرۆڤە بەتاك و کۆمەڵەوە لە هەموو بوارەکانی ژیاندا![4]

******************************

٦٢٤.ئایین بۆچی پەیدا بووە؟! بەرنامە و پەیامی خوایە لە ئەنجامی لوتف و بەزەیی و کاربەجێیی خۆیەوە بۆ مرۆڤانی ناردوە![5]

******************************

٦٢٥.ئایین بۆچی هاتوە؟! بۆیە هاتوە تاکو مرۆڤ ببێتە ئینسان، ناشبێتە ئینسان مەگەر بەس بەندەی خوا بێ، بەس بەندەی خواش نابێ مەگەر مسوڵمانی ڕاستەقینەبێ ![6]

---

[1] سەرچاوەی پێشوو لا-٢٩٣

[2] سەرچاوەی پێشوو لا-٣٠٢

◆ ئەوەی لێرە دا وەرگیراوە تەنها یە کێکە لەو بیست و یەك خاڵەی کە مامۆستا عەلی باپیر بۆ وەڵامی پرسیاری ئایین بۆچی هاتوەی تێدا وەڵام داوەتەوە، بەڵام ئێمە تەنها ئەم خاڵە مان لێوە وەرگرتوە، چونکە لەگەڵ بابەتەکەی ئێمە دا دەگونجێ کە شێوازی بەکارهێنانی ووشەکاری تێدا بەجوانی بەدی دەکرێت ، بۆیە بیست خاڵەکەی تریشمان بەپەراوێز نەنوسی ،چونکە دورو درێژە و جێگەی ئەم شوێنەی ئێمە نی یە کە لە لاپەرە ٢٨٤بۆ لاپەرە-٣٠٢ . ئامادەکار

[3] سەرچاوەی پێشوو لا-٣٠٤

[4] سەرچاوەی پێشوو لا-٣٠٤

[5] سەرچاوەی پێشوو لا-٣٠٤

٦٢٦.وەك چۆن بەرنامە و ئایین بوونی هەرکام لە کاپیتالیزم و سۆسیالیزم ئەوە ناگەیێنێ کە لەهەموو شتێك دا وەك یەك و یەکسانن و بگرە وەك یەکیش دەچن! بەهەمان شێوەش ئایین (دین) بوونی ئیسلام و دیانەیەتی (نصرانية) یش و لەئەسڵ دا لەخوا و ئاسمانەوە هاتنیان، مانای وانیە کە وەك یەك و یەکسانن و هەر حوکمێك یەکێکیانی گرتەوە، ئەوی دیکەشیان دەگرێتەوە ![1]◆

*******************************

٦٢٧.لەمەودوا با لایەنگرانی تەوژمی سیکۆلاریزم و خەڵکی دیکەش، ئەگەر دەیانەوێ شێوازی نووسین و ئاخاوتنیان زانستییانە بێت، نەك سەرکێڵ و دیماگۆکییانە، هەرکاتێك بەگشتی باسی ئایین(دین) یان کرد، ئاگاداری چەمك و واتایەکەی بن و، بزانن کەعەلمانییەتەکەی خۆشیان جۆرە ئایینێکە، بەڵام زەمینی و مرۆڤکرد، وە هەر کاتێکیش باسی بەرنامە ئاسمانییەکانیان کرد، بە تایبەت ئیسلام و نەصرانییەت، با دیاری بکەن مەبەستیان پێ کامەیانە و یەك وشەو پێناسە بۆ هەموویان بەکار نەهێنن، چونکە بێگومان ئیسلام و نەصرانیەت — بەم حاڵەی ئێستایەوە — نێوانیان ئاسمان و ڕێسمانە و وەك گوتراوە: (بەس خوایان یەکە !)[2]

*******************************

٦٢٨.هەرچەندە سەرچاوەی ئایین وەرگرتنت دیاربێ و بەهۆی جۆری تێڕوانینەوە بزانی شوێنت لە ئیعرابی بوون داو چی‌یەو کوێ یە و، لە سۆنگەی بیروباوەڕیشەوە بزانی کە دەبێ هەڵوێستت چۆن بێ، بەڵام هەتا جۆرە تێگەیشتن و شارەزای یەکی ڕاست و تەواوت دەربارەی ئایین نەبێ ناتوانی بە شێوەیەکی ڕاست و ڕەوان بجوڵێیت و دینداری بکەیت ![3]

*******************************

---

[٦] سەرچاوەی پێشوو لا-٣٠٤

[١] تەوژمی ئیسلامی و عەلمانی خاڵە هاوبەش و جیاوازەکانیان-چاپی یەکەم -ساڵی ٢٠٠٨ ز-لا -لا-١٧٨

◆ ئایا ڕەوایە نووسەرە بوێرو هەقبێژو دڵسۆزەکان، هەر چونکە لە (نووسەر) بوون دا لەگەڵ نووسەرە هەلپەرست و دەهۆڵ کوت و موخەننەتەکان داپێك دەگەنەوە ،باجی هەڵەو پەڵەکانی ئەوان بدەن و بەیەك چاو تەماشا بکرێن؟!!!

[٢] سەرچاوەی پێشوو-لا-١٧٩

[٣] پرۆژەی بەرنامەی فکری کاریی ئیسلامیی-چاپی یەکەم -ساڵی ١٩٩٦ ز-لا -٨

٦٢٩.بەبێ شارەزایی لە دین دا ئینسان نازانێ چی دەکات و، بەبێ ئاشنایش بە واقیعی ژین نازانێ چۆن بکات ![1]

******************************

٦٣٠.ئەگەر لە سۆنگەی (فقه)ەوە دەتوانین دیاری بکەین (چی ) و(چەند)ی ئایین دابەزینینە سەر واقیعێکی دیاریکراو و توشی هەڵە نەبین! بەهۆی (رشد) یشەوە دەتوانین بە وەستایی و دانایی پرۆسە (عملیة)ی ئەو دابەزاندن و پیادەکردن (التنزیل و والتطبیق)ە جێبەجێ بکەین گیرۆدەی داوو تەڵە نەبین![2]

******************************

٦٣١.شتێکی ئاسایی یە کە ئایین و بەرنامەکەی عیسا (علیه الصلاة والسلام )بێجگە لە نەتەوەی ئیسرائیل و ئەو قۆناغ و هەل و مەرجە کە تێیدا ژیاون ، بۆ خەڵك و قۆناغێکی دیکە نەگونجێ، وەك لە واقیعیش دا نەگونجاوە و ناشگونجێ![3]

******************************

٦٣٢.ئەگەر پێشتر کتێب و بەرنامەکەی عیسا (علیه السلام ) لەبەر تایبەت بوونی بەکات و شوێن و کۆمەڵگایەکی دیاریکراوەوە، بۆ ڕێکخستنی ژیان و گوزەرانی خەڵکی دیکە نە دەگونجا، ئەو جارە هۆکارێکی دیکەش سەری هەڵدا بۆ زیاتر نەگونجانی کە بریتیە لە گۆڕان و شێوێنرانی ![4]

******************************

٦٣٣.ئایینی خوا هیچ جۆرە سەغڵەتکردن و ناڕەحەتکردنێکی بۆ ئینسانەکان تێدا نیە ![5]

******************************

٦٣٤.زۆربەی خەڵکی نازانێ کە (دین) واتە بەرنامەی ژین، نازانێ کە دیموکراسی دینە، عەلمانییەت دینە، سۆسیالیزم دینە، لیبرالیزم دینە، عەولەمە دینە، هەرشتێك کە خەڵك بەدوای بکەوێ و

---

[1] سەرچاوەی پێشوو-لا-١٥٠

[2] سەرچاوەی پێشوو-لا-١٥٠

[3] زنجیرەی بابەتە هەنوکەییەکان ئەڵقەی یەکەم -گەنجەکانمان لەنێوان ڕەسەنایەتی و لاسایی کردنەوەدا- چاپی یەکەم -ساڵی ٢٠٠٦ ز لا-لا-٢٣

[4] سەرچاوەی پێشوو-٢٤

[5] زنجیرەی بابەتە هەنوکەییەکان ئەڵقەی دووەم -باوریابین داڕووخانی ڕەوشت کۆمەڵگاکەمان بەرەو هەڵدێر دەبات -چاپی یەکەمی نوسینگەی تەفسیر -ساڵی ٢٠٠٧ ز-لا-٦٤

پەیڕەوی لێبکا ئەوە دینیەتی، بەڵکو خەڵك پێی وایە (دین) واتە پەیوەندی نێوان خۆی و خوا، واتە: تەنیا لایەنی ڕووحی، نازانێ کە (دین) واتە بەرنامەی ژیان![1]

*****************************

٦٣٥.(دین) هەوێنی ( ژین )ەو (شەریعەت) هەناوی (میللەت)ە![2]

*****************************

٦٣٦.هەر (دین) ێك کە لە(ژین) دادەبڕێ◆ دەبێتە شتێکی بۆش و ،(ژین) یش ئەگەر بەگوێرەی تەجیهاتی (دین) بەڕێوە نەچێ گەندەڵ و پۆخەڵ دەبێ◆[3]



[1] زنجیرەی بابەتە هەنووکەییەکان ( ئەڵقەی شەشەم) چەند بنەمایەکی گرنگی وتاربێژی -چاپی یەکەم -ساڵی ٢٠٠٦ ز -ل-٥١

[2] قوتابیانی زانیاری شەرعی و چەند سەرنج و ڕێنماییەك -چاپی یەکەم -نوسینگەی تەفسیر-ساڵی ٢٠٠٧-ل-٩

◆ وەک ئایینی گۆڕاوی نەصرانیەت

◆ وەک ژیانی سەرگەردانەی ڕۆژئاواییەکان

[3] سۆزی نەتەوایەتی بیری ناسۆنالیزم لەتەرازوی ئیسلام دا -چاپی سێیەمی نوسینگەی تەفسیر ساڵی ٢٠٠٥ ز-ل-١٨٠

٦٣٧.ڕەسەنایەتی داخوازی ئەوە دەکات کە بابای ڕەسەن (أصيل) یان میللەتی ڕەسەن هەوڵ بدات هەر خێر و چاکەیەکی دیکە کە لەلای خەڵکی هەیە بۆ خۆی نیەتی وە دەستی بێنێ و لە ڕووی سود و بە هرەمە ندبوونەوە بیخاتە گەڵ ئەو خێر و چاکانەی کە هەینی و پارێزگاری لێیان کردوە ![1]

*******************************

٦٣٨.پەی بردن بەو ڕاستیەیە کە فیکر و کلتور و (ثقافة)ی هەر گەل و کۆمەڵگایەك هەڵقوڵاوی دین و عەقیدە و جیهان بینییەتی، بۆیە بانگەشەکردن بە هەموو شێوەیەك بۆ وەرگرتنی فیکر و کلتووری گەل و کۆمەڵگایەك کە دین و عەقیدەو جیهانبینی لە هی ئێمە جیایە بێ ئەوەی مافی لە بێژنگدان و هەڵسەنگاندن و چاك و پیس لێك هەڵاواردنی بە خۆمان بدەین، وێڕای ناشەرعی و گوناهباریی، نا مەنتیقی و عەیبداریشە ![2]

*******************************

٦٣٩.باوەڕ ومتمانە هەبوون بە ڕەسەنایەتی خۆ:، چونکە بابایەك خۆی پێ پووچ و بێ ڕیشەو بێ ئەسل و فەسڵ بێ وەك پووش و پەڵاش و قانگە لۆشك بەدەم هەر پشوە بایەکەوە دەچێ ![3]

*******************************

٦٤٠.ئایا کەسێك خۆی بە دڵسۆزی گەل و میللەتی بزانێ نابێ بەتەنگ دین و کلتور و فەرهەنگ و ڕەوشتی یەوە بێ ؟! کەواتە نابێ خەڵکی دڵسۆز دژایەتی ئیسلام و ئەو کلتوور و فەرهەنگ و ڕەوشت و ئادابەی لێیەوە سەرچاوەی گرتوە بکات، چونکە لەگەڵ دەعوای دڵسۆزی و بەتەنگەوە بوون دا یەك ناگرێتەوە ![4]

*******************************



[1] زنجیرەی بابەتە هەنوکەییەکان -ئەڵقەی یەکەم -گەنجەکانمان لە نێوان ڕەسەنایەتی و لاسایی کردنەوەدا- چاپی یەکەم -ساڵی-٢٠٠٦-ل-٩

[2] سەرچاوەی پێشوو-ل-١٠-١١

[3] سەرچاوەی پێشوو-ل-١١

[4] سەرچاوەی پێشوو-ل-٢٧

٦٤١.بێگومـان گـەل و میللـەتێك گـەنج و لاوەکـانی بـە شـێوەیەکی بەرهەڵـدایی و بـێ یاسـایی بەغەریزەکانی خۆیەوە سەرگەرم کرابێ و خواو خەڵك و قیامەتی لـە بیربرابـێ، لـە کـاتی تەنگانـە و لێقەوماندا و لە مەیدانی دیفاع و بەرگریی داهیچ چاوەڕوانی یەکی لێ ناکرێ ! ![1]

******************************

٦٤٢.ئای جێی خۆی نییە دەمڕاستانی ڕێڕەوی عەلمانییەت ئەگەر لەبەر خوا و خەڵکیش نەبێ هـەر لەبەر خۆیان و، ئەگەر لەبەر دوارۆژ و دینیش نەبێ هەر لەبەر (ژین) یان، زیاتر هەوڵی تێگەیشتن لە ئیسلام بـدەن و چـی دیکـە گـەنج و لاوەکانمـان بـەدەردی کوشـندەی لاسـایی کردنـەوەوە گرفتـار نەکەن؟ ![2]

******************************

٦٤٣.هەرکەسێك ڕێز و تەقدیری نە بێت بۆ ڕابـردووی خـۆی و بـۆ ئـەو سـەروەریی یانـەی کـەباب و باپیرانی تۆ ماریان کردوون، مانای وایە خۆی بێ ئەسڵ و بنەچەکە و بێ ڕیشە دەردێنێ ![3]

******************************

٦٤٤.هەرکەسێك دوێنێی نەبێ ئەمڕۆشی نابێ و، هەر کەسێکیش ئەمڕۆی نەبێ سبەینێشی نابێ![4]

******************************

٦٤٥.قۆناغی گەنجێتی گەنجینەیە کە بە هۆیەوە ئینسان دەتـوانێ کەسایەتیی یـەکی وا بـۆ خـۆی دابڕێژێ، کە خزمەتی خۆی و خاك و میللەتی بکات بۆیە ئینـسان دەربـارەی قۆنـاغی گـەنجێتی بـە تایبەت لێپرسرینەوەی لەگەڵ دا دەکرێ ![5]

******************************

٦٤٦.ئەگەر گەنج و لاوەکانمان مێشك و دڵ و دەروونیان بە عەقیدەی ئیسلامی ڕاست و بیری بـاش ڕۆشن بکرێتەوە و ئەخلاق و ڕەوشتێکی باشیان فێر بکرێ و لەسەر بەرنامەیـەکی ڕاسـت و دروسـت پەروەردە بکرێن، لە ڕاستی دا دەبن بەئەندامی زۆر کاریگەر وە دەبنە خشتێکی بە کەڵك لـە بینـای

---

[1] سەرچاوەی پێشوو-ل-٢٨

[2] سەرچاوەی پێشوو-ل-٢٩

[3] سەرچاوەی پێشوو-ل-٣٦

[4] سەرچاوەی پێشوو-ل-٣٦

[5] سەرچاوەی پێشوو-ل-٤٠

کۆمەڵگاکەمان دا، بەپێچەوانەشەوە ئەگەر عەقیدە و فیکرێکی پووچ و عادەت و نەریتێکی خراپ و ڕەوشتێکی درێو و هەڵس و کەوتێکی نزم فێر بکرێن و لەسەر سیاسەتێکی چەوت پەروەردە بکرێن ئەوە سەرەنجام دەبنە گیاکەڵە و مایەی دەرد و نەهامەتیی بۆ خۆشیان و میللەتە کەشیان! [1]

******************************

٦٤٧.پارێزگاریی لە شتە باشەکانی خۆمان کە ڕەسەنایەتیی یە، لەگەڵ بەهرە وەرگرتن لە شتی چاکی خەڵکی دیکە دوو شتی پێکەوە دژ نین! [2]

******************************

٦٤٨.پێویستە هەموو لایەك ئەو حەقیقەتە بزانین کە پارێزگاریی لێکردنی ڕەسەنایەتی مان نەك هەر ڕێگەمان لێ ناگرێ کەشتی چاك لە خەڵکی دیکە وەربگرین، بەڵکو ئەگەر تۆ بتەوێ پارێزگاریی لە ڕەسەنایەتی خۆت بکەی دەبێ ئەو ڕەسەنایەتی یە موتوور بە بکەی بە شتی چاکی دیکەی خەڵك، بەڵام بە مەرجێك لە چوارچێوەی ئەو شەریعەتە دابێ کە بناغەی ڕەسەنایەتی یەکەتە! [3]

******************************

٦٤٩.دیاردەی لاسایی کردنەوە جاچ لە تاکێك دا بێتە دی و چ لە کۆمەڵ و میللە تێك دا، لە باوەڕ بە خۆ نەبوون و متمانە بەخۆ نەبوونەوە سەرچاوە دەگرێ، کاتێك ئینسان متمانە و باوەڕی بە خۆی و دین و کلتورو فەرهەنگ و مێژووی خۆی و گەلەکەی نەبوو، سیاسەت و فیکر و فەلسەفە و عادەت و ئەخلاقی خەڵکی دی دەکاتە ڕێشمەیەك و لە گەردنی خۆی قایم دەکات و بەچاو نووقاوی بەدوای دەڕوات و خۆی تەسلیم دەکات! [4]◆

******************************



[1] سەرچاوەی پێشوو-ل-٤٠-٤١

[2] سەرچاوەی پێشوو-ل-٤٧

[3] سەرچاوەی پێشوو-ل-٥١

[4] سەرچاوەی پێشوو-ل-٥٤

◆ دیارە کەسێکیش و کۆمەڵێکیش بەو جۆرە ڕەفتا دەکات پەتی تەقلید لە گەردنی خۆی توند دەکات کەوا گومان دەبات و، پێی وایە شایەنی ئەوە نیە بە عەقڵی خۆی بیر بکاتەوە، بۆیە خۆی ناچار دەبینێ کە بە عەقڵی خەڵك بیر بکاتەوە!

٦٥٠.لاسایی کردنەوە (تقلید) ئەوەیە کە تۆ بەچاك و خراپ بە دوای کابرا بکەوی بێ ئەوەی بزانی کە داخوا زەرەری لێ دەکەی یان قازانج![1]

******************************

٦٥١.دەبێ ئێمە باوەڕ مان بە خۆمان بێت کە خاوەنی ڕابردوویکین و ئێمە درەختێکی بێ ڕەگ و ڕیشە نین و میللەتێکی بێ مێژوو نین، ئێمە میللەتێك نین بێ سەروەری بین، ئێمە دەیان ڕابەرو سەرکردەمان هەیە لە مەیدانی خەباتی ڕزگاریی خوازی دا کە لەسەرکردەو ڕابەرانی گەلانی دیکە کە مترنین![2]

******************************

٦٥٢.ئێمە خاوەنی دینێك نین ڕابردوویەکی پرشنگدار و مێژوویەکی شکۆمەندی جێی شانازی بۆ نەڕەخساندبین، تاکو قێزمان لە خۆمان بێتەوە و خەت بەسەر ڕابردووی خۆمان دا بێنین![3]

******************************

٦٥٣.خوا وایکردووە کە پیاو حەزی لە ئافرەت بێت و مەیلی جینسی بۆی هەبێت و ئافرەتیش بەهەمان شێوە لەگەڵ پیاو دا وابێت، خوا وایکردووە و فیترەت و سروشتیی ئینسان وایەو خوای کاربەجێش ئینسانی لەسەر ئەو فیترەت و سروشتە خولقاندوە، بەڵام شەریعەت دەفەموێ وەك چۆن ئینسان تینو دەبێ بەڵام گەیشتە هەر ئاوێکی پیس نایخواتەوە و پێیدا نانووسێ! وە ئینسان برسی دەبێ، بەڵام گەیشتە هەر شتێك نایخوات، بەڵکو تەماشا دەکات چ شتێك خاوێن و چاکە چ شتێك بەرژەوەندی دابین دەکات و لە قازانجی بەدەنی دایە ئەوە دەخوات و ئەوە دەخواتەوە، وە ئینسان پێویستی بە بەرگ و پۆشاك هەیە، بەڵام هەموو شتێك هەر لەبەر ناکات، بەڵکو پۆشاکێك کە لەگەڵ بەدەنیدا گونجاو بێت دەپۆشێ![4]

******************************



[1] سەرچاوەی پێشوو-لا-٥٧

[2] سەرچاوەی پێشوو-لا-٦٩

[3] سەرچاوەی پێشوو-لا-٦٩

[4] زنجیرەی بابەتە هەنوکەییەکان ئەڵقەی دووەم -باوریابین داروخانی ڕەوشت کۆمەڵگاکەمان بەرەو هەڵدێر دەبات -چاپی یەکەمی-ساڵی ٢٠٠٧ ز-لا-٣٣

٦٥٤.ئێستا نەك هەر تەنها ئافرەتان، بگرە هەر بەرگ و پۆشاکی کوردی بەگشتی و لەلایەن زۆربەی چین و توێژەکانی میللەتەکەمانەوە، بە تایبەت لەشارەکاندا بووە بەشتێکی عەیبە !وەچاولێکردن و لاساکردنەوەی بێگانە تەنانەت لە بەرگ و پۆشاکیشدا بۆتـە نیـشانەی شارسـتانێتی و پێشکەوتن! کە ئا ئەوە پێناسە (هویة) لێ ون بوونەو خۆ لێ بزربوون و خۆ دۆراندنەو دەروون بەزینەو کەم و زۆر پەیوەندی بەشارستانەتییەوە نیە ![1]

*******************************

٦٥٥.لـە هـەر رووێکـەوە تەماشـای بکـەی ئـەو رووتـی و بـێ بەنـدوباریی و چـاولێکردن و لاسایکردنەوەی، ئەهلی کوفر جگە لەزەرەر و زیان هیچ بەرهەمێکی دیکەی نیە، ئیدی ئێمە نـازانین چ فەلـسەفەیەکی تێدایـە و چ هونـەرێکی تێدایـە ؟! بەتەئکیـد لەهـەموو رووەکـانی، ئـابووری، ئەدەبیی، فیکریی، زانستیی، تەندروستیی، نەتەوایـەتیی، ئـەمنیی ... هتـد ەوە ئـەو پـەڕی زیـانی تێدا یەو من ناتوانم تاکە قازانج و بەرهەمێکی بژمێرم ![2]

*******************************

٦٥٦.بەڕاستی دەبـێ ئێمـە شۆڕشـێکی عەقیـدەیی و فیکریـی و فەرهـەنگی بکـەین ئـەویش بریتیـە لەگەڕانەوە بۆ سەر رەسەنایەتیی دینی خۆمان، ئێمە میللەتێکی بـێ فەرهـەنگ و بـێ ناسـنامەنین، فەرهەنگ و هەویەی خۆمانمان هەیە، و بێگومان ئەو شۆڕشە عەقیدەیی و فەرهـەنگی و فیکرییـەش وەك پێویست بەهەموو لایەکمان دەکرێت ![3]

*******************************

٦٥٧.بۆ چی دەبێ ئێمە هەر شوێنیکەوتە و لاساکەرەوەی خـەڵك بـین کـە خـوا خەشـم و غـەزەبی خۆی بەسەردا ڕشتوون و خویان گیریان خواردوە بـە دەسـتی خۆیانـەوە؟! بـۆ چـی نـابێ بیرێکـی جیدی بکەینەوە کە گۆڕان و وەرچەرخانێکی ریشەیی لە هەموو بوارەکانی ژیان و گوزەرانـدا رووە و ئیسلام بەسەر خۆمان دا بهێنین؟! [4]

*******************************

---

[1] سەرچاوەی پێشوو-ل-٤٥
[2] سەرچاوەی پێشوو-ل-٥٩
[3] سەرچاوەی پێشوو-ل-٦٠
[4] سەرچاوەی پێشوو-ل-٦٧-٦٨

٦٥٨.درەختی خەسڵەتە مەعنەوییە بەرزەکان مەحاڵە لەسەر زەمینەی بەرژەوەندی یە ماددیەکان بڕوێن و ڕەگان داکوتن، چونکە گۆزەچی تێدا بێت هەرئەوەی لێ دەڕژێت و لەسەر سەرانگۆیلکیش دار مێونارڕوێ![1]

*******************************

٦٥٩.ڕەوشت: کە بەرهەمی هەستی چاکە خوازییە، بریتییە لە پەی بردن بە ڕێکو پێکی و هاوسەنگی غەریزە و مەیل و ئارەزووەکان![2]

*******************************

**٦٧٠.هەتا دڵ ساغ و ڕووناك نەبێ، زمان ڕاست و پاك نا بێت و، بەبێ دڵی ساغ و ڕووناك و زمانی ڕاست و پاکیش، ڕەوشتی بەرز و چاك دەستگیر نابێ![3]**

*******************************

**٦٧١.ئینسان بەبێ خورەوشتی بەرزو پەسەند و بەرز و جوان نا توانێ ژیانێکی پاك و چاك و بەختەوارانەی شایستەی ئینسان بەرێتە سەرێ![4]**

*******************************

٦٧٢.بە داڕووخانی ئەدەب و ڕەوشتە بەرزەکان، و ژێر خانی ڕووحی و فیکری و کلتوریی کۆمەڵگا هەڵدەتەکێ و، بڵاوبونەوەی خووخدە و ڕەوشتی بەد و دزێویش وەك دەرد و پەتایەك سەرجەم لایەنەکانی ژیان و گوزەران گەندەڵ دەکات![5]

*******************************

---

[1] پوختەیەك دەربارەی ئیسلام لەبەر ڕۆشنایی سورەتی فاتیحە دا -چاپی دووەم -لا -١٨٩

[2] خواناسیی ئایین ئیمان -ڕاستییەکان ئیسلام دەدرەوشێنەوە ئەفسانەکانی ڕێچکان دەپووچێنەوە-چاپی یەکەم ساڵی ٢٠٠٠ ز-لالا-٤١

[3] ڕێگای صالح بوون و بەرەو خواچوون -تەزکیەی نەفس لەبەر ڕۆشنایی قورئان سوننەت دا -چاپی یەکەمی نوسینگەی تەفسیر -ساڵی ٢٠٠٥ ز-لا-٩٨

[4] زنجیرەی بابەتە هەنووکەییەکان ئەڵقەی دووەم-باوریابین داڕوخانی ڕەوشت کۆمەڵگاکەمان بەرەو هەڵدێر دەبات-چاپی یەکەمی نوسینگەی تەفسیر -ساڵی ٢٠٠٧ز-لا-٧

تێبینی: نامیلکەیە دوو جاری تر چاپ کراوە بەڵام ئەوەی ئێمە لێمان وەرگرتوە چاپی یەکەمی نوسینگەی تەفسیرە واتا ئەم نامیلکەیە سێ جار چاپ کراوە .ئامادەکار

[5] سەرچاوەی پێشوو-لا-١٠

٦٧٣.دەگونجێ ئینسان زانا بێت، دەگونجێ لە عیبادەتدا زۆر خـۆی مانـدوو بکـات، دەگـونجێ زۆر خاوەن دەسەڵات بێت، وە هەروەها بەڵام مەگەر پەیوەندی زۆر قایم و مەحکەمی لەگەڵ خـوا (جـلّ جلاله) هەبێ، مەگەر عەبدی زۆر باش بێ بۆ خوا، ئەگەر نا ناتوانێ هەمیشە ڕەوشتی بەرز و جوانی هەبێت![1]

******************************

٦٧٤.( وَإِنَّك لَعَلى خُلُقٍ عَظِيمٍ) ( إنَّ ) ئەداتی تەئکیدە، واتە: بە تەئکیدی تۆ ( لَعَلـى خُلُـقٍ عَظِـيمٍ ) واتە: وەکو ئەوە کە ڕەوشتی بەرز و جوان وڵاخێکی سواری بێت و پێغەمبەریش(ﷺ) سـواری بـوو بێت و لەسەر پشتی بێت، واتە ئەوەندە ڕەوشت بەرزی، وەك ئەوەی کە ڕەوشت بەرزیی بۆ تۆ بـوو بێتە (مرکوب) ێك، تۆش لەسەری سەقامگیر بووبێ![2]

******************************

٦٧٥.میللەتێك کە شیرازەی ڕەوشتی دەپچڕێ و تووشی داڕووخانی ئەخلاقی دەبێ، ئەوە بێگومان لە نێو خۆیدا گەندەڵ دەبێ، وەك دار– درەختێك–ی کرمێ پێویستی بەکەس ناکات ببڕێتـەوە و هەر لەبەهانەیە بۆ پشووە بایەك کە بیخات، چونکە لـەنێو خۆیـدا گەنـدەڵ و کرمـۆڵ بـووە، بـەڵێ ڕەوشتی نزم و نەمان و داڕووخانی ڕەوشتی بەرز و جوان، میللەتان گەندەڵ و کرمۆڵ دەکات و لـە بەینیان دەبات![3]

******************************

٦٧٦.میللەتێك ئەخلاقی نەماو فەسادی جینسی تێدا بڵاوبوەوە میللەتێك ڕەوشتی بەرز و جوانی تێدا ڕووخـا، ئـەو میللەتـە پێویـستی بەکـەس ناکـات بیـچەوسێنێتەوە و بیڕووخێنـێ، بـەڵکو بـۆ خـۆی ڕووخاوەو بۆ خۆی گەندەڵ بووە و کرمۆڵ بووە![4]

******************************

٦٧٧.بێگومان ئیمە کاتی خۆی کە (ڕژێمی بەعس) مان ڕاونـاو ڕووخانـد تـەنها ئەوەنـدە نـەبوو کە دەسەڵاتەکەی لەلای خـەڵك ڕەفـز بێت، بـەڵکو ئـەو فەرهـەنگ و خـوو نەریتـە نـەفامیی و ڕەوشت

---

[1] سەرچاوەی پێشوو–ل–٢٢–٢٣

[2] سەرچاوەی پێشوو–ل–٢٣

[3] سەرچاوەی پێشوو–ل–٢٥

[4] سەرچاوەی پێشوو–ل–٥٢

نزمییەش کە بەعس بڵاوی دەکردەوە هەر ڕەفز بوو، وەفیکر و فەلسەفەیەکیش کە بڵاوی دەکردەوە دەبێ هەر ڕەفز بێت![1]

******************************

٦٧٨.خووڕەوشتی بەرز و جوان بە مەفهوومی فراوانی خووڕەوشت میوە و بەرهەمی ئیمان و عیبادەت و تەقواو تەزکیەیە و لە ئەنجامی هەمووی دا ئینجا ئینسان خووڕەوشتی بەرز و جوان دەبێ![2]

******************************

٦٧٩.شتێکی ڕوون و بێ پێچ و پەنایە کەخووڕەوشتی بەرز و پەسەند لە ژیانی کۆمەڵگادا وەك جومگە و ژێیەکان وایە بۆ جەستە و هیچ خەڵك و کۆمەڵگایەك ناتوانێ ژیانێکی ساغ و سەلیم و بەختەوەرانەی هەبێ، بەبێ خۆڕازاندنەوەی تاکەکانی بەو ڕەوشت و بەها بەرز و پەسەندانەی کە هەموو پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) و سەرجەم عاقڵ مەندانی دونیاو هەوڵی بڵاکردنەوەو ڕەواج پێدانیان داون و هاوکات لەگەڵ بەرجەستە کردنیان لە خۆیان دا خەڵکیشیان بۆ هانداون![3]

******************************

٦٨٠.ئەوەی کە مسوڵمانەتی و دینداریی ئینسانی پێ لە مەحەك دەدرێ و پێ ی کێشانە دەکرێ بریتیە لە خورەوشتی بەرز و پەسەند![4]

******************************

٦٨١.خووڕەوشت هەوێنی ژیانی میللەت و کۆمەڵگایەو ڕووحێکە هەرکاتێك ئەو ڕووحە لە هەر میللەت و کۆمەڵگایەکدا نەما، ئەو خەڵك و کۆمەڵگایە بۆگەن دەکاو گەندەڵ و پووچەڵ دەبێ![5]

******************************

---

[1] سەرچاوەی پێشوو-ل-٦٠

[2] زنجیرە بابەتە هەنوکەییەکان -ئەڵقەی چوارەم -چۆنیەتی بوونە پێشەنگ و بنیاتنانی بنکەی جەماوەریی- چاپی یەکەم -ساڵی ٢٠٠٧ -٢٦

[3] زنجیرە بابەتە هەنوکەییەکان -ئەڵقەیهەشتەم-خووڕەوشتی بەرزو پەسەند سەنگی مەحەکی مسوڵمانەتیە -چاپی یەکەم --ساڵی ٢٠٠٧ز-ل-٨

[4] سەرچاوەی پێشوو-ل-١٢

[5] سەرچاوەی پێشوو-ل-١٥

٦٨٢.سیفەتە بەرز و پەسەندەکانی وەك: ڕاستگۆیی، ئازایەتی، دەستپاکی، بەخشندەیی، خۆبەکەمگریی، دادگەری، بەزەیی ..هتد کاتێك دەبنە ڕەوشت و ئاکاری جێگیر کە ڕەگ و ڕیشە لە فیطرەت و دەروونی مرۆڤدا دادەکوتن و دەبنە بەشێکی پێکهێنەری ![1]

*******************************

٦٨٣.خووڕەوشتی بەرزو پەسەند تایبەت نی یە بە مرۆڤی مسوڵمانەوە، بەڵکو پەیوەندی بەفیطرەتی ئینسانەوە هەیە ![2]

*******************************

٦٨٤.مسوڵمانی ڕەوشت بەرز دۆست و خۆشەویستی خودایە و ئیمانێکی کامڵی هەیە، بەواتایەکی دی مروڤـ ڕەوشت و ئاکاری بەرز و جوان نابێ هەتا ئیمانێکی باشی نەبێ و لای خوا نزیك و خۆشویستراو و پەسەند نەبێ![3]

*******************************

٦٨٥.ئاکاری جوان و شیرین و ڕەوشتی چاك ئاوێنەیەکە کە ئینسانی مسوڵمان ڕادەی ئیمان و تەقوای مسوڵمانەتی خۆی تێدا دەبینێ و، پێوە و تەرازوویەکە خۆی پێ دەناسێ و هەڵدەسەنگێنێ ![4]

*******************************

٦٨٦.خوو ڕەوشتی بەرز و پەسەند سەنگی مەحەکی مسوڵمانەتیی یە ![5]

*******************************

٦٨٧.ئەگەر دەمانەوێ ڕەوشتی بەرزو جوان بە بەرجەستەکراویی ببینین، با تەماشای (محمد) (ﷺ) بکەین، وە هەروەها کاتێك ئێمە ڕەوشتمان بەرز و جوان دەبێ ،مانای وایە ئەو مەبەست و ئامانجەمان هێناوەتەدی، کە پێغەمبەری خوای (ﷺ) بۆ ڕەوانە کراوە ![6]

---

[1] سەرچاوەی پێشوو-لا-٢٠

[2] سەرچاوەی پێشوو-لا-٢١

[3] سەرچاوەی پێشوو-لا-٣١

[4] سەرچاوەی پێشوو-لا-٣٩

[5] سەرچاوەی پێشوو-لا-٣٩

[6] سەرچاوەی پێشوو-لا-٤٤

٦٨٨.بە هۆی شوێنکەوتنی پێغەمبەری خواوە(ﷺ) ڕەوشتمان بەرز و جوان دەبێ و لە ئاکامی ئەوەشدا دەبینە خۆشەویستی خواو خۆشەویستی خۆشەویستی خوا![1]

******************************

٦٨٩.ئینسان بەهۆی ڕەوشتی بەرزو جوانەوە هەم لە دنیادا لە عەیبداریی دەپارێزرێ و هەم لە دوا ڕۆژیشدا لە گوناهباریی و ڕەنج بە خەساریی![2]

******************************

٦٩٠.کاتێك مرۆڤی مسوڵمان بەمانای وشە ڕەوشت بەرز و ئاکار پەسەند دەبێ، کە هەوڵی لە خۆدا بەرجەستە کردنی هەموو جۆرەکانی ڕەوشت و خووی پەسەن بدات لە هەموو بوارەکاندا![3]

******************************

٦٩١.بۆ ئەوەی بزانین مسوڵمانێتیی یەکەمان چۆن و چەندە دەبێ تەماشای خورەوشتمان بکەین، چونکە بەڕاستی خووڕەوشتی بەرز و پەسەند پێوەر و تەرازوێکە کە مسوڵمانێتی ئێمەی پێ دەپێورێ و دەکێشرێ![4]

******************************

٦٩٢.هەرگیز ناگونجێ مرۆڤ ئیمانی باشی هەبێ و ڕەوشتی بەرز و جوانی نەبێ! بۆچی؟! چونکە ئینسان کاتێك ئیمانی باشی دەبێ کە پەیوەندی لەگەڵ خوا قایم و توند و تۆڵ بێ، وە تەنها کاتێکیش پەیوەندی لەگەڵ خوا توندو تۆڵ دەبێ کە خاوەنی هەموو ڕەوشتێکی بەرز و پەسەند و جوان بێ و لە هەموو کەم و کورییەك بەدوور بێ، ئەگەرنا چۆن دەگونجێ تۆ ئیماندار بی و خاوەنی ڕەوشتی بەرز نەبی، یان لە ڕەوشتی دزێو و ناشیرین بەدوور نەبی؟!![5]

******************************

---

[1] سەرچاوەی پێشوو-ل-٤٧

[2] سەرچاوەی پێشوو-ل-٥٥

[3] سەرچاوەی پێشوو-ل-٨٢

[4] سەرچاوەی پێشوو-ل-٨٣

[5] سەرچاوەی پێشوو-ل-٨٣

٦٩٣.مادام خورەوشتی بەرزو پەسەند سەنگی مەحەکی مسوڵمانەتیەیە، دیارە خورەوشتی درێو ناشیرینیش بەڵگەی دووری یە لە ئیسلام![1]

*******************************

٦٩٤.با وریابین و دڵنیابین بە ئەندازەی ئەوە کە خورەوشتمان جوان و بەرز و پەسەند دەبێ، بەو ئەندازەیەش دەتوانین بڵێین مسوڵمانین![2]

*******************************

٦٩٥.هەرکەسێك هەرچەندە زمانی قسەو گوتاری چاك و جوان بێ، مادام زمانی کردار و حاڵی وێران و خراپ بێ، خەڵك قسەکانیشی لێ وەرناگرێ! وەك پێشینانی خۆمان دەڵێن: (ئەوەیە وەستای قسان و کوڵەواری دەستان)!![3]

*******************************

٦٩٦.قسەی زۆر باش ئینسانی زۆر باش دەیکات و کردەوەی زۆرباش ئینسانی زۆرباش دەیکات! وەك گوتراوە: (گۆزە چی تێدا بێ هەر ئەوەی لێ دەرژێ)![4]

*******************************

٦٩٧.کەسێك خۆی دینی نەبێت موستەحیلە دینداریی فێری خەڵك بکات، وە کەسێك بروای بەو قیەم و ئەدەب و ئەخلاقە نەبێ کە لەدینەوە سەرچاوە دەگرێت، موستەحیلە مادام خۆی نیەتی خەڵکی لێ بەهرەمەند بکات![5]♦

*******************************

٦٩٨.بە ئەندازەی پابەندیمان بە قورئان وسوننەتەوە و مل کە چیمان بۆ بڕیارەکانی شەرع و ڕاست و ساغبوونمان لەگەڵ خوادا ، دەتوانین خۆمان لەخووخدە پیس و بەدەکان بێزار بکەین و بەڕەوشت و ئەدەب و ئاکارە بەرز و پەسەندەکان برازێنینەوە![6]

*******************************

٦٩٩.تەنها بۆ خوا سوڵحاوان و لەگەڵ خوادا ڕاستان دەتوانن خاوەنی ڕەوشتی بەرز بن، خاوەنی ئەدەبی بەرز بن![7]



[1] سەرچاوەی پێشوو-ل-٨٤

[2] سەرچاوەی پێشوو-ل-٨٤

[3] زنجیرە بابەتە هەنوکەییەکان -ئەڵقەی دەیەم-بانگەواز بۆلای خودا چییەو چۆنەو بەکێ و بۆچی دەکرێ؟چاپی یەکەم -ساڵی-٢٠٠٧ز-ل-١١

[4] سەرچاوەی پێشوو-١٥

[5] ئافرەتی مسوڵمانی کورد مافە شەرعییەکانی و ئەرکە گرنگەکانی -چاپی یەکەم -ساڵی ٢٠٠٣ ز-ل-٦

♦ سەرچۆپی بدە دەست گامێشێ بەرە و کادینێ دەیکێشێ!

[6] هەڵس و کەوت لەگەڵ خەڵکی دا و چەند ئامۆژگاری یەك بۆ ئەندام و موجاهیدانی کۆمەڵی ئیسلامی -چاپی یەکەم -ساڵی ٢٠٠١ز-٥

[7] سەرچاوەی پێشوو ل-٧

٧٠٠.بەپێی فەرمانی خوا، لەسەرتان پێویستە لەسەر مافی ڕەواو بەشی خوراوو ڕەنجی براوو گەنجی دزراوتان وەدەنگ بێن و نەیەڵن کەس خۆتان لێ بکاتە فیرعەون و بەبلاش و حەلاش خۆتان لەسەر بکاتە نۆو نیو ![1]

*******************************

٧٠١.خزمەت کردن بەئەدەب و زمانی هەر نەتەوەیەك بەجێ هێنانی یەکێکە لە یاساکانی ئیسلام، مادام ئەو ئەدەب و زمانە بەکاربهێنرێ بۆ ڕوون کردنەوە و خستنە ڕووی ئیسلام، یان هەر زانیاریەك کە سودمەن بێ بۆ گەل و میللەت![2]

*******************************

٧٠٢.ئیسلام ڕێ لە هیچ ئینسانێك ناگرێ کە گەل و نیشتیمانەکەی خۆی خۆش بوێ و پێی هەڵا بڵێ، چونکە ئیسلام دەزانێ کەسۆزی مرۆڤ سەبارەت بەگەل و نیشتیمانی شتێکی ڕەسەنە لەسروشتی دا![3]◆

*******************************

٧٠٣.با چاکیش بزانین کە هەرچی ڕێچکە و بیردۆزە و کوێرەڕێی مرۆڤکرد هەن تێکڕا کۆبکرێنەوە بەهەموویان ناتوانن نەگەلی کورد و نەهیچ گەلێکی دیکەش بە ئامانج بگەیەنن و لە مەینەتی دەری

---

[1] دەبەرێك ڕاجونی ئیسلام و ڕێچکان –چاپی سێیەم –ساڵی ٢٠٠٦ ز–لا –٣٥–٣٦

[2] سۆزی نەتەوایەتی بیری ناسیۆنالیزم لەتەرازووی ئیسلام دا –چاپی یەکەمی نوسینگەی تەفسیر –ساڵی ٢٠٠٥ ز–٧٨

[3] سەرچاوەی پێشوو لا–٨١

◆ بەڵام بەدو وەمەرجی گرنگ :

١–خۆشەویستی یەکە لە ئەندازەی ماقووڵی خۆی دەرنەچێ و لەسەر حیسابی لایەنەکانی دیکە نەبێت، سادەتر بڵێین: گەل و خاك و ئاوەکەی نەکاتە بت و سەنەم و لەجیاتی خوا نەیان پەرستێ

٢–لەو خۆشەویستی و سۆزەی لەمپەر و چەپەرێك دروست نەکات کە ببێتە هۆی گۆشەگیری کردن و دابڕانی گەلەکەی لە کۆمەڵگای بەرفراوانی مرۆڤایەتی، بەواتایەکی دیکە: نابێ سۆزی نەتەوایەتی وای لێ بکات بەس خۆی بێتە بەرچاو و کەسی دی بە بیردا نەیەت و، لە قاوغ و قەپێلکی نەتەوایەتی خۆی دا کۆشمەڵە بکاو، هەست بە بوونی کەسی دیکە نەکات، یان ئەگەر هەستی شی پێ بکات بە کەم و کورت و ناتەواوی حسێب بکات . سۆزی نەتەوایەتی /هەمان لاپەرە .

بێنن، چونکە ئەو بیردۆزە دەستکردانە بۆ خۆیان دەردن، جا نازانم کەی دەرد بەدەرمان دانراوە؟![1]

******************************

٧٠٤. کورد بەهۆی ئیسلامەوە کیان و کەرامەتی پارێزرا و دەبێ و، ئیسلامیش بە هۆی کورد و غەیری کوردیشەوە لە گەلانی مسولمان بەرێوە براوە و دەبرێ و پارێزراوە و دەپارێزرێ![2]

******************************

٧٠٥.ئێمە ئەگەر لە مێژووی ڕابردوومان دا خێر و خۆشی یەکمان دەست کەوتبێ و ناوێکمان چووبێتە نێو ناوانەوە و سەروەریی یەکمان تۆمار کردبێ، تەنها لە ژێر سایەی ئیسلام و لە باوەشی عەقیدە و فیکر و پەروەردەی ئیسلامیی دا بووە چ لەڕووی سیاسی، چ فیکریی و ئەدەبیی، چ زانستی ... چ هەر ڕوویکی دیکەوە![3]

******************************

٧٠٦.لە ڕاستی دا ئێمە تەنها ئەوەمان هەیە کە لەسایە و لە باوەشی ئیسلام دا پەیدامان کردوە، تەنانەت ئەو میرنشینانەی کە مێژوو بۆی تۆمار کردووین وەك کیان و قەوارەی نەتەوەیی![4]

******************************

٧٠٧.هەرکەسێك وڵاتێکی ئازاد و گەلێکی ڕزگاری نەبێ بەڕاستی ناتوانێ شەریعەتی خوای بەسەردا جێبەجێ بکات![5]

******************************

٧٠٨.ئێمە خوا لەسەر زەویی دایناوین، ئەگەر ئەو زەوییە ئازاد نەبێ، گەر ئەو گەلە سەربەست نەبێ، چۆن ئایینی لەنێو پیادە دەکرێ؟ گەلێکی ژێر دەس و کۆیلە ناتوانێ، ئایینێ کە سەرچاوەی سەرفرازیی بێ، ئایینێ بۆیە هاتبێ سەرفرازیی و سەربەرزیی پێ ببەخشێ، گەلێکی ژێر دەس و

---

[1] سەرچاوەی پێشوو لا-٩٥

[2] سەرچاوەی پێشوو لا-١٨٠

[3] زنجیرەی بابەتە هەنوکەییەکان ئەڵقەی یەکەم -گەنجەکانمان لەنێوان ڕەسەنایەتی و لاسایی کردنەوەدا- چاپی یەکەم -ساڵی ٢٠٠٦ ز لا-٦١

[4] سەرچاوەی پێشوو-٦١

[5] کارو پرۆژەیی ئیسلامیی مان -چاپی یەکەم -ساڵی ٢٠٠٥ ز -لا -٥٧

كۆیله، كه وولاته‌كه‌ی زه‌وتكرابیٚ، ناتوانیٚ ئه‌و ئایینه پرشكۆمه‌نده، ئه‌و ئایینه سه‌ربه‌رزه له‌نێو خۆیدا پیاده بكا![1]

******************************

٧٠٩.ئێمه نه‌ك له غه‌یر، په‌ند و ده‌رس له‌ته‌جروبه تاڵ و گرچوو بڕه‌كانی خۆشمان وه‌رناگرین![2]

******************************

٧١٠.گه‌لێكی خاوه‌ن ئیمانی دلٚ پێكه‌وه جۆشدراو و یه‌كگرتوو و له‌سه‌ر پێی خۆی وه‌ستاو پشت به‌خوا به‌ستوو و ژیرو وریاو بێدار و تێگه‌یشتوو و ساغ و بۆ خوا یه‌كلابووه و به‌گوێره‌ی په‌یڕه‌وی خوا به‌ڕێوه چوو، مه‌حاله مه‌حاله ببێته نێچیرێكی فه‌قیرحاڵ و بیٚ په‌ڕو باڵ و به تۆڕو داوی نه‌خشه‌و پیلانه‌كانی دوژمن و ناحه‌زانی یه‌وه بیٚ![3]

******************************

٧١١.كورد له ژێر سایه‌ی ئیسلام و له چوارچێوه‌ی شه‌ریعه‌تی خوادا نه‌بیٚ له‌ژێر سایه‌ی هیچ به‌رنامه‌و له‌بازنه‌ی هیچ فیكره‌یه‌كی تردا جێگای نابێته‌وه![4]

******************************

٧١٢. ئه‌گه‌ر كورد شوێن كه‌وته‌ی ئیسلام و دوایین نوسخه‌ی هیدایه‌تی شیفا به‌خشی خوا بێت چۆن بۆ چاره‌سه‌ری ده‌ردو نه‌خۆشی یه‌كانی و سارێژكردنی برینه‌كانی ڕوو له‌كه سانێك ده‌نیٚ كه‌ماك و سه‌رچاوه‌ی نه‌خۆشی و ده‌رده‌كاننی![5]

******************************

---

[1] سنوره قه‌ده‌غه‌كان مه شكێنن –ده‌قی گفتوگۆیه‌كه دكتۆر حوسێن محمد عه‌زیز له‌گه‌ڵ مامۆستا عه‌لی باپیردا ئه‌نجامی داوه ماوه‌یه‌ك به‌ر له‌ده‌ستگیركردنی له‌لایه‌ن ئه‌مریكیه‌كانه‌وه – چاپی دووه‌م ٢٠٠٤ز –لا–٥٣

[2] چاره‌سه‌ری كێشه‌ی كورد له‌نێوان ئیمان و په‌ڕله‌مان –چاپی یه‌كه‌م–ساڵی ١٩٩٢ز–لا–١٥

[3] سه‌رچاوه‌ی پێشوو–لا–٦٦

[4] گۆڤاری په‌یڕه‌و –ژماره (١) بابه‌تی كوردستان و قه‌یرانی بیٚ به‌رنامه‌یی –ساڵی –١٩٩٥ز–لا–٤
تێبینی: ئه‌م گۆڤاره له‌لایه‌ن ڕاگه‌یاندنی مه‌كته‌بی ڕێكخستنی بزوتنه‌وه‌ی ئیسلامی جارانه‌وه ده‌ركراوه : خاوه‌نی ئیمتیازه‌كه‌ی مامۆستا علی باپیر و–سه‌رنوسه‌ره‌كه‌ی كاك شوان هه‌ورامی بووه.

[5] سه‌رچاوه‌ی پێشوو–لا–٤

٧١٣.گریمان کورد هەمووی هاتە سەر ئەو قەناعەتە کەعەلمانی بێت و بڕواشی بەئیسلام نەمێنێت، کە موستەحیلە شتی وانابێت، بەڵام لە حاڵێکی واشدا قەناعەتم هەیە کیانی هەبێت ![1]

******************************

٧١٤.گەر نەسرانیەك، یەزیدیەك، هاواریەك، ناموسڵمانێك هەرکەسێکی هەیە، بکوژرێ و بەناهەق خوێنی بڕژێ و منیش بتوانم نەهێڵم و کەمتەرخەمی بکەم خۆم بە گوناهبار دەزانم چونکە تۆ هاوزمان و هاووڵات و هاونیشتیمانی منی، پێکەوە دەژێین![2]

******************************

٧١٥.مسوڵمانێکی کورد ئەگەر لە دینەکەی حاڵی بوو بێت دڵسۆزە بۆ میللەتی بۆ ووڵاتی، بۆ نیشتمانی، دیفاعی لێدەکا، دەیپارێزێ، هەوڵدەدا بۆ بەختەوەری، ئەوەش کە دەیکا وەکو دینداری دەیکا کەواتە کوردا یەتییەکەی بەشێکە لە مسوڵمانیەتی یەکەی ![3]

******************************

٧١٦.هەرئینسان و گەل و کۆمەڵگایەك ئەگەر ئاوڕدانەوەی بۆ ڕابردووی نەبێت دووچاری لادان و هەڵەو کەمو کوڕی دەبێت ![4]

******************************

٧١٧.چاوەڕوانیمان لەمیللەتی خۆمان بەگشتی ئەوەیە: دەستبارمان بۆ بگرن و، ئێمە بەهی خۆیان بزانن، هەر کەسێ خۆی بەمسوڵمان دەزانێ، لە خەڵکی عەشایەر، لە خەڵکی بازاڕ و ئەهلی کەسابەت، لە خەڵکی ئەهلی تەریقەت، لەمۆستایانی بەڕێز ... مامۆستایانی میحراب و میمبەرەکان، مامۆستایانی قوتابخانەو پەیمانگاکان و زانکۆکان، لە خەڵکی ڕیش سپی و پیاو ماقوڵاو سەرۆك عەشیرەت، لەبرایانی سەلەفی، هەرکەسێ خۆی بە مسوڵمان بزانێ باخۆی لە ئێمە بە نزیك بزانێ، ئێمە ئەوان بەهی خۆمان دەزانین، خۆشمان بەهی ئەوان دەزانین، لە مەیدانیدا ئێمە بەیەکەوە دەمێنینەوە، ئێمە بەکەڵکی یەکتر دێین، ئەو چاوەڕوانییەمان لێیان هەیە، ئێمە بەهی خۆیان بزانن و خۆشیان بەهی ئێمە بزانن، پێمان دڵخۆشبن![5]

---

[1] گۆڤاری ستاندەر –ژمارە(١٧) ساڵی ٢٠٠٧ز دیداری ڕۆژنامەنوسیی –ل–٢٢

[2] سەرچاوەی پێشوو–ل–٢٤

[3] ڕۆژنامەی کۆمەڵ ژمارە (١٨٩)–ل–٢

[4] سەرچاوەی پێشوو–ل–٢

[5] ڕۆژنامەی کۆمەڵ– ژمارە (١٥٥)ل–١٢

٧١٨. چارەسەر کێشەی کورد لە ڕوانگەی ئیسلامەوە بەوە دەبێت کە کوردیش وەك هەموو گەل و نەتەوەکانی دیکەی جیهان گەلێکی ئازاد و سەربەخۆ بێت و خاوەنی نیشتیمان بێت![1]

******************************

٧١٩.ئیسلام نەك هەر زیانی بۆ گەلی کورد و هیچ گەلێکی دیکەش نەبووە، بەڵکو گەورەترین و بەپیت و پیرۆزترین نیعمەت بووە و، نەك هەر ماکی دەردو نەخۆشیەکانی نیە، بەڵکو شیفا و دەرمانی سارێژکردنی دەردەکانیەتی![2]

******************************

٧٢٠.ئەم میللەتە ئەوەندەی کە ماویشە بەئیسلامەوە ماوەتەوە ، بەو عەقیدە و ئیمان و عیبادەت و ڕەوشتەوە ماوە کە لە ئیسلامی وەرگرتووە، ئەگەرنا لە سۆنگەی شوێن کەوتنی بیردۆزەو ڕێچکەو پێچکە ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژئاوایی یەکانەوە دەبوونە کەوی برابراو وەك تووی پەڵپینە (پرپرە) دەپرژاین و بە هیچ کەس کۆنە دەکراینەوە و نەدەدۆزراینەوە![3]

******************************

٧٢١. ئێمە دەڵێین بە ئیسلام خزمەتی کورد دەکەین و بەکوردیش خزمەتی ئیسلام![4]♦

******************************

٧٢٢.ئیسلام و کورد وەکو دوو دەست وابوون بۆ یەکتری کەیەکتر دەشۆن ، وەکو دوو برا خزمەتیان بە یەکتری کردووە ، کەواتە موعادەلەکە بەو شێوەیە نیە یا کورد بین یا مسوڵمان، نەخێر کوردی مسوڵمانین و مسوڵمانی کوردین، بەکورد خزمەتی ئیسلام دەکەین و بە ئیسلام

---

[1] نامیلکەی مەسەلەی کوردو پێناسی حیزبی بەعس –چاپی یەکەم –ساڵی ١٩٨٩ز–لا–٣٥

[2] سۆزی نەتەوایەتی وبیری ناسیۆنالیزم لە تەرازوی ئیسلام دا–چاپی سێیەمی نوسینگەی تەفسیر–ساڵی ٢٠٠٥ ز–لا–٤٣

[3] مزگەوتەکانی کوردستان لەنێوان ئاوەدانکردنەوەو وێرانکردندا–چاپی یەکەم –ساڵی١٩٩٩ ز–لا –٣٨

[4] ئیسلام و کێشە هەنووکەیی یەکان–چاپی یەکەم–ساڵی ١٩٩٨ ز–لا –٢٤

♦ ئەم ووتەیەی مامۆستا لەئەنجامی وەڵامی پرسیاری یەکێك لەسیاسیە عەلمانی یەکانی یەکیك لەلایەنە سیاسیەکانی ئەم وولاتەیە ، کە پرسیارە کە بەم شێوەیە یە:

ئایا ئێوە ئیسلام بەقوربانی کورد دەکەن یان کورد بە قوربانی ئیسلام دەکەن؟ مامۆستاش لەوەڵام دا دەڵێت جا بۆ دەبێ یەکێکیان بەقوربانی یەکێکیان بکەین! ئێمە دەڵێین بە ئیسلام خزمەتی کورد دەکەین و بە کوردیش خزمەتی ئیسلام ئامادەکار.

خزمەتی كورد دەكەین، دین بۆ بەختەوەركردنی ئینسان هاتوە، ئینسانیش بۆ بەندایەتی كردن بۆ خوا خولّقاوە و بەوەش بەختەوەر دەبیّ كە ژینی بە پێی دین بەرێوە بچیّ![1]

******************************

٧٢٣.ئێمەی موسڵمان دەبیّ هێندە ژیر و وریا بین، كە بەس ڕواڵەت و دیوی دەرەوەی شتان نەبینن و، بەسەر كێڵی دەشتی نەفكرین و، وانە زانین كە ڕژێمی بەعسی عەفلەقی كافر ئەوەی كە بەسەر خەڵكی عێراق و سووریا بەگشتی و كوردستانی سەر بە عێراقی بەتایبەت هێناوە، بەس زادەو هەڵقولاوی بیری پیس و نەگریسی خۆی بوو! بەڵكو ئەوە دەستی چەپەڵ و شوومی ڕووسیاو ئەمریكا و باقی وڵاتە ئیمپریالیستەكان بوو كە لە قوڵی فش و فۆڵی بەعسی یە ڕەگەز پەرستەكانەوە هاتەدەریّ و نەخشەو پلانی گڵاوی وان بوو كە بەدەستی شاگردو كریّ گرتە و بەوەفایان، حیزبی بەعسی ڕەگەزپەرست و شۆفێنی لە نیشتیمانی ئیسلامی دا بەگشتی و لە نێو نەتەوەی كوردی موسڵمان دا بە تایبەتی جیّ بەجیّ كرا![2]

******************************

٧٢٤.وەڵڵاهی ئەگەر بمەویّ نەك هەرچی كە بەعسی كافر بە خەڵكی عێراق بەگشتی و گەلی كورد بەتایبەتی كردووە، بەڵكو بەس زەكاتێكی بنوسم دەبیّ لانی كەم مانگێك خەریكی سەرچاوە كۆكردنەوەبم و، بەلای كەمەوە چەند سەد لاپەڕەیەك ڕەش بكەمەوە![3]

******************************



[1] سەرچاوەی پێشوو لا-٢٤
[2] سەرچاوە پێشوو -لا-٣٩-٤٠
[3] سەرچاوە پێشوو -لا-٤٥

٧٢٥.هەروەك چۆن بەقولاپی گچکە ماسی گچکە دەگیرێ، بەزانیاری کەمیش شتێکی کەم و کورت دەزانرێ، هیچ کەسیش نیە لەبێ ڕێ وجێیی جنێوو ناڕەزایی دەربڕینی منداڵێکی نەزان سەبارەت بەو پزیشکەی دەیەوێ چارەسەری بکاو حەب و دەرمانی تاڵ و تفتی دەداتێ دوو دڵ بێ![1]

*******************************

٧٢٦.خوای زانا و باڵادەست ناکەوێتە نێو مەودای کەمبەری زانیاری یەوە، مادام واشبێ زانیاری بەهیچ کلۆجێك بۆی نیە ڕای خۆی دەربارەی ئەو مەسەلەیە دەربڕێ نە بەچاك و نە بەخراپ![2]◆

*******************************

٧٢٧.زانیاریە سروشتیەکان کە بەهۆی شەداوی پێنج هەستەکانەوە دەستگیر دەبن هەرچەندە ڕاستەوخۆ نالوێ بکرێتە بەڵگەی هەبوونی پەروەردگار ئەمما دەبنە سازدەری زەمینەیەکی ڕەق و پتەو بۆ ژیری، واتە زانیاری ڕێك و پێکی وردەکاری لەبوونەوەردا بەدی دەکاو دەی گەیەنێ بەژیری، ئەویش وەك مێشەنگوینەیەکی چووست و وریا لەو شیلەیەی کەپوورە هەنگی هەستەکان لە شاگوڵەکانی باغی ڕازاوەی چنیویانە و مژیویانە و پەزمەندەیان کردوە، هەنگوینێکی بەلەزەتی لێ دروست دەکات، هەنگوینێك کە شیفای سەدان دەردی کوشندەی پێ دێ و مرۆڤ لە نەساغیی بێ بڕوایی قوتار دەکاو گەورەترین ڕاستی پێ ئاشنا دەکات![3]

*******************************



[1] پوختەیەك دەربارەی ئیسلام لەژێر ڕۆشنایی سورەتی فاتیحە دا –چاپی دووەم –لا –143

[2] دەبەرێك ڕاجونی ئیسلام و ڕێچکان –چاپی سێیەم –ساڵی ٢٠٠٦ ز–لا –٤٢

◆ ئێمە کە دەڵێین پەروەردگار ناکەوێتە نێو مەودای دەسەڵاتی زانیاری یەوە مەبەستمان ئەو زانیاری یە یە کە لەڕێی هەستەکانەوە دەستگیر دەبێ–واتە زانیاری یە سروشتیەکان –هەڵبەتە نەدیترانی خواش لەڕێی زانیاری یەوە، ئەوە ناگەێنی کە زانیاری پشتگیری فیکری خواناسی ناکات، چونکە بڕواداران بڕندەترین و کاریگەرترین چەکی دەستیان بۆ ڕاماڵینی بیرۆچکەی بێ بڕوایی، لەزانیاری دروست دەکەن

[3] سەرچاوەی پێشوو لا–٤٣

٧٢٨.گەورەیی و پایەبەرزی هەق ناسین و پێ ئاشنابوونی لە بڕواپێ هێنانی و پێوە پابەند بوونی دایە، ئەگەرنا زانیاری و شارەزایی ڕووت و بێ کردەوە و پابەندی نەك هەر چاکە (فضیلة) نیە، بگرە مایەی سزا و تۆڵە و جەزرەبەی خواشە![1]

*******************************

٧٢٩.زانیاری موڵکی تایبەتی هیچ کەسێك و هیچ گەل و نەتەوەیەك نیە و کەس لە کەس زیاتر بەشی پێوە نیە، چونکە زادە و بەرهەمی بیرو هۆشی هەموو مرۆڤایەتیە و پەزمەندە و کەڵەکەبووی شارەزایی و ئەزمونگەلی سەردەم و چاخ و قۆناغەکانی مێژووی ئینسانە![2]

*******************************

٧٣٠.زانیاری: کە بەرهەمی هەستی ڕاستی خوازییە، بریتیە لەپەی بردن بە ڕێکوپێکی و وردەکاری بوونەوەر![3]

*******************************

٧٣١.ژیار و شارستانەتی بە چەمکی ڕاستەقینەی(بالمفهوم الحقیقی) بەتەنێ لەسەر زانیارییە سروشتیەکان ڕاناوەستێ و بەر لەهەموو شتێك حەوجێی بەرنامەیەکی خودایی‌یە، بەڵام ئەم ژیارە بەژارە نا لەبارەی ئێستا کە لە ڕاستیدا بەمەجاز نەبێ دروست نییە پێی بگوترێ ژیار و شارستانیەتی، چونکە لەسەر بنچینەی بە ئاژەڵ حسێب کردنی مرۆڤ و بەس بڕوا بەدنیا بوون دانراوە، ئنجا ئەم ژیارەش ڕایەڵ و تێو دانەکەی ئەو پیشەسازی و تەکنەلۆجیایەیە کە بەهۆی بەرەو پێش چوونی زانیارییە سروشتییەکانەوە هاتۆتە کایەوە![4]

*******************************

٧٣٢.وەك چۆن لە دین دا شارەزابوون و بە ئیسلام زانا بوون لەسەر هیچ چین و توێژو کۆمەڵ و مەسلەکێك تاپۆ نەکراوە، کۆکردنەوەی سەرجەم ڕاستیەکانی ئایین (جمع حقائق الدین) یش کاڵایەك نیە بەباڵای هیچ بەشەرێك بڕابێ و، وەك چۆن بێجگە لە خوای زانای ئاشکرا و پەنهان هیچ

---

[1] خواناسیی ئایین ئیمان –ڕاستییەکان ئیسلام دەدرەوشێنەوە ئەفسانەکانی ڕێچکان دەپووچێنەوە–چاپی یەکەم ساڵی ٢٠٠٠ ز–لا–٢٠

[2] سەرچاوەی پێشوو لا–٢٥

[3] سەرچاوەی پێشوو لا–٤١

[4] سەرچاوەی پێشوو لا–٩٠

کەس بەسەرجەم نهێنی یەکانی بوون (أسْرارُ الوجود) شارەزانیە بێجگە لە خۆیشی هیچ کەس وەك خۆی بەڕاستی یەکانی ئایین و بەرنامەکەی ئاگادارنییە ![1]

******************************

٧٣٣.ئاشکراشە کە زانین ئەگەر نەگۆڕێ بۆ توانین و حاڵی بوون نەبێتە حاڵ و لەعەقڵ و هۆشەوە نەگوازرێتەوە بۆ دڵ و دەروون هیچ بە هیچ ناکرێ![2]

******************************

٧٣٤.زانست بەبێ جووڵان و کارکردن هیچی لێ هەڵناوەرێ ![3]

******************************

٧٣٥.هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدا بن کە زانینتان بۆ توانین و حاڵی بوونتان بۆ لە خۆدا کردنە حاڵ بێ![4]

******************************

٧٣٦.بەبێ بەرچاو روونی و شارەزایی، دلگەرمیی و بوێری هیچی لێ هەڵناوەرێ، چونکە با حەماسەت هەر ئینسان بجولێنێ مادام شارەزا و بەرچاو روون نەبێ نازانێ چی بکات و چۆن بکات و بگرە ئەوەی کە دەشی کات زۆر جاران زۆر یش لە سەری قەرزار دەبێتەوە ![5]

******************************

٧٣٧.وەك چۆن کردەوە و هەڵوێستێك لەسەر زانیاری بنیات نرابێ سەر دەکێشێ بۆ دادگەری و ڕەوایی، کارو هەڵوێستێکیش لەسەر نەزانیی ڕۆنرابێ جگە لەستەم و ناڕەوایی هیچی دیکەی لێ چاوەڕوان ناکرێ ![6]

******************************

[1] زانایانی ئیسلام کێن و چۆنن –چاپی یەکەم ساڵی ٢٠٠١ ز–لا–١٣

[2] ڕێگای صالح بوون و بەرەو خواچوون –تەزکیەی نەفس لەبەر ڕۆشنایی قورئان سوننەت دا –چاپی یەکەمی نوسینگەی تەفسیر –ساڵی ٢٠٠٥ ز–لا–٨٢

[3] سەرچاوەی پێشوو لا–٢٢٥

[4] سەرچاوەی پێشوو لا–٢٢٥

[5] زنجیرە دەرسی ئیمان و عەقیدەی ئیسلامی لەژێر ڕۆشنایی قورئان و سوننەت دا بەرگی یەکەم /ئیمان و عەقیدەی ئیسلامی چی یەو چۆنە– چاپی یەکەم ساڵی ٢٠٠٧ز–نوسینگەی تەفسیر–لا–٢٣٩

[6] سەرچاوەی پێشوو لا–٣٤٦

٧٣٨.زانیاری خوا (سبحانه وتعالى ) له‌قه‌ده‌ر خوایه‌تی زانیاری ئێمه‌ش له‌قه‌ده‌ر ئێمه‌یه ! [١]

********************************

٧٣٩.هیچ كاتێك ناگونجێ ئایینی ساغ و زانیاری ڕاست پێكه‌وه دژو ناكۆك بن چونكه ئایین و وه‌حی ساغ و ده‌ستكاریی نه‌كراو فه‌رمایشتی خوایه و، زانیاری ڕاست (العلم الصحیح) یش وه‌سف و پێناسه‌ی كرده‌وه‌ی خوایه و، دیاره مه‌حاڵیشه خوای كاربه‌جێ –عز وجل– (كلام) و كرده‌وه(عمل) ی تێك بگیرێن و دژ بوه‌ستن! هه‌ر بۆیه‌ش كاتێك بینیمان تێكگیرانێكی له‌و جۆره ڕوویداوه، پێویسته دڵنیابین كه‌یان ئه‌وه‌ی به (ئایین و وه‌حی خوا) دانراوه، ساغ نیه‌و خڵته‌ی ڕه‌گه‌ڵ خراوه و شێوێنراوه، یان ئه‌وه‌ی كه به (زانیاری) زانراوه ڕاست و ته‌واو نیه، وه‌ك ئه‌وه‌ی له ڕۆژئاوا ڕوویدا، كه له ڕاستی دا تێكگیرانی نێوان ئاینێكی شێوێنراو یان ئه‌فسانه‌یه‌كی به ئایین دانراوو زانیاری بوو، نه‌ك ئایینی خواو و زانیاری ! [٢]

********************************

٧٤٠.بابایه‌كی عه‌لمانیی – هه‌روه‌ها هه‌مان شت بۆ بابایه‌كی ئیسلامی هه‌روایه– كه له‌كاتی قسه‌كردنی و له‌سه‌ر ئیسلام و ڕه‌خنه لێگرتنی دا له جیاتی ده‌قه‌كانی قورئان و سوننه‌ت، دێنێ ڕه‌خنه له‌هه‌ڵس و كه‌وت و واقیعی مسوڵمانان و ئیسلامییه‌كان ده‌گرێ و بابه‌تی ئیسلام و خودی شوێن كه‌وتوانی تێكه‌ڵ ده‌كات، ئه‌گه‌ر گریمان ڕه‌خنه‌كه‌شی ڕاست و به‌جێ بێ، شێوازێكی نازانستییانه‌ی ڕه‌چاو كردوو، هه‌رچه‌نده به‌قسه لافی زانیاریگه‌ری لێبدات ! [٣]

********************************

٧٤١.ڕاسته زانیاری و شاره‌زایی به ئیسلام له‌سه‌ر هیچ كه‌س تاپۆنه‌كراوه و هی هه‌موو مرۆڤه‌كانه، به‌ڵام ئه‌وه مانای ئه‌وه نیه كه زاناو نه‌زان و شاره‌زا و ناشی، له‌ڕووی قسه‌كردنه‌وه وه‌ك یه‌كن، ئایا هه‌ر له‌به‌رئه‌وه‌ی هه‌موومان پشك و به‌شمان به‌پزیشكی گه‌ری (طب)و زانیاری ساغله‌میی یه‌وه هه‌یه مانای وایه پزیشكێك و جوتیارێك یه‌كسانن له‌و باره‌وه ! [٤]

---

[١] زنجیره ده‌رسی ئیمان و عه‌قیده‌ی ئیسلامی له‌ژێر ڕۆشنایی قورئان و سوننه تدا /به‌رگی دووه‌م/ خوابه‌یه‌كگرتن له به‌دیهێنرابه‌تی و په‌روه‌ردگارێتی دا–چاپی یه‌كه‌م –ساڵی ٢٠٠٧ز–لا–٩٤

[٢] ته‌وژمی ئیسلامیی و عه‌لمانیی خاڵه هاوبه‌ش و جیاوازه كانیان –چاپی یه‌كه‌م–٢٠٠٨ ز –لا–١١٠

[٣] سه‌رچاوه‌ی پێشوو–لا–١٤٠

[٤] سه‌رچاوه‌ی پێشوو–لا–١٤١

٧٤٢.گومانی تێدانیە کە زانیاری و شارەزایی و بەرچاو ڕوونی مەرجی یەکەم و بناغەی هەر کارو چالاکییەکە کە بویستریّ سەر و بەر بگریّ، وە بە پێچەوانەشەوە نەزانیی و نەشارەزایی و ناشێی کوشندەترین دەرد و نەخۆشیەو مایەی ڕەنج بەخەساریی و پەشیمانی و دەست لەبنی هەمبانەی بەتڵەوە دەرچوونە ![1]

*******************************

٧٤٣.خوا بە لوتف و کەرەمی بێ سنوری خۆی یارمەتیمان بدات کە هەرچی زیاتر زانیاری و شارەزایی و بەرچاو ڕوونی لە دین و ژینماندا وەدەست بێنین و پاشان توفیقی کارکردن و بەڕێوە چوونیشمان بەپێ ی ئەو زانیاری و شارەزایی و بەرچاوو ڕوونی یە پێ ببەخشێ، چونکە بێگومان بەرەکەتی زانیاری و شارەزایی و بەرهەمەکەی لەکار پێکردنی دایە و هەر زانیاریەك خاوەنەکەی لە ئیش پێکردنی مەحرووم بێت لەسەری قەرزدار و عەیبدار و گوناهبارە ![2]

*******************************

٧٤٤.زۆر کەس دەزانیّ خوایەکە (جلّ شأنە) زۆر کەس دەزانیّ، بێجگە لە خوا هیچ بەدیهێنەر و پەروەردگارو هیچ خاوەنی دیکە بۆ بوونەوەر و کائینات نیە، بەڵام ئەگەر تەماشایی ژیانی بکەی وای تێدا نابینی، بۆیە دەبیّ ئەو زانینە ببیّ بەتوانین و حاڵی بوونە کە ببیّ بەحاڵ و لە مێشکەوە بێتە نێو دڵ و دەروون ![3]

*******************************

٧٤٥.کەسێك کە لە ڕێگەی پێغەمبەر (ﷺ) لابدات ئەوە نەك هەر ئەهلی عیلم نیە، بەڵکو ئەهلی نەفامیی (جهل) ە، وە نەك هەر هەڵبژاردەی خوا نیە بەڵکو ڕەفزکراوی خوایە ![4]

*******************************

---

[1] زنجیرەی بابەتە هەنوکەییەکان ئەڵقەی چوارەم-چۆنیەتی بوونە پێشەنگ و بنیاتنانی بنکەی جەماوەریی- چاپی یەکەم -ساڵی ٢٠٠٧-ل-٨

[2] سەرچاوەی پێشوو-ل-١٠

[3] سەرچاوەی پێشوو-ل-٢٠

[4] زنجیرەی بابەتە هەنوکەییەکان ئەڵقەی حەوتەم- قوتابیانی زانیاری شەرعیی و چەند سەرنج و ڕێنمایی یەك -چاپی یەکەم -ساڵی ٢٠٠٧ ز-ل-٢٣

٧٤٦.هەرکەسێك ڕژد نەبێ لە سەرفکردنی کاتی خۆیدا زانیاری بۆی وەدەست نایەت، بەڵێ دەبێ لە سەرفکردنی کاتی خۆتدا زۆر چرووك بی و نابێ کاتەکانت بە سەخاوەتەوە سەرف بکەی ئەگەر بتەوێ لە بواری وە دەست هێنانی زانستدا شتێك بەشتێك بکەی ![1]

******************************

٧٤٧.ئینسان هەتا زیاتر بەزانستدا قووڵبێتەوە زیاتر نەزانیی خۆی بۆ دەردەکەوێ، وە بۆی ڕوون دەبێتەوە کە چەندە ئاتاجی شارەزابون و فێر بوونی زیاترە ![2]

******************************

٧٤٨.هەروەك چۆن زانیاری تیۆریی (نظری) بە چوونە نێو جیهانی دەقان (نصوص) و خوێندنەوەی کتێبانەوە پەیدا دەبێ، زانیاریی، کردەیی (عملی)یش بە چوونە نێو دەریای جم و جوڵ و چالاکی و ڕەفتار و هەڵوێستان دەستگیر دەبێ، ئەگەر نا نابێ، پێشینانیش بە خۆڕایی نەیانگوتوە (لەزۆر گەڕاوان بپرسە لە زۆن ژیاوان مەپرسە )![3]

******************************

٧٤٩.زانیار ییەك نەگۆڕێ بوۆ کردار، هەر تێگەیشتنێك نەبێتە مایەی پێگەیشتن، خاوەنەکەی لەسەر قەرزدار دەبێتەوە ![4]

******************************

٧٥٠.ئیسلام دەستی ئەهلی زانست دەگرێ و دەستباریان بۆ دەگرێ، بەڵام بە پێچەوانەوە ڕێزی ئەو کەسانە ناگرێ کە بەهەر بیانوویەکەوە بێ تەنانەت زێدە خوا پەرستیش! تەنبەڵیی و بێ کاریی هەڵدەبژێرین و چاو لە دەستی خەڵکی دەکەن![5]

******************************

٧٥١.لەڕاستی دا زانیاری بۆ ئەوەیە کردەوەی پێ بکەی ، سەرەتا لە خودی خۆماندا پاشان لە دەوروبەرو کۆمەڵگاکەماندا ، زانیاری بۆ کردارە! زانین بۆ توانینە و، حاڵی بوون ئەوەیە لەخۆتدا بیکەیە حاڵ![6]

---

[1] سەرچاوەی پێشوو-ل-٤٣

[2] سەرچاوەی پێشوو-ل-٤٣

[3] بزوتنەوەی ئیسلامیی و ئاسۆیەکی گەش و ڕوون بنەما شەرعی یەکان و بنچینە ئەخلاقییەکان-چاپی یەکەم- ساڵی ١٩٩٧ ز-ل -١٢-١٣

[4] ئافرەت و خێزان لەسایەی شەریعەدا-بەرگی یەکەم - چاپی یەکەم -ساڵی ٢٠٠٣ز-ل-١٤

[5] مسوڵمانی کامڵ -بەشی دووەم خواپەرستی مسوڵمان -بەرگی دووەم -چاپی یەکەم -ساڵی ٢٠٠١ز-ل-١

[6] زنجیرەی بابەتە هەنوکە ییەکان ئەڵقەی دەیەم- قوتابیان لەم هەلومەرجەدا پێویستە چۆن بن و چی بکەن؟!-چاپی یەکەم -ساڵی٢٠٠٨ ز -ل-٣٤

٧٥٢.لە ئیسلام دا مافەکانی مرۆڤ وەك چەوەندەرێك لەو گۆڕە هەڵنەقەندراون! وە لە ئیسلام دا مافەکانی ئینسان وەك ئالقەیەکی پچڕاو لە زنجیرێك نین و، وەك ئەنجامێکی بێ پێشەکی نین، بەڵکو لە ئیسلام دا پێش ئەوەی باسی مافی مرۆڤ بکرێت چەند شتێکی تر هەیە، ئنجا مافی مرۆڤ وەك ئەنجامێکی مەنتیقی و سروشتی خۆی فەرز دەکات![1]

******************************

٧٥٣.گرنگی ئیسلام ئەوەیە کە ئیسلام نەهاتووە مافەکانی مرۆڤ تەنها وەك دروشمێکی جوان بخاتە ڕوو، کە خەڵك بڵێ: (أشهد بالله) قسەیەکی خۆشە، بەڕاستی قسەیەکی زۆر جوانە!!چونکە زۆر کەس هەیە قسەی باش دەکات، بەڵام کە دوایی کە تەماشای کردەوەکەی دەکەی هیچی لێ سەوز نەبووە، بۆیە کوردەواریی خۆماندەڵێن: (قسە فەقیرە هەموو کەس پێی دەوێرێ) گرنگ ئەوەیە قسەکەت بەکردەوە تەرجەمەبکەی و لە مەیدانی واقیع دا بیچەسپێنی، بیکەی بە کردەوە، (عمل) ئەو جار بۆ خەڵك شتێکی لێ هەڵدەوەرێ و خەڵك لێی بەهرەمەند دەبن![2]

******************************

٧٥٤.بە تەجرەبە ئیسپات بووە: چەوساندنەوەی نێو خۆ و دەستدرێژیی دەرەکی (الأستبدات الداخلي والعدوان الخارجي) گەورەترین ئاستەنگن لە ڕێی مافەکانی مرۆڤدا![3]

******************************

٧٥٥.ئینسان خوای بەدیهێنەر بەتایبەت خولقاندوویەتی و کردوویەتی بەجێنشین (خلیفة) ی خۆی و بۆ بەندایەتی کردنی خۆی خولقاندوویەتی، نەك بۆ کۆیلایەتی و خزمەتکارێتی طاغوت و دیکتاتۆرەکان، بۆیە بۆ هیچ کەس نیە نە بەناوی سیاسەتەوە، نە بەناوی دینەوە نە بەناوی دنیاوە، بەندەکانی خوا ژێر دەست و زەبوون و زەلیل بکات![4]

******************************

---

[1] چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم سەرنجێکی واقیعییانەو هەڵسەنگاندنێکی شەرعییانە -چاپی چوارەم - ساڵی٢٠٠٥ ز-ل-١٢٣

[2] سەرچاوەی پێشوو-ل- ١٢٤

[3] سەرچاوەی پێشوو-ل-١٢٥

[4] سەرچاوەی پێشوو-ل-١٢٦

٧٥٦.ئینسان بەرێزە، ئازادە، خوا ئینسانی بە ئازادانە خولقاندووە، بۆیە دەبێ مافەکانی بۆ دابین بکرێن، ئیسلام باسی ڕێزی ئینسان، ئازادی ئینسان، بەندایەتیی ئینسان، بۆ خوا دەکات، بۆیە زۆر داکۆکی نەکراوە لەسەر ماف، وەختێك ئینسان ڕێز لێگیراو بوو، وەختێك ئینسان لەبناغەوە مەخلوقێکی ڕێز لێگیراو و حیساب بۆ کراو بوو، مافەکانیشی دابین دەکرێن![1]

*********************************

٧٥٧.لە ئیسلام دا مافەکان و ئەرکەکان وەك دروشم و شیعارێکی گشتی نەخراونەڕوو، وەك دروشمێکی گشتی خەڵك هەڵخەڵە تێنەرەو چەواشە کاریانە!بەڵکو وەك شتێکی تە فصیلی، وە بەوردی دیاری کراون بۆ ئەوەی بگونجێ بەکردەوە جێبەجێ بکرێن، نەك تەنها دروشمی بریقەدار و قسەی خۆش و بۆش بن![2]

*********************************

٧٥٨.خوا-جل جلالە- دەزانێ کە لەوەچەی ئادەم (هابیل) یش هەیە و (قابیل) یش هەیە، کافریش هەیە و مسوڵمانیش هەیە، کەچی دەفەرموێ: ڕێزمان لەوەچەی ئادەم گرتوە، کەواتە: ڕێزلێگیرانی ئینسان گشتی یەو سەرجەم ئینسانەکان وەك خودی خۆیان ڕێزلێگیراون![3]

*********************************

٧٥٩.دانپێداهێنان و دابینکردنی ئیسلام بۆ مافەکانی مرۆڤ بەرهەمی کردو کۆششی کەس نیە و، هەر لەسەرەتاوە کە خوای پەروەردگار قورئانی ناردوّتە خوارێ، ئەو ئایەتانەشی ناردوّتە خوارێ و نەپێ ویستی کردووە کە کەس ڕاپەڕین و شۆرش بکات و، نە پێویستی کردووە کەس کۆبونەوەی لەسەر بکات کە داوابکەن ئینسانەکان ڕێزیان لێ بگیرێ و مافیان پارێزراوبێ، چونکە خوا دروستکەری ئینسانەکانە هەر لە ڕێوە هەموو مافەکانی پێداون و هەموو ڕێز و حورمەتێکی بۆ داناون![4]

*********************************

[1] سەرچاوەی پێشوو-ل-١٢٧

[2] سەرچاوەی پێشوو-ل-١٢٨

[3] سەرچاوەی پێشوو-ل-١٣٥

[4] سەرچاوەی پێشوو-ل-١٣٦

٧٦٠.بەبێ ئازاد بوونی ئینسان لە هەڵبژاردنی بیروباوەڕی دا تاقیکراونەوەی مرۆڤ دەبێتە ناوی بێ ناوەڕۆك بێگومان ئەوەش لە ئایین و بەرنامەی بێ هەڵەو پەڵەی خوای کاربەجێ ناوەشێتەوە و پێچەوانەی حیکمەت و فەلسەفەی خولقێنرانی مرۆڤیشە ![1]

*******************************

٧٦١.ژیانێکی ئازادانە پێویستیی بەوە هەیە کە ئینسان ئازادیی بیرکردنەوەی هەبێ، ئازادیی دەربڕینی هەبێ، ئازادی عەقیدەو بیروباوەڕی هەبێ، ئازادی سیاسی، کۆمەڵایەتی، شەخسیی، ئابووریی، وەباقی ئازادیی یەکانی هەبێ![2]

*******************************

**٧٦٢.ئیسلام ڕێزی تاك دەگرێ و ماف و ئازادییەکانی بۆ دابین دەکات، بەڵام نەك لەسەر حیسابی بەرژەوەندی یەکانی کۆمەڵگا ![3]**

*******************************

٧٦٣.هەر کارگەیەك و هەر فابریقەیەك کەشتێك بەرهەم دێنێت، ئامێرێك دروست دەکات، یەکسەر "کەتەلۆك" ێکی ڕەگەڵ دەخات، خوای بەدیهێنەریش ئینسانی خولقاندوە و، هەرئەویش شایستەی ئەوەیە ئەرك و مافەکانی بۆ دیاری بکات![4]

*******************************

٧٦٤.بەندە بوونی ئینسان بۆ خوا –جل جلالە – بۆ ئەوەیە کە لە کۆیلایەتی بۆ بەندەکان ڕزگاری بێ، وە لە ڕاستی دا ئینسان بەبێ پەرستراو (معبود) ناتوانێ بژیەت، جا چ پەرستراوی حەقیقی بێ کە خوایە –جل جلالە – چ پەرستراوە ساختە کان بن، کە لەبت و طاغووت و دیکتاتۆرەکات دا خۆیان دەبیننەوە ![5]

*******************************

[1] سەرچاوەی پێشوو–لا– ١٤٠

[2] سەرچاوەی پێشوو–لا–١٤٦

[3] سەرچاوەی پێشوو–لا–١٥٢

[4] سەرچاوەی پێشوو–لا–١٥٤–١٥٥

[5] سەرچاوەی پێشوو–لا–١٥٥

٧٦٥.کاتێك لە دنیای واقیعدا تەماشا دەکەین دەبینین کە بەڕاستی مافەکانی مرۆڤ و ئازادییەگشتی یەکان زیاتر وەك قسەیەکی بۆش و خۆش دێنە بەرچاو![1]

******************************

٧٦٦.لەسۆنگەی ئەوەوە کە ئیسلام واسەیری مرۆڤەکان دەکات کە خوای کاربەجێ خۆی بۆ چەند گەل و تیرەیەك دابەشی کردوون و لەرانبەر ئیمان هێنان و نەهێنانیش دا ئازادی کردوون، هیچ کاتێك نەك هەر بەپێویست بەڵکو بەڕاواشی نازانێ، کە بەهیچ جۆرێك دەستکاری ڕەنگ و زمان و ڕەگەز و ڕەچەڵەکیان بکات، یان لەسەر ئیمان و ئیسلام نا چاریان بکات، بەڵکو هەر بەو شێوەیەی کە هەن لەڕووی ڕەنگ و زمان و ڕەچەڵەکەوە و، ئارەزوو دەکەن کە بێن لە ڕووی فیکر و عەقیدەوە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات![2]*

******************************

٧٦٧.مرۆڤ کە شاگوڵی باغی بوونەوەر و سەرتۆپی کائینات و هەڵبژادەی نێو هەموو دروست کراوەکانی خوایە و هەڵگری سپاردەیەك و بەڕێوەبەری ئەرکێکە کە بە هەموو بوونەوەر توانای هەڵگرتنی و شایستەیی بەڕێوەبردنیان نەبووە![3]

******************************

٧٦٨.هەرکەسێك مافی پێ نەدرێت و مافی پێ نەدەیت و مافەکانی بۆ دابین نەکەیت، ناتوانیت واجبێك و ئەرکێکی لێ داوا بکەیت![4]

******************************

[1] سەرچاوەی پێشوو-لا-٢١٥

[2] تەوژمی ئیسلامی و عەلمانی خاڵە هاوبەش و جیاوازەکانیان-چاپی یەکەم -ساڵی ٢٠٠٨ ز-لا -١٨

* هەڵبەتە هەر ئەوەش لەبەرنامەیەکی ڕەببانیی و ئینسانی وەك ئیسلام چاوەڕێ دەکرێ، ئایینێك کەلەلایەن خواو پەروەردگاری هەموو خەڵکییەوە هاتوەو، ڕووی دەمیشی لەسەرجەم ئینسانەکانە بەبێ جیاوازی، دیارە بەرنامەیەکی واکاتێك دەسەڵاتی دەبێ، کەش و هەوای ژیان و کوزەڕانێکی مرۆڤانەی وا بۆ ئینسانەکان فەراهەم دێنێ کە لە بەزەیی و حیکمەت و دادگەری خوای پەروەردگارر چاوەڕێ دەکرێ و، شایستەی مرۆڤێکیشە کەخوا ئاوەدانکردنەوەی زەوی پێ سپاردووە و کردوویەتە خەلیفەی خۆی: هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ الأَرْضِ وَاسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا... هود:٦١ (وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلائِكَةِ إِنِّي جاعِلٌ فِي الأرضِ خَلِيفَةً)البقرة:٣٠ هەمان سەرچاوە-لا-١٨-١٩

[3] پرۆژەی بەرنامەی فکری کاریی ئیسلامیی-چاپی یەکەم -ساڵی ١٩٩٦ ز-لا -٢٣٣

[4] ئافرەتی مسوڵمانی کورد مافە شەرعییەکانی و ئەرکە گرنگەکانی -چاپی یەکەم -ساڵی ٢٠٠٣ ز-لا-٧

٧٦٩.هەر کاتێك بەشەریەت پیاوەکانی و ئافرەتەکانی بەو شێوەیە بەڕێوە چووبن کە شەریعەت فەرموویەتی و لەگەڵ سروشت یاندا جووتە، ئەوە بەختەوەر بوونە، وە هەر کاتێك لایاندا بێت کە بەزۆر یش لادانەکە لەوەوە دەستی پێکردوە کە ئافرەت بۆتە ئامرازی پێ ڕابواردن، بۆتە بووکە شووشە، بۆتە پەشتەماڵ، بۆتە ئالەتێك کە سودی خراپی لێ بینراوە ئاخر ئافرەت ئەرکی زۆر بەرز و پیرۆزی پێ سپێردراوە کە بریتیە لە ئەرکی دایکایەتی، پەروەردەکردنی وەچەی داهاتوو، پێگەیاندنی پیاوان، پێگەیاندنی ژنانی داهاتوو، دروستکردنی کۆمەڵگا، دایك یەکەمین قوتابخانەیە، وە هەر کاتێك لەو ئەرکە سروشتییەی خۆی دوور خرایەوە ئەوە بە مەبەستی خراپ دوور دەخرێتەوە، بۆیە دوور دەخرێتەوە کەمافی پێ بدرێت، بە پێچەوانەوە بۆیە دوور دەخرێتەوە کە هەتك بکرێت و بێ ڕێز بکرێت، وە بۆ ئەوەی بکرێتە ئالەتێك و پێیەوە ڕابوێردرێت کە لەڕاستیدا بەزەری تەواو دەبێت![1]

******************************

٧٧٠.پۆشاکی شەرعییانەی ئافرەت وەك پەر ژینێکە بۆ باخ، وەك شوورە و حەسارێکە بۆ ماڵ![2]

******************************

٧٧١.ئافرەتانێك کە مێیایەتی(أنوثة) خۆیان دەر نەخستوە، مێنایەتی خۆیان بەرجەستە نەکردووە، بەڵکو ئینسانەتی خۆیان دەرخستوە، بۆیە چاوەڕوان دەکەن لە کۆمەڵگاش کە وەك ئینسان لەگەڵیاندا ڕەفتار بکات نەك وەك مێینە![3]

******************************

٧٧٢.هەروەك چۆن بابایەك کە بەتەنگ باخ و بێستان و گولزار و باخچەیە کەوەیە، دێنێ پەرژینی دەکات یان پاسەوان و ئێشکچی بۆ دادەنێ تاکو زەرر نەکرێ و ماڵات و ئاژەڵی بەهەڵدا و بێ خاوەن نەچنە نێوی و زیانی پێ نەگەیێنن و لق و پۆپەکانی نەشکێنن و میوەکانی هەڵنەوەرێنن و گوڵەکانی هەڵنەپسێنن! شەریعەتی بێ هەڵەو پەڵە و تێر و تەواوی خوای کاربەجێ و میهرەبانیش بەهەمان شێوە و زیاتر و چاکتریش لە سۆنگەی ئەوەوە کە پەرۆشی ئافرەتیەتی و بەزەیی پێیدا

---

[1] زنجیرەی بابەتە هەنوکەییەکان ئەڵقەی دووەم –باوریابین داڕووخانی ڕەوشت کۆمەڵگاکەمان بەرەو هەڵد ێر دەبات –چاپی یەکەمی نوسینگەی تەفسیر –ساڵی ٢٠٠٧ ز–ل–٢٨

[2] سەرچاوەی پێشوو–ل–٤٥

[3] سەرچاوەی پێشوو–ل–٤٨

دێتەوە و بەتەنگیەوەیە کۆمەڵێك شووره و پەرژینی بۆ پاراستنی کەرامەت و کەسایەتی داناوه، کە یەکێکیان بەرگ و پۆشاکی شەرعییە ![1]◆

*******************************

٧٧٣.ژنان چ ئەرکێکیان بەرامبەر بەمێردەکانیان لەسەر شانە، بارتەقەی ئەوەش مافیان لەسەریان هەیە، ئەو پلەیەش کە بەسەر ژنەکانیانەوە هەیانە: پلەو پایەی سەرپەرشتیاریی (درجة القوامة)، ئەرك و بەرپرسیارێتی و بارگرانییە، نەك ئیمتیاز و خەڵاتکران و (تکلیف)ە نەك (تشریف)![2]

*******************************

٧٧٤.لە کاتێك دا کەرامەت و ڕێز و حورمەتی ئافرەت یەکی لەسەر یەکسان بوونی لەگەڵ پیاودا کەوتوه، کە نێرایەتی (ذکوره) پایەو ئیمتیاز بێت و مێیایەتی (أنوثه) یش نزمیی و خواریی (رذیله) بێت![3]

*******************************

٧٧٥.ئەوانەی شەریعەتی خوا بەوە تۆمەتبار دەکەن کەلایەنگری نێرینەی کردوە لەسەر حیسابی مێینە، خۆیان بەزمانی حاڵ و کردار پێشانی دەدەن کەنێر (ذکر) بوونیان پێ (فـضيلة)ەو مێ (أنثى) بوونیان پێ (رزيلة)یە، چونکە ئەی ئەگەر وانیە بۆچی وەك بابای بەڕووباردا چوو دەست بۆ چڵەو پووشانیش دەبەن تاکو ئیسپاتی بکەن کە نێرو مێ یەکسانن و ئافرەت هیچی لە پیاو کەمتر نیە؟![4]

*******************************




---

[1] سەرچاوەی پێشوو-لا-٤٩

◆ بۆ ئاشنابوونی زیاتر بەمەسەلەی ئافرەت و خێزان وبابەتی پەیوەندیدار بەم بابەتەوە لەدیدی مامۆستادا دەتوانی سەیری کتێبی (ئافرەت و خێزان لەسایەی شەریعەت) دا بکەی وە هەروەها نامیلکەی ( بەدورخستنەوە ئافرەت لەئیسلام چی زیانێك دەکەین) هەروەها نامیلکەی ( ئافرەتی مسوڵمانی کورد و مافەشەرعییەکانی) ئامادەکار

[2] ئافرەت و خێزان لەسایەی شەریعەدا -چاپی یەکەم -ساڵی ٢٠٠٣ ز-لا -٢٧

[3] سەرچاوەی پێشوو-لا-٣١

[4] سەرچاوەی پێشوو-لا-٣٢

٧٧٦.نە ئەو ئـەرك و چـالاكيانەی پەيوەنـدييان بەتايبەتمەندييـەكانی پيـاوەتی يـەو هەيـە بـەژنان ئەنجام دەدرێن و نە ئەو ئەرك و چالاكييانەش كـە پەيوەسـتن بەتايبەتمەنييـەكانی مێينـەتی يـەوە بەپياوان جێبەجێ دەكرێن![1]

*******************************

٧٧٧.لە ڕوانگەی شەريعەتەوە مێينەتی ئافرەت كـەم و كـووڕيی نيـە تـاكو بەبانگەشـەی يەكسانی لەگەڵ پياوان يان بەلاسای كردنەوەيان ئەو كەم و كووڕييـە لابـەرن وچـارەی بكـەن! بـەڵكو كامـڵ بوونی كەسايەتی ئافرەت (كمال شخصية المرأة ) لەوەدايـە كـە بـەبێ هەسـت بـە نوقـصانی كـردن بەهۆی ژنايەتی و دايكايەتی و ماڵداريی و كابانييەوە كەسـايەتی خـۆی كامـڵ و تێـرو تـەواو بكـات، نەك بەپاڵنەری خۆبەكەم زانين و خۆ بەناتەواو زانين بەهۆی مێينەتييەوە بـێ هـوودە خـەريكی خـۆ يەكسان كردن لەگەڵ پيـاو، يـان سـەرگەرمی لاسـايی كردنـەوەيان و دووركەوتنـەوە لـە كەسـايەتی فيطريی و سروشتی خۆی بێت و سەرەنجام گيرۆدەی كەسايەتی پلێشانەوە (ذوبان الشخصية) بێت و نە (بوون بەپياو )ی چەنگ بكەوێ و (ئافرەتايەتی) يشی لەدەست بچێ ببێتـە ڕەگـەزی سـێيەم، واتە: نە ژن و نەپياو مەخلووقێكی ناتەواو![2]

*******************************

٧٧٨.ئەگەر يەكسان بوونی پياو و ئافرەت پەكی لەسەر ئـەوە كـەوتبێ كـە حەتمـەن هـەردووكيان يەك جۆرە چالاكييان هەبێ، بۆچی بانگەشەرانی يەكسانی ژن و پياو -بەچەمك و واتای نەفامێتی- هەر جەخت لەسەر ئەوە دەكەن كە دەبـێ ژنـيش كـارو چـالاكييەكانی پيـاو ئـەنجام بـدات، جارێك بيريان لەوە نەكردەوە كە پياويش خۆی لەقەرەی ئەركەكانی ئافرەت بدات؟! يان ئەوانە بە زمـانی حاڵ بە ئافرەتی دەسەلمێنن كە ناتەواوە و بەوەش ئيـسپاتی تـەواويی(كمـال)ی خـۆی دەكـات كـە تەقليدی پياو بكات؟![3]

*******************************



[1] سەرچاوەی پێشوو-ل-٣٨

[2] سەرچاوەی پێشوو-ل-39

[3] سەرچاوەی پێشوو-ل-٤٥

٧٧٩.وەك چۆن ولآت بەبێ پادشاو حوکمڕان بەڕێوەناچێ ماڵ و خێزانیش کە دەوڵەتۆکەیەکی گچکەیە پێویستی بەچاو ساغ و حوکمڕان و مشووور خۆرێك هەیە ![1]

*******************************

٧٨٠.هەرکەسێك خاوەنی هەست و نەستێکی مسوڵمانانە و ویژدانێکی ساغ و زیندو بێت بەزەیی و پەرۆشی دەجوڵێ و گریانی دێت بۆ حاڵ و باڵی تفت و تاڵی ئافرەتانی ڕۆژئاوایی، خێزان لێهەڵوەشاو و سروشت تێکدراو سەرگەردان ![2]

*******************************

٧٨١.هەرکۆمەڵگایەك بیەوێت ئافرەتەکانی بەشێوەیەکی باش ئەرکی سەرشانیان جێبەجێ بکەن دەبێ بەجۆرێکی باش مافەکانیان بۆ دابین بکەن چونکە بە ئەندازەی ئەوە کە هەق و ماف بۆ کەسێك دابین دەکەی هەقیشت هەیە گلەیی لێ بکەی![3]

*******************************

٧٨٢.دەبێ ئافرەت خاوەنی فەهم و تێگەیشتن بێ، لەدینەکەی دا شارەزابێ، پاشان دەبێ خاوەنی عیبادەت و ئیلتیزام و تاعەت بێ، ئینجا دەبێ خاوەنی ڕەوشتی بەرزبێ، خاوەنی ئەدەبی جوان بێ، خاوەنی تەزکیە بێ ئنجا دوایی دەبێ خاوەنی سیما و بەرگ و پۆشاکی مسوڵمانانە بێ ئەگەرنا سیماو بەرگ و پۆشاکی مسوڵمانانە بەبێ شتەکانی دیکە دەبێتە توێکڵی بێ کاکڵ، دەبێتە دیکۆری بێ نێوەڕۆك و بەکەڵکی هیچ نایەت جا چ پیاو بێ چ ئافرەت ![4]

*******************************

٧٨٣.دەبێت زۆر ئاگامان لەسەنگەری ئافرەتان بێت و ئاگامان لەو شاباڵە بێت کە بە ڕاستی بێ ئەو کاری ئیسلامیی ناتوانێ بڕوا بەڕێوە ![5]

*******************************

---

[1] سەرچاوەی پێشوو-لا-١٩٠

[2] ئافرەتی مسوڵمانی کورد مافە شەرعییەکانی و ئەرکە گرنگەکانی -چاپی یەکەم -ساڵی ٢٠٠٣ز-لا-٤

[3] سەرچاوەی پێشوو-لا-٢٤

[4] سەرچاوەی پێشوو-لا-٢٨-٢٩

[5] گۆڤاری سنوور ژمارە (١٦) لا٢٨

٧٨٤.من زۆرم پێ سه‌یره كه‌له‌دام و ده‌زگاكانی ڕاگه‌یاندنی لای خۆمان – واته هی ته‌وژمی عه‌لمانی لیبڕالی – هه‌وڵده‌درێ ئافره‌تانی ئێمه شه‌رم و شكۆیان نه‌مێنێ! له‌ته‌فزیۆن و كه ناڵه‌كانی ڕاگه‌یانیاند زۆر به‌ڕاشكاویی و بێ په‌رده باس له‌وه ده‌كرێ چۆن كوڕ و كچ پێكه‌وه دڵداری بكه‌ن ، وه‌ك بڵێی كه ئه‌گه‌ر عه‌لمانی یه‌كان كچ و كوڕه‌كانی كورد فێری دڵداری و خۆشه‌ویستی نه‌كه‌ن، نه‌زانن یه‌كتریان خۆش بوێ!! له حاڵێك دا كه یه‌كتر خۆشویستنی پیاو ئافره‌ت ئه‌و كێش كردنه غه‌ریزی و سروشتی یه‌ی كه له نێوانی نێر و مێ دایه پێویستی به فێركردن ناكات و له‌وه‌تی خوای به‌دیهێنه‌ر ئاده‌م و حه‌وای له‌سه‌ر زه‌وی داناون و كردوونی به‌هاوسه‌ری یه‌كتر، پیاوان و ئافره‌تان هه‌ر زانیویانه یه‌كدیان خۆش بوێ و یه‌كدی خۆشویستنی نێر و مێ عیلم و صه‌نعه‌تێك نیه نه‌زانرێ، به‌ڵام گرنگ ئه‌وه‌یه ئێمه خه‌ڵك فێری ئه‌و ئه‌ده‌ب و ڕه‌وشته به‌رزانه بكه‌ین كه به‌شێوه‌یه‌كی وا یه‌كتریان خۆش بوێ و به‌شێوه‌یه‌كی وا خێزان پێكه‌وه بنێن و به‌شێوه‌یه‌كی وا چاویان له‌وه‌بێ كه پێك بگه‌ن كه خه‌جاڵه‌ت بارو ڕوو زه‌رد و شه‌رمه‌نده‌ی دنیا و دوا ڕۆژ نه‌بن، ئا ئه‌وه گرنگه![1]

******************************

٧٨٥.ئیسلام به‌ئافرت ده‌ڵێ: تۆ نابێ مه‌حكوومی غه‌ریزه‌كانی خۆت بی، وه‌ك ئاژه‌ڵ چۆن شه‌كه‌ت دراوه به غه‌ریزه‌كانی خۆیه‌وه و ناتوانێ لێیان لابدات، به‌ڵام ئینسان ده‌توانێ وه‌ك ئاژه‌ڵ نه‌ژی به‌ڵكو ده‌توانێ وه‌ك ئینسان بژی و غه‌ریزه‌كانی خۆشی تێر بكات به‌و شێوه‌یه‌ی كه‌شه‌رعی خوا دیاری كردوه تا به‌زه‌ره‌ر و زیان نه‌شكێته‌وه به‌سه‌ر به‌رژه‌وه‌ندیی یه‌كانی خۆی و خێزان و كۆمه‌ڵگاو دنیاو دوا ڕۆژی دا و بۆی به زیانی جه‌سته و ڕوح و عه‌قڵ و نه‌فسی ته‌واو نه‌بێ![2]

******************************

٧٨٦.ئیسلام ده‌یه‌وێ ئافره‌ت كه‌سایه‌تیی پاریزراو بێ، كاتێك به‌ڕێ دا ده‌ڕوا وه‌ك ئینسانێك بێته به‌رچاو، نه‌ك وه‌ك مێیینایه‌تیی خۆی به‌رجه‌سته بكات به‌شێوه‌یه‌ك كه ڕان و به‌له‌كی ده‌ربخات و له‌ش و لاری ده‌رخات و مێیینایه‌تی (أنوثة) ی تێدا ده‌ربكه‌وێ و ته‌جسیم بێ![3]

******************************

---

[1] زنجیره‌ی بابه‌ته هه‌نووكه‌ییه‌كان ئه‌ڵقه‌ی سێ یه‌م- به‌دورخستنه‌وه‌ی ئافره‌ت له‌ئیسلام چ زیانێك ده‌كه‌ین؟!-چاپی یه‌كه‌م ٢٠٠٧ ز -ل-٢٧-٢٨

[2] سه‌رچاوه‌ی پێشوو -ل-٢٩

[3] سه‌رچاوه‌ی پێشوو -ل-٣٠

٧٨٧.شەریعەتی ئیسلام باوەشێکی گەرمە و قەڵایەکی مەحکەمە و ئافرەتی مسوڵمان دەپارێزێ، ئەخلاق و کەسایەتیی دەپارێزێ ، بەڵام کاتێك لە ئیسلام دوور دەخرێتەوە لە ڕاستی دا خۆی و خێزانەکەیشی بەدبەخت و چارە ڕەش دەبن ![1]

******************************

٧٨٨.بێگومان کەم شەرمیی ئافرەتان بەرهەمی بێ غیرەتی پیاوانە و هەتا پیاوان غیرەتیان کەم نەبێتەوە ئافرەتان شەرمیان کەم نابێ ، ئەو شەرمەی کەدەیانگێڕێتەوە لە گوناح و دەیانپارێزێ لەوەی کە کەسایەتیی یان بڕووخێ و لەکەداربێ ، وە گیرۆدەی سەرشۆڕیی و بەدبەختی و چارەڕەشی بن ![2]

******************************

٧٨٩.بەڕستی کۆمەڵگایەك ئافرەتانی هەر خەریکی ئەوەبن کە چۆن سەرنجی پیاوان ڕابکێشن و چۆن مێیینایەتیی خۆیان نمایش بکەن و بەچەندان شێواز سەرنجییان ڕابکێشن و غەریزەیان بجووڵێنن، بەڕاستی ئەو کۆمەڵگایە کۆمەڵگایەکی نەخۆشە، وە گەنجەکانیش -کوڕەکان -لەئاکامی ئەو ڕەفتارەی ئافرتاندا تووشی زۆر هەڵەو پەڵە بوون و دەبن ![3]◆

******************************

٧٩٠.ئەو ئافرەتەی کە لەئیسلام دوور دەخرێتەوە و هەر ڕۆژەی بەجۆرێك یاریی پێ دەکرێ، ئایا ئەو ئافرەتە دەتوانێ بڵێ: من ئازادم ؟! ئایا نەکراوە بەکۆیلەی عادەت و مۆدێل؟! نەکراوە














[1] سەرچاوەی پێشوو -ل-٣١

[2] سەرچاوەی پێشوو -ل-٣٢

[3] سەرچاوە پێشوو -ل-٣٣-٣٤

◆ ئیستا زۆر لەڕۆژنامەکان دەنووسن کەئافرەتان سکاڵا دەکەن و دەڵێن: گەنجەکان دەستمان بۆ دێنن و توانج و پلارمان تێدەگرن و ...هتد دەی ئەگەر ئەو ئافرەتە بەو شێوەیە مێیینایەتیی خۆی دەنەخات و خۆی ئاوا نمایش نەکات و غەریزەی پیاوان نەجووڵێنێ ، دیارە گەنجەکانیش بەو شێوەیە ناکەن، وەك خوای دادگەر فەرموویەتی (وَجَزَاءُ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِّثْلُهَا...)واتە:وەسزاو تۆڵەی خراپە خراپەیەکی وەك خۆیەتی ، هەڵبەتە من لێرەدا پاساو بۆ ڕەفتاری درێوی گەنجان ناهێنمەوە چونکە بێگومان ئەوەی ئەوانیش هەر ناشەرعییە، بەڵام مەبەستم ئەوەیە کە ئەو دیاردەیە و ڕەفتارە ناشەرعی یانە پێکەوە پەیوەستن .

بەکۆیلـەی ئـارەزو و داخـوازی یـەکانی ئـەو کەسـانەی کـە ئـەو دام و دەزگـای ڕاگەیاندنـە یـان بەدەستەوەیە و هەر جارە ڕەواج بەشتێك دەدەن![1]

******************************

٧٩١.ئەو ئافرەتە ئازادە کە بەپێی ئیمان و عەقیدە و دینی خۆی و بەوشێوەیە کە کەسایەتیی و کەرامەت و ئابڕووی پارێزراو بێ ئاوا هەڵس و کەوت دەکات، نەك ئەوەی کە هـەرجارە بـەمۆدێلێك و بەشوێنێکدا دەیبەن و هـەرجارە بەشێوەیەك دەیڕازێننـەوە و ڕەوشـتێکی نـزم و ناپەسـەندی فێـر دەکەن ! ئەو ئافرەتە کویلەیە خاوەنی ئیرادەی خۆی نیە و لەژێر کاریگەریی غەریزەی خـۆی دایـە نەك عەقڵ و دینی ![2]

******************************

٧٩٢. نەپیاو کویخای ئافرەتە و نەئافرەتیش کوێخای پیاوە، لە ئیسلامدا شەریعەتی خوا حاکمـە و بڕیار دەدات کە ئەوە حـەق و مـافی پیـاوە و ئـەویش هـی ئـافرەت ، ئـەویش ئـەرکی هـەر کامیانـە بەرامبەر بەیەکدی، وە دەبێ ڕێزی زۆریش لە یەکدی بگرن، هـەردووکیان هـەر مـرۆڤن هـیچ کامیـان لەوی دیکە گەورەتر و بەڕێزتر نیە مەگەر پارێزگاری (تقوی)ی زیاتر بێ![3]

******************************

٧٩٣.شتێکی سەیرو بێ جێ و نازانستییە کە داڕووتاندی ئافرەت لەگەڵ بەرەو پێشچوونی زانست و زانیـاری دا پەیوەسـت بکـرێ و پۆشـتەو پـەرداخیی و حـەیا و حەشمـەتیش لەگـەڵ دواکـەتن و بەجێماوی دا ؟!

مەگەر زانیاری و زانست لەعەقڵ و دڵ دایە یان لەبەرگ و پۆشاك دا ؟![4]

******************************



---

(١) سەرچاوە پێشوو -ل-٤٠

(٢) سەرچاوە پێشوو -ل-٤٠

(٣) سەرچاوە پێشوو -ل-٤١

(٤) زنجیرەی بابەتە هەنوکەییەکان ئەڵقەی دەیەم- قوتابیان لەم هەلو مەرجەدا پێویستە چۆن بن و چی بکەن؟!-چاپی یەکەم ساڵی ٢٠٠٨ ز-ل-٣٦

٧٩٤.سۆفیایەتی ئەگەر بەو چاوەسەیر بکرێت، کە بەرنامەیەکی سەربەخۆی سەر لە بەری ژیانە و، وەك ڕێچکەیەك لە ڕاست ئیسلام دا خۆی دەنوێنێ، ئەوە ئەم جۆرە سۆفیایەتی یە کەم و زۆر پەیوەندی بەئیسلامەوە نیە، چونکە خوای بێ هاوتا بەس یەك جۆرە ئیسلامی ناردوە نەك زیاتر ![1]

******************************

٧٩٥.سۆفیایەتی وەك زۆربەی لایەنەکانی تری ئیسلام شاخ و باڵی زیادو شتی ئەفسانەی زیادەی بیر و زەینی ئینسانی تێکەڵ بووە و ئەو جوانی و ڕەونەق و کاریگەری یەی پێشووی نەماوە و لەنێو چوارچێوەیەکی تەسکی لە کەشکۆڵ و دەف و تەپڵ و شاڵ و تەسبیح و زەرگ و شیرو نرکە نرك و شیڕاندن و هەڵپەڕین سەما ... دروست کراو دا، کورت هەڵاتوە تەنگی و پێ هەڵچنراوە و، کەجاران مایەی هاتنەخوارەوەی بەزەیی و پیت و پیزی خوا و خاوێن کردنەوەی دەروون و زیندووکردنەوەی دڵان و هۆشیارکردنەوەی بیرو هۆش و شیرین کردنی ئیسلامەتی بوو لەلای خەڵکی، ئێستا مەگەر چۆن ئەگەر نا بەپێچەوانەوە مایەی دابارینی تووڕەیی خواو مراندن و هەڵگێڕانەوەی دڵان و بەنج کردن و کوێرکردنەوەی بیرو هۆش و تاڵ کردنی ئیسلامەتی یە و بۆتە چاکترین هۆو ئامرازی خۆپێ ژیاندن و خەڵك فریودان، سەربارەی هەموو شتانیش ناحەز و دوژمنانی ئیسلام لە جەنگەڵی ئەو سۆفیایەتی یە بێ سەرەو بەرەدا بیانووی پلارو توانجی چاکیان دەست دەکەوێ کە بەناحەق بیگرنە ئیسلامی تێرو تەواو بێ لەکە ![2]

******************************

٧٩٦.سۆفیایەتی وەك هەر لایەنێکی تری ئیسلام ئەگەر بەڕێك و پێکی بەڕێوەببرێ و وەك لایەنێك لە ئیسلام دابنرێ کەلایەنی تەزکیە و ئەخلاقە و شتی بێ ڕێو جێ و سەیرو سەمەرەی ڕەگەڵ نەخرێ و بەڕێچکەو شێوازێکی سەربەخۆو تایبەتی دانەنرێ، زۆر کاریگەری سوود بەخش دەبێ و لە

---

[1] سۆزی نە تەوایەتی و بیری ناسیۆنالیز م لە تەرازو ی ئیسلام دا -چاپی یەکەمی نوسینگەی تەفسیر- ساڵی٢٠٠٥ /لا-٤٢-٤٣

تێبینی: ئەم کتێبە سێ جاری تر چاپ کراوە لەم چاپەیدا کە نوسینگەی تەفسیر کردوویەتی سەرجەم ئەو بابەتانەی پەیوەست بوون بەم باتەوەوە خراونەتە نێو ئەم کتێبە. واتە ئەم کتێبە چوارجار چاپ کراوە .ئامادەکار

[2] سەرچاوەی پێشوو لا-٤٤

دڵی هەموو موسڵمانێکی تێگەیشتودا جێی خۆی دەگرێ و، نەك هەر نابێتە گیاکەڵە و چەکی دەستی زۆر داران و گەلی پێ فریو نادرێ، بەڵکو دەبێتە هۆی چەسپاندنی خۆشەویستی خواو پێغەمبەر ﷺ و بڵاو کردنەوەی تەبایەتی و ڕەوشت بەرزی و هەڵبژاردنی دوارۆژ بەسەر دنیادا و ڕازی نەبوون بەژێر دەستەیی و مل نەدان بۆ کۆیلەیی و زەبوونی![1]

******************************

٧٩٧.بەسۆفی بوون مسوڵمانەتی نایەتەدی، بەڵکو مسوڵمانی ڕاستەقینە دەبێ بڕوای بەهەموو لایەنەکانی ئیسلام بێ و بۆیان تێبکۆشێ، واتە مسوڵمان دەبێ هەم سۆفی بێ هەم زانا هەم تێکۆشەر هەم سیاسی ...هتد.[2]

******************************

٧٩٨. هەر شێخ و صۆفی و دەروێشێك کە حەق و ڕاستی تەنیا لەڕێباز(طریقة)ە کەی خۆیان دا دەبینین و، ئیسلامی یەکیش کە ئیسلام تەنیا لەلایەنەکەی خۆی دادەبینێ! هەموو ئەمانە لە سۆنگەی دەمارگیریی و تەقلیدەوە گیرۆدەی دەردی دین لێ گچکە بوونەوە و تەنیا هەق لە خۆی دا دیتن و سەرگەردانی دەبن![3]

******************************

٧٩٩.کێشە و مشت و مڕی نێوان سەلەفی یەکان و سۆفیەکان لەسەر ئەسڵی سەلەفیەت و تەصەوف بەرهەم و زادەی حاڵی نەبوون و کرچ و کاڵ بوونە![4]

******************************

٨٠٠.سەلەفییەت ڕێرەوێکە کە دەبێ ئینسان بەکردەوە بیگرێتەوە نەك تەنها ناوو شۆرەتێك بێت و لەبازاڕی وشەکاری دا موزایەدەی بەسەر خەڵکی یەوە پێوە بکات![5]

******************************

---

[1] سەرچاوەی پێشوو لا–٤٤

[2] خواناسیی ئایین ئیمان –ڕاستییەکان ئیسلام دەدرەوشێنەوە ئەفسانەکانی ڕێچکان دەپووچێنەوە–چاپی یەکەم ساڵی ٢٠٠٠ –لا٤٢٠

[3] زانایانی ئیسلام کێن و چۆنن –چاپی یەکەم ساڵی ٢٠٠١ ز– لا–٦٠

[4] ڕێگای صالح بوون و بەرەو خوا چوون –تەزکیەی نەفس لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا–چاپی یەکەمی نوسینگەی تەفسیر–لا–٢٤٧

[5] سەرچاوەی پێشوو لا–٢٥١

٨٠١.سوورەتی فاتیحە[١] دەریایەکی بێ سنورە و هەرگیز گەوهەری ڕاستیەکانی کۆتایی یان نایەت و مرواری ڕاز و نهێنی یەکانی تەواو نابن ![٢]

******************************

٨٠٢.چوومە خزمەت قورئانی قسە لەجێ و لەگوڵزاری لالەزاری شاگوڵێکی حەوت پەریم خواست، بەدەستی بەدەست نوێژەوە بەبن تفنکی ژێریم هەڵبردو بەربوومە هەڵمژینی بۆن و بەرامەی و بەسەرە پیتەکەی باریکی قامکی خەیاڵ و بیر لە گوشێنێ ی وەخۆ کەوتم، زۆری پێ نەچوو ئەوەندە گوڵاوم لێ وەرگرت کە لە نێو شوشەی وشەی بەگرشەو ورشەی زمانی کوردیدا پێش کەشتانی دەکەم ![٣]◆

******************************

٨٠٣.فاتیحە وەك پێرستێك وایە بۆ مەبەستەکانی قورئان، واتە هەروەك چۆن پێرستی کتێبێك ڕێ نموونیت دەکات بۆ هەموو ئەو مەبەست و واتایانەی لەوێ دا باسکراون، فاتیحەش سەبارەت بەقورئانی گەورە و کشگیر(معجز) بەهەمان شێوە ![٤]

******************************

٨٠٤.ئینسان بۆیە خوڵقێنراوە بۆ ئەوەی چاکەی لەگەڵ دا بکرێ و لەنازو نیعمەتەکانی خوادا خاوەن پشك بێت ![٥]

******************************

---

[١] هەروەها سورە تەکانی د یکەش .

[٢] پوختەیەك دەربارەی ئیسلام لەبەر ڕۆشنایی سورەتی فاتحەدا - چاپی دووەم- ساڵی -٢٠٠٦ز لا-١٠

[٣] سەرچاوەی پێشوو لا-١٩

◆ ئەم وتەیە یەکێکە لە وتە پڕمانا و جوانە کانی نێو کتێبی (پوختەیەك دەربارەی ئیسلام)، کە مامۆستا دەربارەی سوورەتی فاتیحە نوسیویەتی، بەڵام ئەم وتەیە وەك وتەکانی تر واتایەکی تەواو لای خوێنەر دروست ناکات چونکە لەکۆتای وتەکەدا خوێنەر چاوەڕێی بابەتی تر دەکات ، بەڵام هەروەك لە پێشەکیەکەدا ئاماژەم پێداوە دەتوانی بۆ ئاشنابوونی زیاتر سەیری کتێبی ناوبراو بکەیت هەروەها بەسەیرکردنێکی خێرا لەم وتەیەدا وشەکاری زۆر بەجوانی دەردەکەوێت بۆیە ئێمەش هەڵمان بژارد.ئامادەکار

[٤] سەرچاوەی پێشوو لا-١٩-٢٠

[٥] سەرچاوەی پێشوو لا-[illegible]

٨٠٥. هی وامان هەیە بەجۆرێك ڕەفتار دەكات لەئەمریكاش ئەمریكاتر دێتە بەرچاو و پەندی (كاسە لەچێشت گەرمترە) یان بەسەردا دەچەسپێ![1]

******************************

٨٠٦.هەرقسە یەك كەدەكرێ ڕاست و درۆیان هەڵ دەگرێ، جیاوازی نێوان ڕاست و درۆیانیش، هەبوونی بەڵگەیە بۆ یەكەمیانی و نەبوونی بۆ دووەمیان![2]

******************************

٨٠٧.بەبێ تێكۆشان و شۆڕش لە پێناوی خوادا نەك هەر یادی خوا بەڵكو هەموو شتەكانی دیكەی ئیسلامەتی زەرد و سیس دەبن و دەبنە قاوغ و توێڵكێكی بۆش و بێ كاكڵ، چونكە طاغووت دەیانخاتە ژێر ڕكێفی خۆیەوەو، دەیانكاتە دەستەگیرەی خۆی و بۆ چاوبەستنی خەڵكی و پێ چەقاندنی خۆێ و هێشتنەوەی ڕژێمەكەی بەكاریان دێنێ، بەڵێ بەهۆی نەبوونی تێكۆشان و جم و جووڵ لەپێناوی خوادا مزگەوت و تەكیە و خانەقاكان كەجێگەی خوا تێدا پەرستنن دەبنە جێگەی طاغووت تێدا پەرستن، وەمینبەر و میحرابەكان كەشوێنی هەق تێدا گوتن و ئیسلام تێدا خستنەڕوون، دەبنە جێگەی هەق تێدا گۆڕین و ڕاگەیاندنی فەرمانەكانی طاغووت، وە وتارو كۆڕەكان كەهۆی خەڵك وریاكردنەوەو خوا بە خەڵك ناساندن و دووعاكردنن بۆ حوكم و بەرنامەی خوا، دەبنە هۆی خەڵك بێ هۆش كردن و طاغووت بە خەڵك ناساندن و دووعا كردن بۆ حوكم و ڕژێمی طاغووت![3]

******************************

٨٠٨.پاش ڕاپەڕینی زانیاری ڕێ و ڕەسمی كڵێسا،جێی پێ لەق بوو، لەئەنجامی ئەمەشدا ئەوروپا دووچاری دەردی بیربەتاڵی (الفراغ الفكری)بوو![4]

******************************

---

[1] دەبەرێك ڕاجوونی ئیسلام و ڕێچكان –چاپی سێیەم –ساڵی ٢٠٠٦ ز–لا –١١ (بە دەستكاری یەكی بچومەوە )

[2] سەرچاوەی پێشوو لا–٢٧

[3] یادی خودا /گرنگی یادی خوا لەژیانی مرۆ ڤ دا– بەرگی یەكە م – چاپی یەكەم– ساڵی ١٩٨٧لا–١٣–١٤

[4] سەرچاوەی پێشوو لا–١٠٤–١٠٥

٨٠٥. هی وامان هەیە بەجۆرێك رەفتار دەكات لەئەمریكاش ئەمریكاتر دێتە بەرچاو و پەندی (كاسە لەچێشت گەرمترە) یان بەسەردا دەچەسپێ![1]

******************************

٨٠٦.هەرقسە یەك كەدەكرێ راست و درۆیان هەڵ دەگرێ، جیاوازی نێوان راست و درۆیانیش، هەبوونی بەڵگەیە بۆ یەكەمیانی و نەبوونی بۆ دووەمیان![2]

******************************

٨٠٧.بەبێ تێكۆشان و شۆرش لە پێناوی خوادا نەك هەر یادی خوا بەڵكو هەموو شتەكانی دیكەی ئیسلامەتی زەرد و سیس دەبن و دەبنە قاوغ و تویڵكێكی بۆش و بێ كاكڵ، چونكە طاغووت دەیانخاتە ژێر ركێفی خۆیەوەو، دەیانكاتە دەستەگیرەی خۆی و بۆ چاوبەستنی خەڵكی و پێ چەقاندنی خۆێ و هێشتنەوەی رژێمەكەی بەكاریان دێنێ، بەڵێ بەهۆی نەبوونی تێكۆشان و جم و جووڵ لەپێناوی خوادا مزگەوت و تەكیە و خانەقاكان كەجێگەی خوا تێدا پەرستنن دەبنە جێگەی طاغووت تێدا پەرستن، وەمینبەر و میحرابەكان كەشوێنی هەق تێدا گوتن و ئیسلام تێدا خستنەروون، دەبنە جێگەی هەق تێدا گۆرین و راگەیاندنی فەرمانەكانی طاغووت، وە وتارو كۆرەكان كەهۆی خەڵك وریاكردنەوەو خوا بە خەڵك ناساندن و دووعاكردنن بۆ حوكم و بەرنامەی خوا، دەبنە هۆی خەڵك بێ هۆش كردن و طاغووت بە خەڵك ناساندن و دووعا كردن بۆ حوكم و رژێمی طاغووت![3]

******************************

٨٠٨.پاش راپەرینی زانیاری رێ و رەسمی كڵێسا،جێی پێ لەق بوو، لەئەنجامی ئەمەشدا ئەوروپا دووچاری دەردی بێربەتاڵی (الفراغ الفكری)بوو![4]

******************************



[1] دەبەرێك راجوونی ئیسلام و رێچكان -چاپی سێیەم -ساڵی ٢٠٠٦ ز-لا -١١ (بە دەستكاری یەكی بچوومەوە )

[2] سەرچاوەی پێشوو لا-٢٧

[3] یادی خودا /گرنگی یادی خوا لەژیانی مرۆ ڤ دا- بەرگی یەكە م - چاپی یەكەم- ساڵی ١٩٨٧لا-١٣-١٤

[4] سەرچاوەی پێشوو لا-١٠٤-١٠٥

٨١٥.جیاوازی نێوان (سزا) و (پاداشت) ی خوا و بەندە، هێندەی جیاوازی نێوان (خوا) و (ئینسان) وایە ![1]

*******************************

٨١٦. جیاوازی نێوان (سزا) و (پاداشت)ی کاتی و سنوردار و هی نەبڕاوە و بێ سنوور، وەك جیاوازی نێوان( بوون)– وجود– و (نەبوون) – عدم– وایە ![2]

*******************************

٨١٧.کەسانێك کەبێ باریی و چەواشەکاریی و دوو ڕوویی و درۆو دەلەسەو فێڵ و فەرەج و ژێر بەژێر و قۆرت و پێچ و بێ بەڵێنی و پەیمان شکێنی .. بەزیرەکی و سیاسەت و کارامەیی و وریایی دادەنێین! لە جیاتی دڵ پێ خۆشبوون و پێ سەرسام بوون، شایستەی دڵ پێ سووتان و دووعای هیدایەت بۆ کرانن![3]

*******************************

٨١٨.هەتا دەتوانن هەوڵ بدەن کە زانراو و شارەزایی یەکانی نێو مێشکتان ببنە قەناعەت و بچنە نێو دڵ و دەروونتانەوە و لە (قالْ) بۆ (حالْ) تەحویل بن و لە زانینەوە بگوڕێن بۆ توانین![4]

*******************************

٨١٩.بەبێ بەکارهێنانی حیکمەت و کارامەیی بەتایبەت لە بواری بانگەواز دا گەلێك جار لەجیاتی سوود کەڵك گەیاندن زیان دەگەیەنین و لەسەر کارەکەمان قەرزدا دەبینەوە، بۆیە "چۆن دەڵێ ی" چی وای کەم نیە لە "چی دەڵێ ی؟![5]

*******************************

٨٢٠.با لەکاتی فێرکردن و بانگەواز دا زیاتر ئەو بابەت و مەسەلانە باس بکەین و جەختیان لەسەر بکەین کە خەڵك پێویستی پێ یانە نەك خۆمان کەیفمان لێیانە ![6]

---

[1] سەرچاوەی پێشوو لا–٤٤٥

[2] سەرچاوەی پێشوو لا–٤٤٥

[3] زانایانی ئیسلام کێن و چۆنن –چاپی یەکەم ساڵی ٢٠٠١ ز–لا–٥٣

[4] سەرچاوەی پێشوو لا–٥٤

[5] سەرچاوەی پێشوو لا–٥٥

[6] سەرچاوەی پێشوو لا–٥٧

٨٢١.فیرعەونەکان هێندە دڵسۆز و بە پەرۆشن بۆ (دین) و (ژین)ی خەڵك و جەماوەر و تەنانەت لە خوای پەروەردگاریش بێ باکن و ئامادەن بۆ بەرگری کردن لە دین و ژینی خەڵکی تەنانەت پێغەمبەری خواش بکوژن![1]◆

******************************

٨٢٢.کێ هەیە – مەگەر یەکجار بەستە زمان و نەزان بێ – بەقسەی بە ڕواڵەت خۆش و نێوەڕۆك بۆشی فیرعەونەکان باوەڕ بکات کە ئەو شەڕ و هەرایەی لەگەڵ بەرەی حەق دا دەیکەن لەسەر خوایە نەك لەسەر خورما؟![2]

******************************

**٨٢٣.ئەوەی چاکە بێ باکە، چونکە پەرێزی چاکە و بەرچاوی ڕووناکە![3]**

******************************

٨٢٤.پاکسازی بە پاکان و چاکسازیی بەچاکان و (إصلاح) بە (صالح)ان دەکرێ![4]

******************************

٨٢٥. کەسێك گوڵی بوێ دەبێ ئازاری دڕك و داڵیش لە خۆی بگرێ![5]

******************************

---

[1] سەرچاوەی پێشوو لا–٣١٢

◆ هەر لەدێر زەمانیشەوە فیرعەون و نەمرودەکان بەهێزترین چەکی دەستیان لەبەرامبەر پێغەمبەرانی خواو هەڵگرانی مەشخەڵ و پەیامی هەقدا بریتی بووە لە چەواشە کردن و سەرلێ شێواندنی خەڵکی و ئەهلی هەق لەبەرچاو بێزاندنیان لەڕێ ی ناو ناتۆرەی خراپ وەدواخستن و تۆمەتبارکردنیانەوە

تەماشا بکەن فیرعەونێکی طاغووتی خۆ بەپەروەردگار و پەرستراو زانی چەوسێنەر چ بوختان و تۆمەتێکی نارەوا دەداتە پاڵ موسا(علیه السلام) بۆ لێخن کردنی سومعەو کەسایەتی و خەڵك و جەماوەری سادە لێ وروژاندنی :( وَقَالَ فِرعَوْنُ ذرُوني أقْتُلْ مُوسَى وَلْيَدْعُ رَبَّهُ أنّى أخَافُ يُبَدِّلَ دِينَكُمْ أويُظهرَ في الأرْضِ الْفسَادَ) غافر :٢٦

واتە: وە فیر عەون گوتی لێم گەڕێن با مووسا بکوژم، وەبابێ منەت بێ لەپەروەردگاری بپاڕێتەوە، چونکە من دەترسم ئایینەکەتان لێ بگوڕێ –و بیشێوێنێ –یاخود خراپەو ئاشووب لەلاتدا پەیدا بکات!

[2] سەرچاوەی پێشوو لا–٣١٢

[3] سەرچاوەی پێشوو لا–٣١٦

[4] ڕێگای صالح بوون و بەرەو خواچوون –تەزکیەی نەفس لەبەر ڕۆشنایی قورئان سوننەت دا –چاپی یەکەمی نوسینگەی تەفسیر –ساڵی ٢٠٠٥ ز–لا–٧

[5] سەرچاوەی پێشوو لا–١٧٦

٨٢٦.هەمیشە هەڵس و کەوت و کردەوەکانی ئینسان زادەو بەهەم و ڕەنگدانەوەی بیرکردنەوەو هەست و نەست و قەناعەتەکانیەتی ![1]

******************************

٨٢٧.لە ئێمەی مرۆڤـ هەوڵ و جەرەکەت و لە خوای بەرزو مەزن و بەبەزەیش، بەپیرەوە هاتن و ڕێ نیشاندان و دەست گرتن و سەرخستن و بەرەکەت![2]

******************************

٨٢٨.فەرمایشتی خوا دوو بەشە: بە شێکی هەواڵ دانەو بەشێکی حوکم دانە، هەواڵەکەی هەمووی ڕاستە، حوکمەکەشی هەمووی دادە ![3]

******************************

٨٢٩.مرۆڤـ قەت قەت لە شتێکدا ناگاتە پلەی دڵنیابوون و دڵ دامەزران کە لە دنیای بەڵگاندا بێ بەشەو لە لای عەقڵ و سروشت ڕوو ڕەشە و سەر بەهەشە ![4]

******************************

٨٣٠.پێغەمبەران وەك خەڵکی مرۆڤن، بەڵام مرۆڤـ تامرۆڤـ فەرق دەکات، مرۆڤـ هەیە لە فریشتە بەرزترەو، هەشە لە ئاژەڵ نزمتر![5]

******************************

٨٣١.تیرۆریست کەسێکە کە هەوڵی سەپاندن و فەرزکردنی بیروباوەڕ و قەناعەتی خۆی دەدات، جا چ قەناعەتێکی دینی بێت، چ سیاسی بێت، چ فەلسەفی بێت، چ مەزهەبی، چ بەهەرشتێك بێت

---

[1] زنجیرە دەرسی ئیمان و عەقیدەی ئیسلامی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەت دا بەرگی یەکەم /ئیمان و عەقیدەی ئیسلامی چی یەو چۆنە- چاپی یەکەم ساڵی ٢٠٠٧ز-نوسینگەی تەفسیر-لا-٣٣

[2] زنجیرە دەرسی ئیمان و عەقیدەی ئیسلامی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننە تدا /بەرگی دووەم /خوا بە یەکگرتن لە بەدیهێنرابەتیو پەروەردگارێتی دا-چاپی یەکەم -ساڵی ٢٠٠٧ز-لا-١٤

[3] -سەرچاوەی پێشوو-لا-١٢٨

[4] زنجیرە دەرسی ئیمان عەقیدەی ئیسلامی لەبەر ڕۆشنایی قورئان سوننەت دا- بەرگی چوارەم -بڕوا بە فریشتەکانی خوا -بە پێغەمبەرانی خوا -بە کتێبەکانی خوا -لا-٢٩٩

[5] سەرچاوەی پێشوو-لا-٣٠٥

هەرکاتێك قەناعەتی خۆت یان قەناعەتی پڕو دەستەو کۆمەڵی خۆت بە تۆبزیی فەرز بکەیت لەسەر غەیری خۆت بێگومان ئا ئەوە حاڵەتێکی تیرۆریستانە یە![1]

******************************

٨٣٢.ئەوە طاغوتە خۆبە زلگرەکان پاش تێکشان و بەزین لە مەیدانی وتوێژ و بەڵگە هێنانەوەدا پەنایان بردۆتە بەر ئاگر و ئاسن و ئەشکەنجەو ئازاردان و گرتن و لەوڵات دەرکردنی پێغەمبەران و شوێنکەوتوانیان، وە پاش نەمانی هێزی بەڵگە (قوة الدليل) و هانایان بردووە بۆ بەڵگەی هێز (دليل القوة) بە واتایەکی دیکە، لەبەرامبەر قووەتی مەنتیق دا پەنایان بردۆتە بەر مەنتیقی قووەت![2]

******************************

٨٣٣.تەنها کەسێك بە کەڵکی گەورایەتی و حوکمڕانێتی دنیا دێت کە عەقڵی هێندەی گرفت و کێشەکانی سەرجەم ئەهلی دنیا و، دڵی هێندەی هەست و نەستەکانی خەڵکی دنیا فراوان بێت و، ڕەوشتی بارتەقەی تێکڕایی خەڵکی دنیا مەزن بێت![3]◆

---

[1] چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم سەرنجێکی واقیعیانەو هەڵسەنگاندێکی شەرعییانە –چاپی چوارەم – ساڵی ٢٠٠٥ ز–لا–١٦

[2] سەرچاوەی پێشوو–لا–٢١

[3] سەرچاوەی پێشوو–لا–٣٦

ئەم وتەیەی مامۆستا کە لەکتێبی (چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم ) دا نوسیوویەتی هەمان وتەی بەشێوەیەکی تر کە هەمان ناوەڕۆکی هەیە لە کتێبی ئەشکەنجەو زیندان دا وتووە، واتا ئەوەی مامۆستا لەساڵی ٢٠٠٢ ز قەناعەتی وابوە دەربارەی کەسێك کەبیەوێت حوکمی دونیا بکات هەر هەمان شتە کە لەساڵی ٢٠٠٦ ز دەیڵێتەوە ئەمەش لەمیانەی وەڵامی پرسیارێکدا کە لەکتێبی ئەشکەنجەو زیندان دا بەمشێوەیەی خوارەوە :

هاوژین عومەر: لەسەردەمی دەسەڵاتی جوڕج بۆشدا، تۆ دووساڵ زیندانی بوویت، ئەگەر ڕۆژێك بوّش ببینی، چی پێ دەڵێی؟

مامۆستا عەلی باپیر: پێی دەڵێم ئەگەر پیاوی گەورە هەڵەی هە بێت، هەڵەکەیشی بەقەد خۆی گەورەیە، تۆ کە سەرۆکی وڵاتێکی وەکو ئەمریکا بووی، دەتەویست ئەمریکا دەسەڵات بەسەر هەموو دنیادا بگریت، کەسێك خولیای هێندە گەورەی هەبێت، دەبێ عەقڵیشی هێندە گەورە کات، دڵیشی ئەوەندە گەورە بێ و ئەخلاقیشی ئەوەندە گەورە بێت، ئەگەرنا، پێی عەیبدار دەبی، مەسەلە هەر ئەوەندە نییە ناوی گەورە لە خۆت بنێی، دەبێ کەناوی گەورەت لە خۆنا، ناوەڕۆکی گەورەشت هەبێ، عەقڵێکی گەورە، دڵێکی گەورە، ئەخلاقێکی گەورە، ئەگەر نا، لەسەر ناوە گەورەکەت عەیبدار و ناشیرین دەبی، ئاوام پێ دەگوتن، وەکو ئێستا وای لێهات، پێی عەیبدارو ناشیرین بوو. ئامادەکار

٨٣٤.دەستبار بۆ یەکدی گرتن بریتیە لەیەکدی قبولّ کردن ویەکدی تەحەمولکردن و پێکەوە ساچاندن و مەدارکردن، چونکە تۆ هەتا بوونی یەکێك نەسەلمێنی و ئامادەنەبی تەحەممولی جیاوازیەکانی بکەی هەرگیز ناتوانی لە گەڵی دا تەباو گونجاو بی و هاوکارو دەستبارگری بی ![1]

*******************************

٨٣٥.هەر کۆمەڵگایەك – بەتایبەت لەئاستی خەڵکی بڕیاربەدەست دا– بەردەوام سەرگەرمی پشکنین بێ بۆ دیتنەوەی خاڵی جیاوازی و زیاتر زەقکردنەوەیان و فەرامۆشکردنی خاڵ و ئامانجە هاوبەشەکان، گەل و کۆمەڵگایەکی دواکەوتوو دۆڕاوە، چونکە بەدەستی خۆی گۆڕی خۆی هەڵدەقەنێ و وزە و توانایەکانی خۆی لەدژی ئایندە و بەرژەوەندی یەکانی خۆی بەکاردێنێ و، سەرەنجام دەستی لە بنی هەمبانەی بە تاڵ دەردێنێ ![2]

*******************************

٨٣٦.هەرکەسێك بیەوێ ڕەوڕەوەی قەتاری مێژوو بەرەو پێشچوونی ژیان، ڕاگرێ بۆی ڕاناگیرێ و خۆیشی دووچاری شێلران و پڵیشانەوە دەکات ![3]

*******************************

٨٣٧.هەر کەسێك چاوی لە وەبێ کە لەسەر حیسابی بژێوی خەڵك عەیش و نۆش بکات، دەبێ بزانێ ڕۆژێك دێ ئەو ڕابواردنەی لێ دەکەنە ژارەمار ![4]

*******************************

٨٣٨.بێگومان لاف لێدان و دەعوا کردن ئاسانە، بەڵام ئیسپاتکردنی زەحمەتە و، قسەی بێ بەڵگە و دەعوای بێ ئیسپا تکردنیش وەك پارەی تەزویر نەك هەر دادی خاوەنەکەی نادات، بەڵکو دەبێتە مایەی عەیبداریی و شەرمەزارییشی ![5]

*******************************



[1] تەوژمی ئیسلامیی و عەلمانیی خاڵە هاوبەش و جیاوازە کانیان –چاپی یەکەم–٢٠٠٨ ز –لا –١٢
[2] سەرچاوەی پێشوو–لا–٢١
[3] سەرچاوەی پێشوو–لا–٩١
[4] سەرچاوەی پێشوو–لا–٩٢
[5] سەرچاوەی پێشوو–لا–١٣٧

٨٣٩.هەرشتێك لەسەر بناغەی نەزانیی بنیات نرابنرێ زوو هەرەس دێنێ و بنەتووی خۆیشی ناکاتەوە ![(١)]

*****************************

٨٤٠.بەرنامە بۆ ئیش و کار وەك رەگ و ریشە بۆ درەخت و بناغە بۆ دیوار وایە، وە لە راستیدا هەرکەسێك بیەوێ لەجێبەجێ کردنی کارێك دا سەرکەوتوو بێ و ئەو ئامانجەی کە تێیدا رەچاو کراوە دەستگیر بکات، حەتمەن دەبێ پێش هەنگاو نان بەرنامەی ئەنجام دانی ئەو کارەی لە بەرچاو روون و ئاشکرا بێت ئەگەر نا کارەکەی نە سەردەگرێ و نە بەریش وە خاوەنەکەی جگە لە ماندو بوون و رەنج بەزایە چوون و دەم لە پووش بوون هیچ ئاکامێکی دیکەی نابێت![(٢)]

*****************************

٨٤١.یەکەمین هەنگاو و سەرەکی ترین مەرجی پێگەیشتن چاك تێگەیشتنە ![(٣)]

*****************************

٨٤٢.بەدیلی شورا جگە لە حوکمی تاکی و دیکتاتۆریەت هیچی تر نی یە ![(٤)]

*****************************

٨٤٣.ئاواتی گەورە پیاوی گەورە دروست دەکات![(٥)]

*****************************

٨٤٤.(مونافیقەکان)◆ لە هەموو جۆرە کافرەکانی تر خەسڵەت و پێکهێنەرەکانی پێری شەیتانیان تێدا هاتۆتەدی و، پێری تەواو عەیاری ئیبلیسن، خوا بیانبرێ چەند پیس و نەگریسن! ![(٦)]

*****************************

---

(١) سەرچاوەی پێشوو-لا-١٣٧

(٢) پرۆژی بەرنامەی فیکری کاریی ئیسلامی -ساڵی - ١٩٩٦ز-چاپی یەکەم -لا-٤

(٣) سەرچاوەی پێشوو-لا-١٠٤

(٤) سەرچاوەی پێشوو-لا-١٤٦

(٥) سەرچاوەی پێشوو-لا-١٦٨

◆ ئەمەی لە نێو کەوانەکەدایە لە سیاقی وتەکەی مامۆستا نی یە، بەڵام پێش ئەم وتەیە سەرجەمی ئەو باسانەی تر باس لەخراپی مونافیقەکان دەکات، بۆیە ئێمەش ئەو وشەیامان دانا، کە هیچ لە واتای وتەکە ناگۆرێ، بەڵکو لێرەدا بەمشێوەیە تەواو دەبێت. ئامادەکار

(٦) سەرچاوەی پێشوو-لا-٢٢١

٨٤٥.مونافیقەکان نمونەی زەقی ئەوانەن کە بەهۆی خیانەت لە ئەمانەتی (هیدایەت )ی خواوە ریسوا دەبن، چونکە دەزانن ئایین چی یە و پشت گوێشی دەخەن![1]

*******************************

٨٤٦.هاوبەش پەیداکەران نموونەی زەقی ئەوانەن کە بەهۆی خیانەت و نا پاکی لە تایبەتمەندی یەکانی ئینسان و بەزایەدان و بەکارنە هێنانیان لە شوێنی خۆیاندا زەبوون و سەرشۆڕ دەبن، چونکە ئەگەر عەقڵ و هۆشی خۆیانیان بەکارهێنابا و بە لاساکردنەوەو شوێن کەوتنی کوێرانە وازیان نە هێنابا تووشی بت پەرستی نەدەبوون ![2]

*******************************

٨٤٧.ئەوەی دەزانێ بۆ کوێ دەچێ، دەشزانی بەکوێ دا دەچی![3]

*******************************

٨٤٨.هەر کەسێك بزانێ چی دەکات دەشزانێ چۆنی دەکات![4]

*******************************

٨٤٩.ئەو کوردانەی گوایە بەداوی هیدایەت دا دەگەڕێن و دەبنە نەصرانی چەند داماو و بەجێماو هەڵخەڵەتاون کە دەکەونە شوێن دینێکی لە ئەسڵ دا بۆ ئێستاو ئێمە نەهاتووی گۆڕاو و هیچ بەسەر هیچەوە نەماو! ئەمە ئەگەر بەدوای (دین) دا بگە ڕێن، بەڵام ئەگەر عەودالّی ژین بن ئەوە دیارە شتێکیان چنك دەکەوێ، بەڵام بێگومان زۆر کەمتر و گچکەتر لە ئابروو چوونی دنیا و دوارۆژ ! ![5]

*******************************

٨٥٠.ئەوی کە زۆر جێی سەرنجە و بگرە سەرسوڕمانە، ئەوەیە لە نێو میللەتێکی مسوڵمان دا کە هیچ کەس — بەقیادەی سیاسیشەوە — نکۆڵی ناکا لەوەی کە ئەو خەڵکە مسوڵمانە هەمووشی

---

[1] سەرچاوەی پێشوو-لا-٢٣١

[2] سەرچاوەی پێشوو-لا-٢٣١

[3] سەرچاوەی پێشوو-لا-٢٤٣

[4] سەرچاوەی پێشوو-لا-٢٤٤

[5] زنجیرەی بابەتە هەنوکەییەکان ئەڵقەی یەکەم -گەنجەکانمان لەنێوان رەسەنایەتی و لاسایی کردنەوەدا- چاپی یەکەم -ساڵی ٢٠٠٦ ز لا-٢٤

ئیددیعای مسوڵمانەتیی دەکات و خۆشی بەمسوڵمان دەزانێ کە چی لە هۆیەکانی ڕاگەیاندنی هەموونیان بەبێ هەڵاواردن گوێت لە ئایەتێکی قورئان یاخود فەرمایشتێکی پێغەمبەر نابێ (علیه الصلاة والسلام )وە گوێبیستی ڕەواج پێدانی قیەمێکی ئیسلامی نابیت! وەکو ئەوە ئیسلام هیچ شتێکی چاك و پەسەندی تێدا نەبێ کە شایستەی باس کران بێت و لە ژیانماندا بەس زەرەر و زیانمان کردبێ لە ئیسلام ![1]

******************************

٨٥١.شارستانیەتی ڕۆژئاوا کە شارستانیەتێکی ماددی و ئاژەڵی یەو لەسەر بناغەی ماددی بوونی ژیان و ئاژەڵ بوونی ئینسان بنیات نراوە بۆیەش تەنها لەو دەروازەیەوە تەماشای هەموو شتێك دەکات ![2]

******************************

٨٥٢.شتێك کە لە خودی خۆیدا شەرعی و چاك بوو بە هۆی ئەوەوە کە کەسانێك بەشێوەیەکی هەڵە و بەڕێ یەکی ناشەرعیدا دەیکەن خراپ نابێ ![3]

******************************

٨٥٣.با هەرکەسە قەناعەتی بەچ دینێك و چ دەقێکی پیرۆز هەیە بیانخاتە ڕوو، وە خەڵکیش سەر پشکە چی و کێ هەڵدەبژێرێ و گوێ بۆ کام دەقە ڕادەێرێ![4]

******************************

٨٥٤.خوای بەدیهێنەر بە شەرعی خۆی و لەڕێگەی (وحیی) ی خۆیەوە لەسەری پێویست کردوە، کە سوپاسگوزاربێ، بەڵام زۆر (جبر)ی لێ نەکردوە، کە حەتمەن ڕێگەی هیدایەت و سوپاسگوزایی خوا بگرێت، بەڵکو ئازادی کردوە و سەرپشکی کردوە، دوایش لە دواڕۆژدا شایستەی پاداشت یاخود سزا دەبێ لەسەر بەرهەم و ئەنجامی ئەو ویست و ئیرادە ئازادانەیەی کەپێی دراوە ![5]

---

[1] سەرچاوەی پێشوو-٦١

[2] زنجیرەی بابەتە هەنوکەییەکان ئەڵقەی دووەم -باوریابین داڕووخانی ڕەوشت کۆمەڵگاکەمان بەرەو هەڵدێر دەبات -چاپی یەکەمی نوسینگەی تەفسیر -ساڵی ٢٠٠٧ ز-لا-٣٤

[3] زنجیرەی بابەتە هەنوکەییەکان ئەڵقەی -چوارەم-چۆنیەتی بوونە پێشەنگ و بنیاتنانی بنکەی جەماوری - چاپی یەکەم -ساڵی٢٠٠٧ ز-لا-٦٢

[4] سەرچاوەی پێشوو-لا-٤٢

[5] سەرچاوەی پێشوو-لا-١٠٤

٨٥٥.هیچ پێغه‌مبه‌رێك نه‌هاتوه كه دیكتاتۆر و فیرعه‌ونێك یه‌خه‌ی پێ نه‌گرتبێ، ئه‌وه مووسایه فیرعه‌ون یه‌خه‌ی پێ ده‌گرێ، ئه‌وه ئیبراهیمه و نه‌مروود رێگه‌ی پێ ده‌گرێ، ئه‌وه موحه‌ممه‌د(ﷺ) و ئه‌بوجه‌هل شه‌ڕی پێ ده‌فرۆشێ، ئه‌وه هه‌موو پێغه‌مبه‌رانن (علیهم الصلاة والسلام) كه دیكتاتۆر و زله‌زله‌كان رێگه‌یان پێ ده‌گرن![1]

********************************

٨٥٦.ئێمه ده‌بێ سه‌یر بكه‌ین خه‌ڵك چی پێویسته نه‌ك خۆمان چیمان پێخۆشه![2]

********************************

٨٥٧.تا ته‌صه‌ووراتی خه‌ڵك تێك نه‌چێ ته‌صه‌رووفاتیان تێكناچێ![3]

********************************

٨٥٨.ئێمه ده‌بێ حه‌ق بڵێین، به‌ڵام به‌شێوه‌یه‌كی حه‌ق ئه‌و حه‌قه بڵێین![4]

********************************

٨٥٩.كه‌سێك ته‌حه‌مولی باج دان نه‌كات و له‌گه‌ڵ یه‌كه‌مین ناڕه‌حه‌تیدا به‌چۆك دابێ و بشڵه‌ژێ و بله‌رزێ:

یه‌كه‌م: له‌سه‌ر هه‌قگوتنه‌كه‌ی قه‌رزدار بۆته‌وه‌و كۆتایی هه‌ڵوێسته هه‌قه‌كه‌ی خۆی به هه‌ڵوێستێكی (باطل) هێناوه و سه‌ره‌تا باش ڕاساوه، به‌ڵام له نیوه‌ی ڕێیه‌دا كه‌وتوه و پساوه‌و پێی نه‌ماوه.

دووه‌م: وه ئیسپاتی كردوه كه هه‌قگوتنه‌كه‌ی یه‌كه‌میشی ته‌نیا دڵگه‌رم بوونێكی كاتیی و حه‌ماسه هه‌ڵسانێكی بێ به‌رنامه بووه و پێشینان گوته‌نی (سوار نه‌بووه به‌ڵام ئه‌سپ هه‌ڵی گرتوه)![5]

********************************

٨٦٠.كه‌سێك كه‌پاش چوار قسه‌ی هه‌ق و ڕاست گوتن، به‌چوار قسه‌ی ناخۆش و هه‌ڕه‌شه و گوڕه‌شه و یان ماوه‌یه‌ك زیندان و چه‌ند زلله و قه‌مچی یه‌ك بشڵه‌ژێ و خۆی و دۆستانی زۆر

---

[1] زنجیره‌ی بابه‌ته هه‌نوكه‌ییه‌كان ئه‌ڵقه‌ی پێنجه‌م–سیاسه‌تی ئیسلامی و چه‌ند روون كردنه‌وه‌یه‌ك –چاپی یه‌كه‌م –ساڵی ٢٠٠٧–ل–١٢٠

[2] زنجیره‌ی بابه‌ته هه‌نووكه‌ییه‌كان ( ئه‌ڵقه‌ی شه‌شه‌م) چه‌ند بنه‌مایه‌كی گرنگی وتاریبێژی –چاپی یه‌كه‌م – ساڵی ٢٠٠٧ز–ل–٣٤

[3] سه‌رچاوه‌ی پێشوو–ل–٣٧

[4] سه‌رچاوه‌ی پێشوو–ل–٧٠

[5] سه‌رچاوه‌ی پێشوو–ل–٧٢

سەغڵەت بکات و ....هتد، بەو هەڵوێستە لاواز و بێ خێرە هێندە ئیسلام و مەلاو مزگەوت ناشیرین دەکات، ئەگەر دەساڵان هەقی گوتبێ خۆی قەرزدار کردۆتەوە و کارێکردوە کە قازانجی سەری مایەی خواردوە ![1]

*******************************

٨٦١.تەنیا ئەوەندە بەس نیە کە ئینسان هەق بڵێ، یان شوێنی هەق بکەوێ، بەڵکو دەبێ کە هەق دەڵێ بەشێوەیەکی هەقیش بیڵێ، وە کە شوێن هەقیش دەکەوی بەشێوەیەکی ڕاست و هەقیش شوێنی بکەوی ![2]

*******************************

٨٦٢.ئاسانە قسەی هەق بکەی، بەڵام دوایی زەحمەتی دەوێ ئامادەبی باجەکەشی لەسەر بدەی ![3]

*******************************

٨٦٣.بەهەشت بۆیە خۆشە چونکە ڕەزامەندی خوای تێدایە ![4]

*******************************

٨٦٤.هیچ کاتێك شەرعیی بوونی کارێك شەفاعەت بۆ ناشەرعیی بوونی چۆنیەتی و شێوەی ئەنجام و درانەکەی ناکات و قەرەبووی ناکاتەوە ![5]

*******************************

٨٦٥. ئەو کەسە هەڵە ناکات کە هیچ ناکات ![6]

*******************************

---

[1] سەرچاوەی پێشوو-لا-٧٣

[2] زنجیرەی بابەتە هەنوکەییەکان ئەڵقەی نۆیەم- بانگەواز بۆلای خودا چییەو چۆنەو بەکێ و بۆچی دەکرێ؟ چاپی یەکەم ساڵی -٢٠٠٧ز-لا-١٧

[3] سەرچاوەی پێشوو-لا-٣٠

[4] سەرچاوەی پێشوو-لا-٤٦

[5] جیهاد لەڕێ ی خوادا چییەو ؟! بۆچی دەکرێ و ؟! چۆن دەکرێ و ؟! چەند قسەیەکی دڵسۆزانە بۆ حوکمڕانەکانی کوردستان-چاپی یەکەم -٢٠٠٢ز-لا-٦

[6] سەرچاوەی پێشوو-لا-٨

٨٦٦.بەوەسایلی نـــــــــاشەرعی ئامانجی شەرعی نایـــــــەتەدی![1]

*******************************

٨٦٧.جیهاد و جەنگ و کوشتار وەك چۆن لە پێناوی خوادایە دەبێ بەپێی شەرعی خواش بێ، وە ئادابی شەرعیشەوە بێ، وە پێویستە سەرجەم حوکمە شەرعی یەکانی تێدا ڕەچاو بکرێن ئەجار جەنگ و جیهادەکە بە عیبادەت لەقەڵەم دەدرێ و لەڕوانگەی شەرعەوە ڕێی پێ دەدرێ و خاوەنەکەیشی پاداشتی لەسەر وەردەگرێ، ئەگەرنا لە جیاتی پاداشت لەسەر یشی سزا دەدرێ ![2]

*******************************

٨٦٨.شەهید بۆ چی پێی دەگوترێ (شاهد)؟ چونکە بە خوێنی خۆی شایەدی دەدات کە دینی خوای لە ژینی خۆی خۆشتر دەوێت، دینی لە ژینی خۆشتر دەوێت، دین لە ژین خۆشەویسترە بۆیە ژینی بەقوربان دەکرێت![3]

*******************************

٨٦٩. نابێ هیچ کاتێك دەست بەرداری هەق بین لەسۆنگەی ئەوەوە کە(باطل)ی لەگەڵ تێکەڵ بووە، بەڵکو پێویستە بە بێژنگی قورئان و سوننەت پاشان عەقڵ پاك و پیس و، ئازار و قرپۆکی قسان لێك هەڵاوێرین![4]

*******************************

٨٧٠.ڕابردوو کاریگەری هەیە لەسەر ئێستا، ئێستاش بناغەیە بۆ داهاتوو، بیر کردنەوە لەداهاتووش کار لە ئێستا دەکات، هەر کەسێك نەزانێ لەڕابردوودا چی کردووە نازانێ ئێستاش چی بکات! وەنازانێ بۆ سبەینێش چی بکات و چۆن بکات![5]

*******************************

٨٧١. هەمیشە گۆڕینی نەفس بناغەیە بـــــــــــۆ گۆڕینـــــــــــی واقیع![6]

---

[1] سەرچاوەی پێشوو–ل–٢٩

[2] سەرچاوەی پێشوو–ل–٣٠

[3] شەهید کێ یەو چ پلە و پایەیەکی هەیە ؟!چاپی یەکەم –ساڵی ٢٠٠٢ز–ل –٩

[4] بزوتنەوەی ئیسلامیی و ئاسۆیەکی گەش و ڕوون –بنەما شەرعی یەکان و بنچینە ئەخلاقییەکان–چاپی یەکەم– ساڵی ١٩٩٧ ز–ل –٥١

[5] کارو پرۆژەی ئیسـ[illegible] –چاپی یەکەم –ساڵی [illegible]–ل–٨

٨٧٢.بەناوی گەورە گەورە نابین، بەڵکو بەنێوەڕۆکی گەورە گەورە دەبین![1]

*******************************

٨٧٣.ئێمە تەماشا دەکەین ئەمریکا لەبەر ئەوەنییە، کوێخایەتیی بەسەر جیهاندا دەکا، چونکە زۆر دیموکراسییە! یا زۆر بەتەنگ مافی مرۆڤەوەیە! یا زۆر بەهای بەرز بەرزی پێیە! بەڵکو، لەبەر ئەوەیە نینۆکی لە نینۆکی هەموو کەس درێژترە، کەڵبەی لەکەڵبەی هەمووکەس تیژترە و دەسەڵاتیشی لەدەسەڵاتی هەموو کەس زیاترە، بەڕاستی ئەوەیە وای لێ کردووە بانگەشەی کوێخایەتیی بکاو وەك کوێخایەك خۆی بنوێنێ ![2]

*******************************

٨٧٤.جیاوازی نێوان هەق و باطل هێندەی جیاوازی نێوان بوون و نەبوون و ڕووناکی و تاریکی و ئاسمان و زەمینە، پێویستە جیاوازی نێوان بەرەی هەق و بەرەی باطل کە لەچاکی و پاکی و ڕاست و دروست و دادگەری و مهرەبانی و کارامەیی و لێزانی دا هەروا بێت و، هەروەك چۆن ئەهلی باطل لەقەدەر باگلی خۆیانن دەبێ ئەهلی هەقیش لەقەدەر هەقی خۆیان بن![3]

*******************************

٨٧٥.مەسەلە تەنها ئەوە نیە کردەوەی چاك بکەی بەڵکو پێویستە بەشێوەیەکی چاکیش بیکەی، وەك چۆن هەق گوتن چەند گرنگ و پێویستە بەشێوەیەکی هەق و ڕاست گوتنیشی هێندە![4]

*******************************

٨٧٦. "بەتەئکید خوا ئەوانەی کەبڕوایان هێناوە دەیان ناسێ وەدەغەڵ و دووڕووەکانیش دەناسێ"◆ ،بەڵام دەیەوێ لە مەیدان داو بەکردەوە حاڵی خۆیان بۆ خۆیان و بۆ خەڵك دەرکەون، بۆ ئەوەی بەدەعوا و لاف لێدانی ڕووتی بێ بەڵگە خەڵك چەواشە نەبێ و هەڵنەخەڵەتێ بە (دوور

---

[1] سەرچاوەی پێشوو-لا-٤٨

[2] سەرچاوەی پێشوو-لا-١٠٢

[3] سنورە قەدەغەکان مەشکێنن -دەقی گفتوگۆیەکە لەگەڵ مامۆستا عەلی باپیر د.حوسێن محمد عەزیز ئامادەی کردووە بەماوەك بە رلە دەستگیرکردنی لەلایەن ئەمریکیەکانەوە-چاپی دووەم -ساڵی ٢٠٠٤ ز-لا-٦٨

[4] جیهاد لەڕێ ی خوادا و چەند سەرنج و ئاگاداری یەك -چاپی دووەم -ساڵی ١٩٩٨ ز-لا -٦٧

◆ وَلَيَعْلَمَنَّ اللهُ الَّذِينَ آمَنُوا وَلَيَعْلَمَنَّ الْمُنَافِقِينَ/العنكبوت:١١

کوڕێکی نزیك خەسار )،بە (ڕواڵەت جوانێکی نێوەڕۆك وێران ) هەڵنەخەڵەتێ چونکە دوایی زەرەر بەدینی خوا دەگا ![1]

********************************

٨٧٧.پیاوان پێش ئەوەی بیرلە ڕیش هێشتنەوە، وە بەرسمێڵ کردن و لە هەندێ شتی دیکەی لەو جۆرە بکەنەوە، دەبێ بیر لەوە بکەنەوە داخۆ چەند لەدین تێگەیشتوون ئیمانیان چەندە و عەقیدەیان چۆنە عیبادەتیان چۆنە و ئەخلاقیان چۆنەو ئەدەبیان چۆنە؟! ئینجا دوایی نۆرە دەگاتە سەر سیما و ئەو شتانەی دیکە کە لەڕاستی دا زیاتر وەك دیکۆر و ڕواڵەت وان ![2]

********************************

٨٧٨.کاتێك تێروانینی خەڵك دەربارەی دین گۆڕا، هەڵوێست و کردەوە و تەسەڕوفیشی دەگۆڕێ ![3]

********************************

٨٧٩.هەمیشە دەبێت چالاکیی سەربازیی لە خزمەتی ئامانجی سیاسیدا بێت![4]

********************************

٨٨٠.ئەگەر مرۆڤایەتی گاگەل بێت، ئەمریکا گاوانێکی باشە ![5]

********************************

٨٨١.دەبێ (چەك) سوپەرو وقەڵغانی سەر سەری هەق بێ ئەگەرنا چەکداری دەبێتە "چەتەیی"و شۆڕشیش دەبێتە "شەوەڕەش" ![6]

********************************



[1] تاقی کردنەوەی خوا بۆ جلَّ جلاله بۆ بەندەکانی چی یەو چۆنە؟!-چاپی یەکەم-ساڵی ٢٠٠٣ ز-لا -٤٠

[2] سەرچاوەی پێشوو-لا-٢٩

[3] سەرچاوەی پێشوو-لا-٣٥

[4] ئەشکەنجەو زیندان -پێشمەرگەیەك بیست و دوومانگ لە زیندانی داگیرکەردا -چاپی یەکەم -ساڵی-٢٠٠٦ز-لا-٤٦

[5] سەرچاوەی پێشوو-لا-٣٥٥

[6] گۆڤاری ئەزموون ژمارە (٣)لا-١٩

٨٨٢.سیاسەت ئەگەر ئیمان و ئەخلاق ئاراستەی بکات مشورخواردنی کارو باری خەڵکە، ئەگەرنا فرو فێڵ و چاوبەستی یە ![1]

********************************

٨٨٣.باکەس خەیاڵ و پلاو نەکات و بەبێ ئامادەیی و شایستەیی لافی (اجتهاد) لێ نەدات، بە بیانوی ئەوەی کە (اجیهاد) چاکترە لە (تقلید) چونکە (اجتهاد) باشترە بەلآم بۆ ئەهلی خۆی نەك بۆ هەرکەسێك کەیفی لێی بوو چونکە ئەو کاتە بە (مُشْتَهِيْ) دادەنرێ نەك (مُجْتَهِدْ)![2]

********************************

٨٨٤.جێگرەوەی راوێژپێکەوە کردن و پێکەوە مشوور خواردن و تەگبیرکردن جگە لە تاکڕەویی و خۆفە فەرزکردن چی دیکە نییە، بێگومان تاکڕەویی و خۆفەرزکردن و حیساب بۆ خەڵك نەکردنیش ماك و میکرۆبی زۆربەی نەهامەتی و گرفت و کێشەکانی هەر کۆڕ و کۆمەڵێکە ![3]

********************************

٨٨٥.ئەوەندە بەسە بۆ شەرەفی کتێب، کە خوا (جل شأنه) کەلامی خۆی خستۆتە دووتوێی کتێبەوە ![4]

********************************

٨٨٦.هەروەکو چۆن دیوارێك کە لەسەر بناغەیەك بنیات دەنرێ هەرکاتێك بناغەکە نەما دیوارەکەش هەرەس دێنێت، هەرکارێکی مەرجداریش بەنەمانی مەرجەکەی شەرعیەتی نامێنێ![5]

********************************

٨٨٧.هەر کارێکی شەرعی بۆیە ئەنجام دەدرێت ئامانج و مەبەستی شەرعیی بچەسپێنێ و بهێنێتە دی، بۆیە هەرکارێکی شەرعیی ئامانجە شەرعییەکەی و ئەو مەبەست و ئامانجەی کە پێویستە بیهێنێتەدی فەوتاو نەهاتەدی، ئەو کارە شەرعییە خودی بوونەکەی دەکەوێتە ژێر پرسیارەوە کە

---

[1] سەرچاوەی پێشوو–لا–٢٠

[2] مسوڵمانی کامڵ–بەشی دووەم–بەرگی یەکەم–چاپی یەکەم–ساڵی ٢٠٠٠ ز–لا ١٦٩

[3] رۆژنامەی کۆمەڵ ژمارە ١٨٦–لا–٥– بابەتی چۆن کۆنگرەیەکی سەرکەوتوو دەبەستین؟!

[4] رۆژنامەی کۆمەڵ–ژمارە ٣٠٦–لا–٨

[5] زنجیرەی بنەما شەرعی یەکانی کۆمەڵی ئیسلامی–ئەڵقەی یەکەم–بەڵگە شەرعی یەکانی کۆمەڵی ئیسلامی–چاپی یەکەم–ساڵی ٢٠٠١ز–لا–١٣

بۆچی ئەنجام دەدرێت، قەڵەمێك كە نانوسێ بۆچی ئینسان بە بەرۆکی خۆیدا دەکات مادام کە نانوسێ ؟!وە هەروەها مسوڵمانێك كەهیچ فرمانێکی خوا جێبەجێ ناکا بۆ ناوی مسوڵمان بێ، قووتابیەك کەهیچ ناخوێنێ و کۆشش و ئامادەکاریی ناکات، بۆ پێی بگوترێ قوتابی؟! مامۆستایەك كەنازانێ هیچ فێری قوتابی یەکانی بکات بۆ پێی بگوترێ مامۆستا ؟! ئەوانە هەموو دەبنە ناوی بێ نێوە ڕۆك ![1]

******************************

٨٨٨.عاقڵ ئەو كەسەیە كەتەنها عەقڵی خۆی بە ڕاست نازانێ![2]

******************************

٨٨٩.جیاوازی نێوان هەق و ناهەق (الحق والباطل) ئەوەیە کەهەق بەڵگەدارەو ناهەق بێ بەڵگە و بێ پشتیوانە، وە لە ڕاستی دا هەرکەسێك دەعوایەکی ڕاستی هەبێ دیارە بەڵگە و دەلیلی ئیسپاتی ئەو دەعوایەی پێ یەو، بابای درۆز نیش قسەو دەعوای پووچ و بێ بەڵگەیەی پێیە ![3]

******************************

٨٩٠.ئاوێنەی تاڵ و تۆز و خۆڵ لەسەر نیشتوودا هەر وێنە و دیمەنی تاڵ و نامۆ دێتە بەرچاو ![4]

******************************

٨٩١.خەڵكێك هەیە هیچ شتێکی پێوە نەماوە نە ئیمان و عەقیدە، نە هەڵسوکەوت و ڕەوشتی بەرزو پەسەندی ئیسلامیی، نە هیچ ، بەڵام تەماشا دەکەین زۆر دواکەوتوو بەجێماوە و، هیچی بەسەر هیچەوە نیە، باسی دیموکراسی دەکات بەڵام دیکتاتۆرە و، باسی مافی مرۆڤ دەکات بەڵام غەیری خۆی وەك ئاژەڵ تەماشا دەکات! ئاشکراشە ئینسان تەنیا بەدروشم نابێ بە هیچ ![5]

******************************

٨٩٢.هەروەك چۆن جوانیی و ڕێك و پێكی ئینسان چەندە لەسەر و گەردن و بەژن و باڵاو دەست و لاق و شان و پیل و چاوی دایە، هێندەش لە پرچ و نینۆك و برژانگ و برۆ و پەنجەو لێوانی دایە،

---

[1] سەرچاوەی پێشوو لا-١٦

[2] سەرچاوەی پێشوو لا-٢٣

[3] ئیسلام و کێشە هەنووکەیی یەکان-چاپی یەکەم-سالی ١٩٩٨ ز-لا-٦

[4] سەرچاوەی پێشوو لا-٩

[5] سەرچاوەی پێشوو لا-٣٧

جوانی و رێك و پێکی ئیسلامیش چەندە لەئەرك و فەرمانە فەرز و بنەڕەتی یەکانی دایە، هێندەش لەو سوننەت و وردە بابەتە جۆراو جۆرانەدایە کە رێکخەر و تەواوکەری ئەرك و فەرمانە سەرەکی و بنەڕەتی یەکانن، بەڵام دەبێ وریا بین و لەڕووی جێ بەجێ کردن و گرنگی و بایەخ پێدانەوە حەکیمانە لەگەڵ فەرز و سوننەتەکان دا مامەڵە بکەین و هیچ کات سوننەت پێش فەرز نەخەین و لەبەر جێبەجێ کردنی سوننەتێك شتێکی فەرز و گەورە فەرامۆش نەکەین! [١]

********************************

٨٩٣.پێموانییە مرۆڤ بەلەبەرکردنی چاکەت و پانتۆڵ دەبێتە رۆشنبیر و بە بەرگی کوردی پاشدەکەوێ ، پیموایە پێشکەوتن و دواکەوتنی مرۆڤ پەیوەندی بەزهن و حاڵەتی فکر و تێگەیشتن و ناوەرۆکە، نەك بەمەزهەر و واقیع ! [٢]

********************************

٨٩٤.مادام حیکەمەت و هۆی دروست بوونی ئینسان هاتنە دی ئەم ژیانە دنیایی یە بریتی بێ لە ئاوەدانکردنەوەی زەوی و بەڕێوەبردنی حوکم و بەرنامەی خوا، مانای وایە هەموو دەمێ دیتنی دیاردەی ئاوەدانی و خێرو خۆشی و بەختەوەری لە ژیانی مرۆڤایەتی دا بەگشتی و لە یەك یەکی کۆمەڵگایەکانی سەر زەوی دا بەتایبەتی، بەڵگەو نیشانەی ساغ و سەلیمی مرۆڤایەتی و گەل و تیرەکانەو، بە پێچەوانەوەش دیترانی دیاردەی وێرانی و خراپەکاری و ژینتاڵی نیشانەو دروشمی نەساغی و نەخۆشی و لەگرێ ژەنە چوون و لەرێ دەرچوونیانە ! [٣]

********************************

٨٩٥. شەیتان وەك شەمشەمە کوێرە وایە و لەدڵ و دەروونی تاریك و تەڵەم و پرژەنگ و ژاردا نەبێ ناتوانێ مەداربکاو، هەردڵێك یادی خوای تێدا بێت، چاری ناچارە دەبێ لێی بگوازێتەوە و باربکات! [٤]



---

[١] سەرچاوەی پێشوو لا-١٦

[٢] گەردەلولی سیاسەت – ئامادەکردنی فوئاد صدیق –چاپی یەکەم –ساڵی ٢٠٠٦ ز–لا–٢٨٦

[٣] کوردستان بۆ وێران بوو چۆن ئاوەدان دەبێتەوە؟! چاپی یەکەم –ساڵی ١٩٨٩ز–لا–١٠–١١

[٤] یادی خوا –گرنگی یادی خوا لەژیانی ئیسان دا –چاپی یەکەم –ساڵی ١٩٨٧ ز لا–٨٠

٨٩٦.هیچ کاتێك عەقڵ لەگەڵ (وەحی) تێك ناکیرێن، وەك چۆن هەرگیز پێنج هەستەکان و عەقڵ بە یەکەوە تێك ناکیرێن، بەڵکو عەقڵ لەگەڵ سەربازەکانیشیدا کە پێنج هەستەکانن لە خزمەتی (وحی) دان و (وەحی) یش سەر پەرشتی عەقڵ و پێنج هەستەکان دەکات و ڕێنموونییان دەکات! [1]

*******************************

٨٩٧.عەقڵ و نەقڵی ڕاست و ساغ هەرگیز تێك ناگیرێن! [2]

*******************************

٨٩٨.ئەگەر (عەقڵ) بە حیکمەت ئیقناع دەبێ، (دڵ) یش بەئامۆژگاری (موعظة) ڕادەچڵەکێ و بێدار دەبێتەوە، هەر بۆیەش سەیر دەکەین کە ئەهلی دڵ و دەروون، ئەهلی عیرفان و تەزکیە زۆر سەوکەوت و تربوون لە ئەهلی عەقڵ و فەلسەفە، لەوەدا کە خەڵك هۆشیار و بێدار بکەنەوە و خەڵك لەسەر دەستیان بۆ لای خوا بگەڕێتەوە و هیدایەت بدرێ! [3]

*******************************

٨٩٩.عەقڵی ئینسان سنووردارە و سیفەتەکانی خواش بێ سنووردارن، بۆیە ئێمە هەرگیز ناتوانین دەرکیان بکەین.کە وابوو مەحاڵە ئینسان بتوانێ دەرکی ناو و سیفەتەکانی خوای بەرزو مەزن بکات، کەواتە دەبێ چۆن خوای زانا و کاربەجێ بۆ خۆی ئەو ناو و سیفەتانەی بەکارهێناون و، ئێمەش ئاوا بەکاریان بێنین، بەڵام بێ هیواو نائومێد بین لەوەی کە بتوانین بزانین ناو و سیفەتەکانی خوای پەروەردگار حەقیقەتیان چۆنە! [4]

*******************************

٩٠٠."عەقڵ" بناغە و تەرازووی وەرگرتن و لێتێگەیشتنی وەحی و (نقل)ەو هەرگیز وەحی ڕاست و عەقڵی ساغ تێك ناگیرێن! [5]

*******************************

---

[1] زنجیرە دەرسی ئیمان و عەقیدەی ئیسلامی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننە تدا /بەرگی دووەم/ خوا بەیەکگرتن لە بەدیهێنرابەتیو پەروەردگاریتی دا–چاپی یەکەم –ساڵی ٢٠٠٧ز–لا–١٤

[2] سەرچاوەی پێشوو لا–١٢٢

[3] سەرچاوەی پێشوو لا–٣١٠

[4] زنجیرە دەرسی ئیمان عەقیدەی ئیسلامی لەبەر ڕۆشنایی قورئان وسوننەت دا /بەرگی سێیەم /خوا بە یەکگرتن لەناوو سیفەت و لەپەرستراویتی دا–چاپی یەکەم –ساڵی ٢٠٠٧ز–لا–١٣٧

[5] تەوژمی ئیسلامیی و عەلمانیی خاڵە هاوبەش و جیاوازەکانیان –چاپی یەکەم–٢٠٠٨ ز –لا –١٢٢

٩٠١.عەقڵ بۆ نەقڵ، دەوری بناغە دەبینێ بۆ دیوار و هەتا، عەقڵ نەبێ وەحی و نەقڵ سوودیان لێ وەرناگیرێ ![١]

******************************

٩٠٢.ئسلام واقع بینانە و وردبینانە سەیری عەقڵی کردووە نەك عاتیفییانە، بۆیە وەك عەلمانییەت بە تەنیا جێی نەهێشتووە و وێڵی نەکردووە، بەڵکو وێرایی دەست کردنەوە و ئازادکردنی و هاندانیشی کە هەرچی لە دەستی دێ لە پەیبردن بەنهێنی و ڕازەکان دریغی نەکات، لە ڕێی وەحی یەوە هاوکاریشی کردووە و هەم بە ئەو دیوسروشت (میتافیزیك —ماوراء الطبیعة) ئاشنای کردووە، هەم لە هەموو ئەو بوارانەدا کە برِناکات و توانای نیە، ڕێنمایی کردووە و سەر ڕاستی کردووە ![٢]

******************************

٩٠٣.هەق و ڕاستی لە خۆدا کورت هەڵهێنان و لە هەموو شتێك دا خۆپێ ڕاست و بەرانبەر پێ هەڵە بوون، گەورەترین کۆسپ و ئاستەنگی عەقڵی خۆ دەوڵەمەند کردنە بە عەقڵ و ئەزموونی خەڵکی ![٣]

******************************

٩٠٤.بە بیستن هەواڵ وەردەگیرێ و، بەدیتن ئەزموون ئەنجام دەدرێ و، بەعەقڵیش ئەنجام گیریی دەکرێ ![٤]

******************************

٩٠٥.دەگونجێ بیرکردنەوە (تفکر) بەبێ دڵ ئەنجام بدرێ، بەڵام یاد کردن (تذکر) بەبێ عەقڵ ناکرێ، چونکە دڵ کە چەق (مرکز)ی هەست و نەست و عاتیفەیە بەعەقڵەوە پەیوەستە و بەبێ ئەو هیچی بۆ ناکرێ، بەڵام عەقڵ بەسەر دڵ دا حاکمەو دەتوانێ بەبێ ئەویش کاری خۆی بکات ![٥]◆

---

[١] سەرچاوەی پێشوو-لا-١٢٥

[٢] سەرچاوەی پێشوو-لا-١٢٨-١٢٩

[٣] سەرچاوەی پێشوو-لا-١٣٩

[٤] سەرچاوەی پێشوو-لا-١٣٩

[٥] پرۆژەی بەرنامەی فکریی کاری ئیسلامیی- چاپی یەکەم -ساڵی ١٩٩٦ ز-لا -٤٦

◆ دیارە (ذکر) یش لەدڵەوە هەڵدەقوڵێ و عەقڵ و زمان یارمەتی دەدەن یان نادەن و هەتا هاوکاریی ئەوان زیاترو چاکتربێ و لەدڵیشەوە بەجۆشتر هەڵقوڵیبێ زیکرە کە تەواوتر دەبێ، بەڵام (فکر)هیچ پەکی لەسەر دڵ و زمان نە کەوتوەو بە تەنها کاری خۆی هەڵدەسوڕێنێ!

٩٠٦.بێگومان خەڵکی ڕۆژئاوا بە عەقڵ پێشکەوتن نەك بەبێ عەقڵی، بە هۆشەوە پێشکەوتن نەك بەبێ هۆشی ![1]

******************************

٩٠٧.هەرشتێك واقیعی و عەقڵی بوو ئەگەر بەڵگەی شەرعیشی لەسەر نەهێنینەوە زیانی نیە، چونکە هەرشتێك کە واقیعی بوو لەواقیع دا هەبوو، وە عەقڵ پێویستی کرد پێویستی بە بەڵگەی شەرعی ناکات ![2]

******************************

٩٠٨.عاقڵ ئەو کەسەیە عەقڵی خەڵك و عیلمی خەڵك دێنێتە گەڵ عەقڵ و زانیاری یەکانی خۆی و خۆی پێ دەوڵەمەند دەکا ![3]

******************************

٩٠٩.دڵ و دەروونێك کە عەقڵێکی ڕۆشنی نەبێ بەهەڵەدا دەچێ ![4]

******************************

٩١٠.ئەگەر خەڵك بەعەقڵ تێنەگا، نازانێ بەدڵ چی خۆش بوێ و ڕقی لەچی بێ ، چی قبووڵ بکا و چی ڕەفز بکا ![5]

******************************



[1] زنجیرەی بابەتە هەنوکەییەکان ئەڵقەی یەکەم -گەنجەکانمان لەنێوان ڕەسەنایەتی و لاسایی کردنەوەدا- چاپی یەکەم -ساڵی ٢٠٠٦ ز ل-٥٨

[2] زنجیرە بابەتە هەنوکەییەکان ئەڵقەی چوارەم -چۆنیەتی بوونە پێشەنگ و بنیاتنانی بنکەی جەماوەریی- چاپییەکەم -ساڵی ٢٠٠٧ ز-ل-١٦

[3] زنجیرەی بابەتە هەنووکەییەکان ( ئەڵقەی شەشەم) چەند بنەمایەکی گرنگی وتاربێژی -چاپی یەکەم - ساڵی ١٩٩٧ ز-ل -٥١

[4] سەرچاوەی پێشوو-ل-٦٠

[5] سەرچاوەی پێشوو-ل-٦١

# چەند بابەتێکی تر

ئەوەی لەم بەشەدا هاتووە کۆمەڵێك بابەتی تاڕادەیەك دوور درێژە، بەڵام لێوان لێوە لە داڕشتنی ووشەکاری و دەربڕینی جوان و بەهێز .

# تێڕوانین و بیرکردنەوەی مرۆڤی بڕوادار دەربارەی ژیانی دونیاو دوارۆژ

ئەم کۆشکە ڕازاوە و ڕێك و پێك و پڕ وردەکارییە کە پێی دەگوترێ بونەوەر (کون) دروست کراوی بەدیهێنەرێکە کە بۆ مەبەست و ئامانجێکی دیاریکرا و هێناو یەتە دی و بەردەوام سەر پەرشتی دەکات، ئەو بەدیهێنەرە باڵادەست و کار بەجێ یە لە سۆنگەی ئەوەوە کە سەرچاوەی بوونە، هیچ جۆرە پێویستی یەکی بە ئێمە نیە، بەڵکو ئەو بۆ مەبەستی تەواو کردن و کامڵ بوون و بەرەو زوو چوون ئێمەی خوڵقاندووە .

کەواتە: بەدیهێنەرێکی ئاوا ئەو پەڕی بەخشندەیی و چاکەو بەزەیی لەگەڵ مەدا نواندوە، کە لەسەرچاوەی بوون (وجود) بەشی داوین و لە تاریکستانی نەبوون (عدم) دەری هێناوین.

بەڵێ ئەو ئێمەی بە مەبەستی ژیان و کامڵ بوون و خۆ تەواو کردن هێناوەتەدی و، ئەو هۆو ئامرازانەشی پێ بەخشیون کە سەرمان تێیان دەوەستێ لە ڕێی بەرەو خواچوون و کامڵ بوونماندا.

وە ئێمە کە دووچاری دەردە سەری گیرو گرفت دەبین، یان لە سۆنگەی ئەوەوەیە کە بەیاساو دەستوورەکانی بوونەوەر شارەزانین، یان لە بەر ئەوەیە کە بەقەستی بەپێی ئەو یاسایانە بەڕێوە ناچین.

بوونی ئێمە بوونێکی هەمیشەییە و زنجیرە قۆناغێکن بەدوای یەکدا دێن وە ژیانی ئێمە بە مردن کۆتایی پێ نایەت و زنجیری تەمەنمان بە چوونە نێو گۆڕ ناپچڕێ .

لەڕاستی دا مردن بریتیە لە کۆچ کردن و گواستنەوە لەم دنیا تەسك و کەمبەرەوە بۆ جیهانێکی تەواو ترو بەرین تر، کە ئەم ژیانە دنیایی یەمان لە چاو ژیانی وێ، وەك ژیانی نێو منداڵ دان (رحم) وایە لە چاو دنیادا.

هەرچەندە ئێمە زانیاریەکی بەر بڵاو بێ سنوورمان نیە، لە هەموو نهێنی یەکانی بوونەوەر شارەزانین، بەڵام ئەوەندە هەیە، دەزانین کەهەتا زانیاری و شارەزایی مان پێهەڵاتر بچێ، پتر رووی گەشاوەی ڕێك و پێکی و وردەکاری بوونەوەرمان لە بەرچاو دەدرەوشێتەوە.

کەواتە: هیچ بەڵگەیەك لەسەر ئەوە نیە کەبەدیهێنەری بوونەوەر کەمترین نارێکی و بێ یاسایی تێکەڵ بەکارەکەی بووە، یان کەمترین بێ دادی لەگەڵ دروست کراوەکانی دا کردوە .

بوونی ئێمە لە ئاقار بوونی خوادا بریتیە لە هیچ (صفر)، بەڵام بەمەستی وەنزیك خستن لە بیرو زەینی هەندێك کەس، دەڵێین: ئەو تۆزە ئاوەی باڵندەیەك بەدەنووکی هەڵی دەگرێ و لە بەرزی

یەکی هەرەبەرزەوە فرێی دەداتە نێو ئاوی زەریا (ئوقیانووسێ )ێکەوە، سەبارەت بە ئاوی زەریاکە چەندە، ئێمەش سەبارەت بەخودای بێ وێنە هەر هێندەین.

کەواتە: خوای بەرز و زانا ئێمەی بۆ خزمەت و بەرژەوەندی خۆی نەخولقاندووە، چونکە ئێمە هیچ نین تا ئەو سەری تێمان بوەستێ، بەڵکو ئەو هەر لەبەر بەختیاری خۆمان خولقاندووینی وە ئەو بەرنامەیەش کە بۆی ناردووین، بە بەڕێوەبرانی لەلایەن ئێمەوە هیچ سوود و قازانجێکی پێ ناگات – پاکی بۆوی– بەڵکو بۆیە ئەو بەرنامەیەی بۆ ڕەوانەکردوین تاکو بەدادگەرانە بژین و بتوانین ئەرکی جێ نشینایەتی بەڕێوە بەرین و بەختیار و سەربەرزی ئەم دونیاو ئەو دنیابین.[1]



[1] یادی خوا گرنگی یادی خوا لەژیانی ئینساندا –چاپی یەکەم سالی ١٩٨٧ ز لا–٩٦–٩٧–٩٨

## تێڕوانین و بیرکردنەوەی مرۆڤی بێ بڕوا- سەبارەت بەژیانی دونیاو ژیانی دوارۆژ

بـوونی ئێمـه لـه هـەردووك لای ڕابـردو و داهـاتووه وه پەیوەسـته بـه نـەبوون و خامۆشـیەکی سامناکەوه، بەر لەهاتنمان بۆ سەر ئەم شانۆی ئەم ژیانە دنیایی یە بێجگە لـه ئەندازەیـەك ماددەو توخمی پرژو بڵاو چیدی نەبووین، له داهاتووش دا چاره نووسمان لـەحاڵی پـێش دروست بوونمـان چاکتر نابێ!

چونکه دوای مردنێ کەسایەتی پێکهاتوومـان لـه مێشکی بەکار و بـیری ڕوونـاك و هەسـتی بـەرز و سۆزی گەرم و گۆشتی نەرم و جەستەی ڕێك پێك و هـەزارەها ئـاوات و خولیـایی بـەرز بـەرز، وەك کۆلکە زێڕینەیەکی نەخشێنراوو دڵفڕێن، یـان وەك بڵقـی سـەر ئـاوێ لـەنێو دەچـێ و لەگـەڵ خـاك و خۆڵدا ئاوێتەدەبێ و جارێکی دی چاومان بـەدنیایی ڕوونـی ژیـان، ناکـەوێ ڕێمـان لـه شـاری بـوون (وجود)ناکەوێ.

ئنجا پاش مردن چیمان پێ دەمێنێتەوه، بێجگە لەچەند مستە گڵ و گازێکی پرژو بڵاو !

بەڕاستی ئێمـه لـەئاقار دیـاردەی مـردن وەکـوو بازرگانێـك وایـن، کـه لەبـەر چـاوی خـۆی تێکـڕای سەرمایەکەی دەسووتێنن و دوایی خۆشی دەخەنە نێو ئاگرەکەوه ! بـێ ئـەوەی هیـچی لـه دەسـت بێ.

ڕاستیت دەوێ، هاتنی ئێمه بۆ ئەم ژیانە بارتەقەی ئەرك و ئازار و ئێش و ژانەکەی ناوەستێ، جارێ چەندان سافی به بەر بێ هێزی و نەزانی تامی ژیان ناچێژین. ئنجـا کـه زل دەبـین و پـێ دەگـەین، دەکەوینە نێو گێژاوی کار کردن و ماندوو بوون و ئێش و ژان و ڕۆزی وەدەست هێنان و خۆ ژیاندن و خێزان بەڕێوەبردن و هەست کـردن بـه بەرپرسـیاری و دەردەسـەری و نەخۆشـی و دەردەداری و هەرهێندە بەخۆ دەزانین، ئەوە پیری و بێ هێزی بەرۆکی گرتووین و کەنەفت بووین و ماڵ و خێـزان و کۆمەڵگا لێمان بێزار بوون و، خوا خوایانـه زوو بـچینه بـیری مردنـەوه و سـەر و دڵیـان بـەردەین، ئنجا هەرچەندە زانیاری و ئەزموون و پەندو فەلـسەفان زۆر کۆکردبێتـەوه و دارایـی وسـامانمان زۆر وەسەرێك نابێ، حەتمەن، حەتمەن، دێوەزمەی درێـوی مـردن لەچـەنکمانی دێنێتـه دەرێ و بـەرەو نەمانی یەکجاری ڕەوان دەکرێین و، لەنێو شەپۆلی بەتین و تاوی دەریایی تاریك و پڕمەترسـی بـوون (وجود)دا، وەك کولکـه دارێکـی بـێ ئەمیـەت بەسـەر قەڵبـەزی ڕووبـارێکی بێـڕەزا و بـێ ئامانـەوه، تاوێکی کەم لەبەر چاوان دێین و دەچین و، له ئاکام دا بـەرەو دەریـایی زەبـەلاحی نـەبوون (عـدم) دەچین و بێ سەرو شوێن دەبین!

وەك خەونێك كە بەخێرای بەسەر رووپەڕی زەینی منداڵێك دا ڕەت دەبێ !!

لە ڕاستی دا نازانین بۆچی هاتووینە ئێرە و لەبەرچی دەڕۆین !وە بۆکوێ دەڕۆین؟

نە لە هاتنمان دا پرسمان پێ کراوە ،وە نە لە ڕۆیشتنمان دا ڕاوێژمان پێ دەکرێ، نەخێر لەڕاستی دا سروشتی کەڕ و کوێر، هیچ ئامانج و مەبەستێکی نیە و، وەك منداڵێکی گێل و نەزان یاری یەکی نا ماقووڵی دەست پێ کردووە، هەر کە تەواو بووتێکی دەدات و دووبارە دەست پێ دەکاتەوە، قوڕ بەسەری و ماندوو بوون و دەردەسەری یەکەش بۆ ئێمەی مرۆڤی بەد بەخت و چارە ڕەش و سەر بەهەش و بێ بەشە !![2]



[1] یادی خوا گرنگی یادی خوا لەژیانی ئینساندا –چاپی یەکەم ساڵی ١٩٨٧ ز–ل–٩٤–٩٥–٩٦

# ده‌وڵه‌تی له‌ش [1]

(ئه‌گه‌ر ) له‌شی مرۆڤ وه ده‌وڵه‌تێك بچوێنین، خانه‌كانی دابنێین به‌تاكه‌كان(أفراد) ی گه‌ل و، كۆئه‌ندامی مێشك به‌سه‌رۆك و فه‌رمان ڕه‌واو مشور خۆر له قه‌ڵه‌م بده‌ین و، هه‌ركام له كۆئه‌ندامه‌كانی دیكه‌ش به وه‌زاره‌تێك له وه‌زاره‌ته‌كانی ده‌وڵه‌ت دابنێین ئه‌وا :

یه‌كه‌م: كۆئه‌ندامی سوڕی خوێن (جهاز الدوران) كه خۆراك و ئۆكسجین بۆ خانه و شانه برسی و تینووه‌كانی له‌ش ده‌بات و، پاشه‌ڕۆك زبڵی خۆراكه‌كه‌یان ده‌گێڕێته‌وه و ڕێو بانان خۆش ده‌كا و بژێو ده‌گه‌یێنیٚ، ئه‌وه وه‌ك وه‌زاره‌تی هاتوچۆ (مواصلات)وایه.

دووه‌م: كۆئه‌ندامی هه‌رس (جهاز الهضم) كه شیرینی و پرۆتین و چه‌وری و ئاوو خوێ و ڤیتامینه‌كان ده‌گه‌یه‌نێته ڕیخۆڵه‌كان و، به‌رماو و پاشه‌ڕۆك و فڕێ ده‌دات، ئه‌وه وه‌ك وه‌زاره‌تی بژێودان (تموين)وایه.

سێیه‌م: كۆئه‌ندامی هه‌ناسه‌دان (جهاز التنفس) یش كه گازه پێویستیه‌كان بۆ وێنه ئۆكسجین بۆ له‌ش دێنیٚ و گازی دووه‌م ئۆكسیدی كاربۆن له له‌ش داوێته ده‌ریٚ و خوێن پاك ده‌كاته‌وه، وه‌ك وه‌زاره‌تی ئابووری وایه، چونكه دێنیٚ و ده‌نێریٚ (يستورد و يصدر).

چواره‌م: كۆئه‌ندامی میزیش وه‌ك وه‌زاره‌تی نێوه‌خۆ (داخلی )وایه، چونكه ئه‌و شتانه‌ی كه گومان لێكراون له ڕێی میزه‌وه فڕێیان ده‌داته ده‌ریٚ و، پارێزگاری بارودۆخی نێوه‌وه‌ی له‌ش ده‌كات و هاوسه‌نگی تێدا دێنێته دی و نایه‌ڵیٚ بگۆڕیٚ، دیسان ئه‌و شلانه‌ی دێنه نێو له‌شه‌وه و ده‌ڕۆن ڕێكیان ده‌خات، بۆیه ده‌توانین بڵێین وه‌ك پاڵاوگه‌یه‌كی مه‌زنیش وایه.

پێنجه‌م: كۆئه‌ندامی ماسولكه و ئێسكیش وه‌ك وه‌زاره‌تی به‌رگری (وزارة الدفاع) وان چونكه له ده‌می پێویستیدا به‌رگری له‌جه‌سته ده‌كه‌ن و دیپارێزن .

---

[1] ئه‌م بابه‌ته – ده‌وڵه‌تی له‌ش– له‌به‌رگی دووه‌می زنجیره ده‌رسی ئیمان و عه‌قیده‌ی ئیسلامی / خوا به‌یه‌كگرتن له‌به‌دیهێنرایه‌تی و په‌روه‌ردگارێتی دا لا– ٢٦٤بۆ٢٩٦ دا هاتوه، به‌ڵام ئه‌وه‌ی ئه‌وكتێبه زیاتر شێوازی زانستیانه‌ی به‌سه‌ردا زاڵه له‌كاتی نوسینی دا وه‌ك ئه‌وه‌ی–له خواناسی ئایین ئیمان– دا نوسیویه‌تی كه‌زیاتر شێوازی وشه‌كاری تێیدا به‌رجه‌سته‌یه هه‌روه‌ها مامۆستا بۆ نوسینی ئه‌م بابه‌ته سودی له كتێبی (الصب محراب الأيمان )ج١ ص٢٥٢–٢٥٤ وه‌رگرتوه كه خۆیشی له هه‌ردوو سه‌رچاوه‌كه‌دا ئاماژه‌ی پێكردووه، هه‌روه‌ها ئێمه‌ش له‌به‌ر گرنگی و جوان داڕشتنه‌وه‌ی شێوه‌ی به‌كارهێنانی وشه‌كاری تێیدا هه‌ڵمان بژارد.

شەشەم: پێست و نینۆك و مووەکانیش کەنوێنەری دەرەوەی مرۆڤن وەك وەزارەتی دەرەوە(الوزرة الخارجية)وان.

حەوتەم: جەرگیش وەك نێوجەرگەی گومرکی گشتی (مرکز الجمارك العام) وایە، چونکە هەرچی لەرێی کۆئەندامی هەرسەوە دێتە نێو لەش بەوێدا تێدەپەڕێ، ئەویش چالاکانە هەڵدەستێ بەفرێدان و دەرکردنی ئەو شتانەی کە گومان لێکراون و هێنانە ژوورەوەی ئەو شتانەی کەجێی مەبەست و پێویستی نی .

هەشتەم: سپڵ (طحال) یش ئەوە گۆڕستانی سامناکی خڕۆکە سورەکانە، چونکە ئەو خڕۆکانە لە دوو مانگان پتر نازین، ئنجا پاش مردنیان بەتابوتێك ڕەوانەی گۆڕستانی (سپڵ) دەکرێن، ئنجا لە هەمووی سەرنج ڕاکێشتر ئەوەیە کە ئەو مردوو ناشتنەی خڕۆکە سوورەکان وەکو عادەتی موسڵمانان وایە، چونکە وەك نامسوڵمانەکان تابوت لەگەڵ مردوو نا نێژرێ! بەڵێ دوای نێژرانی تەرمی هەر خڕۆکەیەکی سوور، گەردێکی ئاسن — کە وەکو تابووت بووە بۆی — دەگەڕێتەوە، بۆ ئەوەی لەش لە دروستکردنی خڕۆکەیەکی دیکە دا سوودی لێ وەربگرێ!

نۆیەم: کۆئەندامی دەنگ( الجهاز الصوتي ) یش لە نێو پەنچك و صندوقی دەنگ و ژێیەکانی و قورگ و زار و زمان و لێو لووت و هتد. وەك وەزارەتی ڕاگەیاندن ( وزارة الاعلام ) هەواڵنێری دەنگوباس وایە.

دەیەم: لووە ئارەقرژێنەکان وەك وەزارەتی گەشت و هاوینەهەوار (السياحة والاصطياف) وان، چونکە لە دەمی گەرمادا لەش سارد دەکەنەوە و لەدەمی سەرماشداگەرمی دادێنن.

یانزەیەم: مۆخ ( نخاخ) ی نێو ئێسکەکانیش زۆر وەك وەزارەتی پیشەسازی وایە چونکە خڕۆکە سوورەکان و خڕۆکە سپییەکان و گەلێك شتی دیکەش لەوێدا دروست دەکرێن .

دوانزەیەم: پێنج هەستە کانیش ئەوە یاریدەدەری وەزارەتی دەرەوەن .

وەك دیتمان دەوڵەتی لەشی ئینسان تێکڕای ئەو وەزارەت و دامو دەزگایانەی تێدا بوون کەبۆ پێکهاتنی دەوڵەت پێویستن، بەڵام جێی سەرسوڕمان ئەوەیە کە وەزارەتێك کە لەهەموو وەزارەتەکان گرنگتر و بایەخدارترە، لەنێو دەوڵەتی لەشدا هیچ شوێنێکی تەرخان و دیاریکراوی نەبوو، کە بریتییە لە وەزارەتی ئەوقاف، باشەدەبێ بۆچی وەزارەتی ئەو قاف و کاروباری ئایینی (وزارة الاوقاف والشؤون الدينية ) لە نێو دەوڵەتی لەشدا جێیەکی تایبەتی و دیاریکراوی نەبێ ؟!!

لەوەلامدا دەڵێین:

لەسۆنگەی ئەوەوە کە هەموو پێکهێنەرەکانی لەش لەخوێن و لمف و ڕەگ و دەمار و ئێسک و پێست و ماسوولکەو موو جومگەو ...هتد بەپێی ئەو بەرنامەیە بەڕێوە دەچن کە خوای بەدیهێنەر بۆی دیاری کردوون، پێویست ناکات شوێنێکی تایبەتی و سنووردار بۆ کاروباری ئایین و خواپەرستی دیاری بکرێ، کەواتە ئەو نەفانەی دەڵێن: پێویستە کارو باری ئایینی لە چوار چێوەی مزگەوت و ئەوقاف دەرنەچێ و لەو جوغزە تەسکەدا کورت هەڵبێ و، هەموو دامودەزگاکانی دەوڵەت بەپێی پەیڕەوێکی دیکە - غەیری بەرنامەی خوا- بەڕێوە ببرێن، ئەوە قسەیەك دەکەن کە لەگەڵ سروشتی ئینسان و واقیعی ژیان دا ناگونجێ و، ئەو جۆرە کەسانەش لەدوو خاڵان بەدەرنین، یان گێل و نەفامن و سروشتی بەرنامەی خوایان نەناسیوە، یان شەیتان و زۆر زانن و بەڵام بەشیری گوانی ئیمپریالیزم فرچك دراون و کوفر دەروونیانی کریوە ! !

بەڵێ خوێنەری بەڕێز! سەر لەبەری جەستە بەخانە و شانەو ئەندام و کۆ ئەندامەکانیەوە سەرگەرمی گەردن کەچی و خواپەرستییەو، هەر بەشێکی لە بواری خۆیدا خەریکی نوێژکردن و خواپەرستییە و هەموویان بەزمانی حاڵ دەڵێن( أَأَرْبَابٌ مُتَفَرِّقُونَ خَيْرٌ أَمْ اللهُ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ )[1] یوسف ٣٩



[1] خواناسیی ئایین ئیمان -ڕاستییەکان ئیسلام دەدرەوشێنەوە ئەفسانەکانی ڕێچکان دەپووچێنەوە-چاپی یەکەم ساڵی ٢٠٠٠ زلا- ١٥٦ -١٥٧-١٥٨-١٥٩

# بەشێک لە پەیامی مامۆستا عەلی باپیر بۆ مامۆستایانی ئایینی

وەك قوتابییەکی گچکەی، زانا خواناس و ڕاستەقینە میراتگرەکانی پێغەمبەرﷺ بەشەرم و ئەدەبەوە ڕوو لە زانا دەمڕاستانی ئەم ڕۆژگارەی بەرنامەی خوا دەکەم و دەڵێم:◆

خوا لە هەموو لایەکمان ببورێ! هەڵخزان و بێ کارو نوستن هەتا گەنگێ! هەتا زووە بەدەم بانگی خواو پێغەمبەرەوە بچین و، لە خەوی قووڵ و درێژ خایەنی بێ ئاگایی و هەڵخزاوی بێدار بینەوەو، بێ ترس و بیم قۆڵی مەردایەتی و تێکۆشانی لێ هەڵکەین و، هەرچی پترو چاکتر گەلی لە ئیسلام بێ هەواڵمان وریا بکەینەوە و بە بەرنامەی خوا ئاشنای بکەین، بەشکم ئەوە خوایە کۆمەڵێکی وا دڵ و بیرڕوون و پارێزکار و بەجەرگ و تێکۆشەر برەخسێ، کە بگونجێ شۆڕشێکی ڕاستەقینەی خوا ناسانەی پێ بەرپابکەین، کە بتوانێ ڕەگ و ڕیشەی بێبڕوایی و هاوبەشپەرستی لە بنەوە بێنێ و، کوفر و ستەم و نەفامی و خراپە و بەد ڕەوشتی بەرە و زبڵدانی مێژوو ڕەپێچەك بداو نەمامی خواناسی و خوابە یەکگرتن لە جێ شوێنی درەختی زڕی بێبڕوای و هاوبەش پەرستیدا بچەقێنێ و، هێندەی ئارەق و خوێن لەبن بکات، کە یەك ڕۆژەی دوو ڕۆژە بێ و، هێندە نەبات لەجێی کوفر و ستەم و نەفامی و خراپە و بەد ڕەوشتی، بڕوا و دادگەری و زانیاری و چاکەو ڕەوشت بەرزی بەهەم بێنێ.

وەبا زۆر چاك بزانین کە ئەم شێوە ئیسلام ڕاگەیاندنەی ئێستا و ئەم باردۆخەی تێیدا دەژین، لە باتی ئەوەی بەڵگەی خوابێ لەسەر خەڵکی، بەراوەژووەوە بەڵگەی دەستی خەڵکییەو بەهانەی مسوڵمان نەبوون و بیانووی بەرەو حیزب و ڕێچکان چوونیانە، چونکە بابایەك کە لەم ڕۆژگارەدا دەژی و، بەم شێوازەی ئێستا ئیسلامی دەخرێتە بەرچاو، ئەگەر لە ڕۆژی دواییدا بچێتە بەر دادگای خوا، بۆی هەیە بە خوای پەروەردگاری زانا و میهرەبان بڵێ:

جا خوای پەروەردگاری خۆشەویست و بەرزم– وەك خۆت ئاگاداری — من کە لەبەرنامەی تۆ پشت پەل بووم و لە ڕاستە شەقامی تۆ لاڕێ بووم لە بەرئەوە نەبوو کە– پاکی بۆ تۆ– ڕقم لە تۆ بێ و دژایەتی ئایینەکەت بکەم، بەڵکو لەبەر ئەوە بوو کەمن بە شێوەیەك بەرنامەی تۆم لەلایەن

---

◆ ئەم پەیامانەی مامۆستا کە ئاڕاستەی زانایانی ئیسلامی کردوون بەشێکیان پەیوەندی بەکاتی هەشتاکانەوە هەیە وەك مامۆستا خۆیشی ئاماژەی پێداوە، بەڵام زۆرێکیشیان بۆ ئەم قۆناغەش گونجاون هەڵبەتە ئەبێ ئەوەش بڵێین ئێستا گۆڕانکاری ڕوویداوە بەڵام ئێستاش چەندین دیاردە دەبینین کە دوورە لە هەڵویستی پێشەوای ئیسلام و بەناوی ئیسلامیشەوە دەکرێت. ئامادەکار

میراتگرانی پێغەمبەرەکەتەوە دەخرایە بەرچاو، کە تۆش پێی قایل نی! من بۆیە براوام بە ئایین نەبوو، چونکە ئاوام دەدەی و دەبیست :

لە خزمەتی طاغووت و زۆردارە خوانەناس و دژ ئینسان و چەوسێنەرەکان دابوو و، ئەو مینبەرەی کە کاتی خۆی دەڵێن پێغەمبەر ﷺ هەقی لەسەر ڕادەگەیاند، کرابوو بە پاڵپشتی طاغووت و دووعای بۆ لەسەر دەکرا!!

بەماڵ و سامان وچەپڵە ئافەرین و خەڵات و زار چەورکردن و قورئان گوتەنی: بەرنرخێکی کەم(ثمنا قليلاً) دەفرۆشرا!!

بڕوای بەڕاپەڕین و جمو جۆڵ و شۆڕش و تێکۆشان نەبوو، دژی چەوسێنەر و داگیر کەرکەرانی بێبڕوا و جوولەکە و دیان، یان کلکی وان لەهەق لای دابوو!!

بڕوای بەوە نەبوو کە پێویستە دادگەری بچەسپێنرێ و دەبێ مرۆڤەکان وەك یەك و هەرکەسە بەپێی ڕەنجدان و بە ئەندازەی پێویستی خۆی لەزەوی و نیعمەتەکانی بەهرەمەند بێ، نەك خێرو بێرەکانی دنیا لەچەنگی دەستەیەکی تایبەتیدا کەڵە کەبن و خەڵکەکەی دیش قوڕەقوڕی زکیان بێ و، زەقە زەقی چاویان بێ!!

بڕوای بەزانیارییە سورشتیەکان نییە( العلوم الطبيعية) نەبوو، پاڵی دەدانە لای شەیتانی بەدو، هەر کەسێکی پێشیانەوە خەریك با پێی وابوو لە توخم و تۆوی شەیتانە و، یەکجار بەدو بێ ئیمانە!!

لە مەسەلەی قەزا و قەدەردا (القضاء والقدر) کۆت و زنجیرێکی زۆر بێڕەزای دروست کردبوو لە دەست و پێی خەڵکی کردبوو، بە جۆرێك کە هیچ کەس نەتوانێ بجوڵێ و بگرە هەر بڕواشی بەجوڵان و هەوڵ و کۆشش نەبوو چونکە دەیگوت :

هەر لە ئەزەلەوە خوا هەموو شتێکی بڕیوەتەوە و، چارەنوسی هەموو کەسێکی دیاری کردووە[1] و، هەڵپەڕین و داپەڕینی ئینسان بێ سوودە و هیچ لە واقیع ناگۆڕێ کەواتە کێ دەیەوێ لە ڕیزی خۆڕاگر و شوکرانە بژێران ( الصابرين والشاكرين) بژمێرێ، با بەواقیع ڕازی بێ و دەستکاری کاری خوا نەکات خوا لە خۆشی قەڵس نەکات!!

بەڵێ، ئەگەر بمانەوێ نەسەب و ڕەچەڵەکی میراتگرایەتی پێغەمبەر ﷺ بۆ خۆمان ئیسپات بکەین، پێویستە پێشەکی هەوڵ دەین لە تێکڕای بەرنامەی خوا – میراتی پێغەمبەر – حاڵی بین و خەڵکی

---

[1] دیارە ئەمە خۆی لە خۆیدا هەق و ڕەوایەو هەر وایە ، بەڵام شوێنی گلەیی نکوولی لێ کردنی ئێمە ئەنجامگیرییە کەی دواییەو ئەم مەسەلەیە عەلی کوڕی ئەبوتالیب گوتەنی (كلمة حق يراد بها باطل)

پێ ئاشنا بكەین، نەك فێڵ لە خۆمان و خەڵكی بكەین و خۆمان و خەڵكی بە بەشێكی بەرنامەی خوا – وەك پێنج دروشمەكان[1]– دوە سەرگەرم بكەین و، ئەوی دیكەی فەرامۆش بكەین، ئنجا پاش حاڵ بوون و تێگەیشتن و پەروەردەبوون و پێ گەیشتن، بچینە قۆناغی جۆرێكی دیكەی تێكۆشان و،.... ئاوا.... بەرە و پێش بچین و بەردەوام بین، هەتا یان بە شانازییەوە پلەی بڵندی شەهیدی دەستگیر دەكەین، یان شتێك بەشتێك دەكەین و لەگەڵ طاغووت و دژ خوایاندا لایەكی وەلایەكی دەخەین!!

بەڵێ با زۆر چاك بزانین كە پێغەمبەر (ﷺ) بەس نوێژ و ڕۆژ و زەكات و حەجی بەمیرات بۆ بەجێ نەهێشتوین، تا بەسەد بارەو هەزار بارەم كردنەوەی باسكردنی وان بتوانین ئەركی جێگرایەتی پێغەمبەر ئەنجام بدەین و، میراتەكەی بپارێزین بەڵكو پێغەمبەر (ﷺ) سەر لەبەری بەرنامەی خوای بەسەردا بەجێ هێشتوین و حەواڵەی كردووین، بەرنامەی خواش، هەم عیبادەتە هەم سیسەت، هەم تەقوایە هەم غەزا، هەم دواڕۆژە هەم دنیا، هەم ڕازی كردنی خوای دەوێ هەم ڕزگاركردنی خەڵكی و...هتد

جا خوایە بمانگێری بە زانایەك كە لەبەندایەتی تۆ، میراتگریەتی پیغەمبەر و دەمڕاستایەتی بەرنامەكەت و، خەمخۆرایەتی حیزبەكەت دەوەشێتەوە و، بەڵگەی تۆ و بەرنامەكەت دەبێ لەسەر خەڵكی، نەك بەڵگەی خەڵكی بێ لەسەر خۆت و بەرنامەكەت.... ئامین.[2]



[1] خۆزگە هەر پێنج درووشمەكانیش وەك پێویست ئەنجام درابان ،دیسان وەزعی دنیا زۆر دەگۆڕا !

[2] خواناسیی ئاین ئیمان –ڕاستییەكان ئیسلام دەدرەوشێنەوە ئەفسانەكانی ڕێچكان دەپووچێنەوە–چاپی یەكەم ساڵی ٢٠٠٠ ز–ل– ٢٠٣–٢٠٤–٢٠٥–٢٠٦

# سەوداو مامەڵە بەئایینەوە کردن

ئەو کەسەی دەزانێ ئایین و بەرنامەی خوا دژی طاغووتە و زۆر دارانە، بەڵام ڕۆژێك لە ڕۆژان نێوەچاوانی لە ئاقاریدا کرژ ناکات!

وە دەزانێ کە لەبەرنامەی خوادا کۆیلایەتی گەورەترین تاوانە، بەڵام هەتا کۆیلایەتی لەوێ بێ هیچ ناکات!

وە دەزانێ هەق نەبێژ شەیتانی لاڵە بەڵام، شتێك کە ناحەزانی خوا هێندەی گەردێك پێی قەڵس بن، خۆی لێ نادات!

وە دەزانێ کە فەرمانکردن بە چاکە و، ڕێگرتن لەخراپە فەرزە، بەڵام وەك مەڕی بەستەزمان هەرگیز خۆی شلوێ ناکات !

وە دەزانێ کە لادان و گۆڕین ( تحريف وتغيير) ی حوکم و یاساکانی بەرنامەی خوا بۆ ڕازی کردنی طاغووت، فرۆشتنی دینە بەدنیا و، گۆڕینەوەی خوایە بەخورما، بەڵام بابای طاغووتی خۆبە خوا زان نەك هەڕەشەو خۆڵی سورکردنەوە، هەر تۆزێك گەڕوویی شیرین بکاو، بەعاستەم زاری چەوربکاو، نرخێکی کەمی پیشان بدات، خۆی و ئایینی و نەتەوەی و خاك و ئاوی پێ دەفرۆشێ و، هەرسێ و دوویی لێ ناکات !

وە دەزانێ نزیك بونەوە لە حیزبی کافر و ڕێچکەی خوار و بابای زۆردار دەبێتە هۆی نێزیك کەوتنەوە لە ئاگری بڵێسەداری دۆزەخ ، بەڵام بۆ چەپڵە و ئافەرینێك و بۆبڕە موچە (معاش) و تۆزە ژینێك، ئامادەیە ببێتە بڵندگۆی طاغووت و بەدڵی وی فتوایان دەربکا و، مینبەر و میحرابی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ دووعاکردن بۆ طاغووت بە ئیجار بگرێ و، ئەو چۆنی بە دڵ بێ وابدوێ و وا ڕەفتار بکات!

بێگومان کەسێکی ئاوا با بەدرو خۆشی بڵێ ڕابەر و پێشەوای ئیسلام و میراتگرو جێنشینی پێغەمبەر (ﷺ) بە زمانی کردەوە و حاڵ دڵنە خۆشی و ئایین فرۆشی و بێ هۆش و گۆشی و سەودا و مامەڵە بەئایینەوە کردنی خۆێ خستۆتە ڕوو و سەلماندووە ![1]

---

[1] سەرچاوەی پێشوو لا-۲۲۷-۲۲۸

سروشت ئاوێنەی تەجەللای خوایە

چاك سەرنجی دە بزانە چی تیـــایە

لـــە ڕێی کرەوە کردگار دەناسرێ

ســـــروشت کرێکە کردەی (اللە)یـــە[1]◆

---

[1] سەرچاوەی پێشوو ل-٤٦٣

◆ ئەم شیعرەی مامۆستا لە کتێبی پرۆژەی بەرنامەی فکری کاریی ئیسلامی لاپەرە ٤٥ دا هاتووە تەنها دێری خوارەوەی گۆڕاوە کە بەمشێوەیە یە:

(بوونەوەر کرەو کردگاری خوایە).

هەر سەربارەت بەشیعر لە بەرهەمەکانی مامۆستا عەلی باپیر لەهەریەکە لە کتێبی مسوڵمانی کامڵ بەرگی یەکەم بیروباوەڕی مسوڵمان لەژێر سەرباسی (بەرکۆڵێك دەربارەی بیروەری لە دایك بوونی پێغەمبەر صلی اللە علیە والسلام) لە شێکدا بەشیعر وەڵامی هەندێك دەقی شیعری یەکێك لەو بەناو کتێبی مەولودانە دەداتەوە کەناسراوە (بەکتێبی پڵاوان) بۆ ئاشنابوونی زیاتر دەتوانی سەیری کتێبی ناوبراو بکەیت لە لاپەرە ١٣٨ بۆ لاپــەرە ١٥٨ هــەروەها لەبــەرگی پێنجــەمی ئیمــان و عەقیــدەی ئیسلامی (ئیمــان بــە ڕۆژی دوایــی، قــەزاو قەدەر )لاپەرە ٢٨٨ وەڵامی شیعرێکی خیام دەداتەوە، هەروەها مامۆستا عەلی باپیر لە دیمانەیەکی گۆڤاری (پەیامی ڕاستی) ژمارە (٧٦) سەبارەت بەسەرەتای دەست کردنی بەنوسین بەم شێوەیە دەدوێت

پەیامی ڕاستی:لـەوناو کـورددا زۆربـەی هـەرە زۆری ڕۆشنبیر و نوسـەران و ئـەهلی قەڵـەم سـەرەتا بەشـیعر دەستیان پێکردووە ، ئێستاش قسەیەکی باو هەیە دەڵێن ژمارەی شاعیران لەژمارەی خوێنەرانی شیعر لە کوردستان زیاترە ، تۆ لەگەڵ ئەدەب بەگشتی و شیعر بەتایبەتی بەینت چۆنە؟

مامۆستا عەلی باپیر :من لەسـەرتاوە شیعرم دەنوسی، لەیادمە لـە ساڵی ١٩٨٢ شیعرێکم نووسیبوو دامـە برایەك، بردی بۆ لای مامۆستا هەژار کە ئەو کاتە ئەو لە کەرەج دادەنیشت ، خوێندبوویـەوە هەڵبـەت هەندێ تێبینـی لەسـەر دەربڕیبوو، وتبووی ئـەوە هـی کێیـە ، ئـەوەی ئـەوەی نووسـیوە دەتوانێ خـەڵکی فێر بکات، مەبەستم ئەوەیە دەمتوانی شیعر بنوسم، هەندێك لە شیعرەکانیشم لە بۆنەکاندا کراون بەسرودیش لەناوچەی خۆمـان ، بـەڵام دوایـی وەکـو تەماشـام کـرد شـیعر وەختـی زۆری دەوێـت منـیش بەپەلـە دەمویـست خـەڵك تێبگەیێنم، بۆیە بە پێویستم زانی بە شێوازێکی دیکە فریابکەوم و خـەڵکیش لێی تێبگات ، بەهـەرحاڵ ئـەوە بوو وای کرد من بکەومە بواری نووسینی ئەو شێوازە کە دەیبینی ، ئیدی من وازم لـە شیعر هێنا ، ئەگـەرنا ئەو کاتە سەلیقەی شیعر نوسینم هەبوو، ئەگەر تەماشای شێوەی تە عبیرو دەربڕینەکانیشم بکەی لە نوسینە کاندا دەبینی جۆرێك لـە قافیە و وەزن و ئـەو شـتانەی پێوەیـە ، بـەڵام وەك وتم من دەمویست شتی زۆر بڵێم ئـەوەش بێگومـان لـە قاڵبی شیعر جێی نـەدەبۆوە، یاخود من ئـەو مەلەکە شیعریە بەهێزەم نـەبوو بتـوانم کـە هەرچـی دەمـەوێ بیڵـێم لـە قـاڵبی شـیعر دایبڕێـژم و بیگـەیێنم، ئـەوە وای کـرد کـە واز لـە نووسـینی شـیعر بهێنم .ئامادەکار

# ناوی بەرهەماکانی مامۆستا عەلی باپیر لە ( ١٩٨١ - ٢٠٠٨ )

١-(ڕێبازی تێكۆشان) یەكەم بەرهەمی مامۆستا عەلی باپیرە تا ئێستا دەست نووسەو چاپ نەكراوە ساڵی (١٩٨١ ) لەبەردەڕەش نوسیوەیەتی.

٢-پوختەیەك دەربارەی ئیسلام لەبەر ڕۆشنایی سوورەتی فاتیحەدا چاپی یەكەم ١٩٨٤-چاپی دووەم ٢٠٠٦

٣- دەبەرێك ڕاچوونی ئیسلام و ڕێچكان چاپی یەكەم ١٩٨٥-چاپی دووەم ١٩٨٨-چاپی سێیەم٢٠٠٦

٤-یادی خوا - گرنگی یادی خوا لە ژیانی ئینساندا -بەرگی یەكەم -چاپی یەكەم - ١٩٨٧

٥-پێشمەرگەی ئیسلام یان مسوڵمانی موجاهید كێ یەو چۆنە ؟! چاپی یەكەم-١٩٨٨-چاپی دووەم-١٩٩٦- چاپی سێیەم ١٩٩٨

٦. زنجیرەی باچاكتر ئیسلام بناسین (ئەڵقەی یەكەم )خوادا جلّ شأنە چاپی یەكەم ١٩٨٨ چاپی دووەم ١٩٩٠

٧-زنجیرەی باچاكتر ئیسلام بناسین (ئەڵقەی دووەم) پێغەمبەران علیە السلام چاپی یەكەم ١٩٨٨ چاپی دووەم ١٩٩٠

٨ زنجیرەی باچاكتر ئیسلام بناسین (ئەڵقەی سێیەم ) ڕۆژی دوایی چاپی یەكەم ١٩٨٨

٩-زنجیرەی باچاكتر ئیسلام بناسین (ئەڵقەی چوارەم ) قەزاو قەدەر چاپی یەكەم ١٩٨٨

زۆرێك لەبابەتەكانی ئەڵقەی یەكەم تاچوارەم خرانە نێو مسوڵمانی كامڵ بەشی یەكەم بیرو باوەری مسوڵمان و دواتر بۆ بەرگی شەشەمی ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی.

١٠- زنجیرەی باچاكتر ئیسلام بناسین (ئەڵقەی پێنجەم ) بروا چاپی یەكەم ١٩٨٨

١١- زنجیرەی باچاكتر ئیسلام بناسین (ئەڵقەی شەشەم ) ئایین چاپی یەكەم ١٩٨٨

تێبینی: ئەم ئەڵقەیە لەبری لە چاپدانەوەی خراوەتە نێو كتێبی (خواناسیی ئایین ئیمان)

١٢-زنجیرەی باچاكتر ئیسلام بناسین (ئەڵقەی حەوتەم) ئینسان ١٩٨٨

١٣- زنجیرەی باچاكتر ئیسلام بناسین (ئەڵقەی هەشتەم) ژیانی دنیا ١٩٨٨

١٤- زنجیرەی باچاكتر ئیسلام بناسین (ئەڵقەی نۆیەم ) كۆمەڵی خوا چاپی یەكەم ١٩٨٨

١٥- زنجیرەی باچاكتر ئیسلام بناسین (ئەڵقەی دەیەم ) سیاسەت ١٩٨٨

١٦-زنجیرەی باچاكتر ئیسلام بناسین (ئەڵقەی یانزەیەم ) دادگەری ١٩٨٨

تێبینی: هەریەکە لە ئەڵقەی ( حەوت و هەشت و دە و یانزە ) بەر لەوەی بەچاپ بگەیێندرێن لەرووداوەکانی کۆتایی لەساڵی ١٩٩٣ لەسوتانی ماڵی مامۆستادا ئەوانیش دیارنەمان و فەوتان.

١٧-سۆزی نەتەوایەتی و بیری ناسیۆنالیزم لەتەرازوی ئیسلام دا چاپی یەکەم ١٩٨٨ چاپی دووەم ١٩٩٨ چاپی سێیەم ٢٠٠٥

١٨-کوردستان بۆ وێران بوو چۆن ئاوەدان دەبێتەوە چاپی یەکەم ١٩٨٩

١٩-مەسەلەی کورد چی یەو چۆن و بەچی چارەسەر دەکرێت ؟ چاپی یەکەم ١٩٨٩

تێبینی ئەم نامیلکەیە لەبری چاپکردنەوەی خرایە نێو کتێبی (سۆزی نەتەوایەتی) یەوە

٢٠-دەردو دەرمانی بزوتنەوەی ئیسلامیی چاپی یەکەم ١٩٩٠

٢١-(دادگەری کۆمەڵایەتی) ئەم بەرهەمە ئەڵقەی پێنجەمە لەزنجیرەی دەبەرێك ڕاچوونی ئیسلام و ڕێچکان تا ئێستا دەست نووسەو بەچاپ نەگەیێندراوە ساڵی ١٩٩٠ نوسراوە

٢٢-حوکمی گەڕانەوە ژێر نیری طاغوت چاپی یەکەم ١٩٩٠ چاپی دووەم ٢٠٠٥

٢٣- زنجیرەی بوژاندنەوەی ئیسلام ئەڵقەی یەکەم - ڕێبازی پێغەمبەر کامەیە؟ چاپی یەکەم ١٩٨٩

تێبینی : ئەم نامیلکەیە لە جیاتی چاپکرانەوی بەشێکی زۆر خراوەتە نێو کتێبی مسوڵمانی کامل بەرگی یەکەم بیروباوەڕی مسوڵمان، هەروەها ئەم زنجیرەیە تەنها ئەم ئەڵقەیەی هەبووەو ئەڵقەی تری بەدوادا نەهاتووە.

٢٤-ڕێگای صالح بوون و بەرەو خوا چوون-تەزکیەی نەفس لەبەر ڕۆشنایی قوئان و سوننەتدا- چاپی یەکەم ١٩٩٠ چاپی دووەم ١٩٩٦ چاپی سێیەم ٢٠٠١ چاپی چوارەم ٢٠٠٥

٢٥ -مەسەلەی کورد و پێناسی حیزبی بەعس چاپی یەکەم ١٩٩٠

تێبینی: ئەم نامیلکەیە لەجیاتی چاپ کرانەوەی خرایە نێو کتێبی سۆزی نەتەوایەتی بیری ناسیۆنالیزم )

٢٦-چارەسەری کێشەی کورد لەنێوان ئیمان و پەرلەماندا چاپی یەکەم ١٩٩٢

٢٧-بزوتنەوەی ئیسلامیی و قۆناغیی نوێی چاپی یەکەم ١٩٩٤

٢٨-پڕۆژەی بەرنامەی فکری کاریی ئیسلامیی چاپی یەکەم ١٩٩٦

٢٩-مسوڵمانی کامڵ -بەرگی یەکەم-بیروباوەری مسوڵمان -چاپی یەکەم-١٩٩٧

تێبینی مسوڵمانی کامڵ بە هەرسێ بەرگەکەیەوە ئەڵقەی (دوانزەیە) لە زنجیرەی (باچاکتر ئیسلام بناسین).

٣٠-بزوتنەوەی ئیسلامیی و ئاسۆیەکی گەش و ڕوون -چاپی یەکەم-١٩٩٧

٣١-چەندرپێرۆوونی یەک بۆ ئیسلامیی یەکانی کوردستان -چاپی یەکەم -١٩٩٧

٣٢-ئیسلام و کێشە هەنوو کەییەکان-چاپی یەکەم-١٩٩٨

٣٣-جیهاد لە ڕێی خودا چەند سەرنج و ئاگادارییەک -چاپی یەکەم-١٩٩٨

٣٤-چۆن لە جیهاد بگەین -چاپی یەکەم -١٩٩٨

٣٥-تەزکیەو تەبایی و یەکڕیزیی و برایی -چاپی یەکەم-١٩٩٨

٣٦-مزگەوتەکانی کوردستان لە نێوان ئاوەدانکردنەوە و وێرانکردندا-چاپی یەکەم-١٩٩٩

٣٧-بنچینە گرنگەکانی هەڵس و کەوتی شەرعییانەو ژیرانە لەگەڵ وردە بابەتە خیلافییەکان-چاپی یەکەم -١٩٩٩

تێبینی ئەم نامیلکەیە لەجیاتی چاپ کرانەوەی خرایە نێو کتێبی مسوڵمانی کامڵ- بەشی دووەم بەگی یەکەم :خواپەرستیی مسوڵمان

٣٨- مسوڵمانی کامڵ-بەشی دووەم: بەرگی یەکەم -خواپەرستیی مسوڵمان -چاپی یەکەم-٢٠٠٠

٣٩-خواناسیی ئاین ئیمان ڕاستیەکانی ئیسلام دەدرەوشێنەوە ئەفسانەکانی ڕێچکان دەپووچێنەوە چاپی یەکەم-٢٠٠٠

تێبینی: ئەم کتێبە لە سەرەتادا ناوی (گەورەترین ڕاستی) بووە لە ساڵی ١٩٨٨ نوسراوە و دواتر بەهۆی سوتانی ماڵی مامۆستا لەکارەساتی ساڵی ١٩٩٣ بەشێکی زۆر لەم کتێبە فەوتارەوپاشان ئەو بەشانەی لەو کتێبانە ماونەتەوە چاپ کراوە بە ناوی -خواناسیی ئاین ئیمان.

٤٠-مسوڵمانی کامڵ بەشی دووەم خواپەرسیی مسوڵمان -بەرگی دووەم -چاپی یەکەم ٢٠٠١

٤١-بنەماشەرعی یەکان و هێڵە گشتی یەکانی کۆمەڵێکی ئیسلامیی ڕەسەن -چاپی یەکەم -٢٠٠١

٤٢-هەڵس و کەوت لەگەڵ خەڵکی دا و چەند ئامۆژگاری یەك بۆ ئەندام و موجاهیدانی کۆمەڵی ئیسلامیی -چاپی یەکەم- ٢٠٠١

٤٣-زنجیرەی بنەما شەرعی یەکانی کۆمەڵی ئسلامیی -ئەڵقەی یەکەم -بەڵگە شەرعی یەکانی بنیاتنانی کۆمەڵی ئیسلامیی -چاپی یەکەم-٢٠٠١

٤٤- زنجیرەی بنەما شەرعی یەکانی کۆمەڵی ئسلامیی- ئەڵقەی دووەم و سێیەم- حوکمی لادانی خەلیفەو کار بەدەستانی مسوڵمان لەکاتی لاریی و ستەمکاریدا -چاپی یەکەم٢٠٠١

٤٥- زنجیرەی بنەما شەرعی یەکانی کۆمەڵی ئسلامیی (ئەڵقەی چوارەم ) شێخ ئەبو بصیر و هەڵسەنگاندنێکی شەرعی یانەو ژیرانەی فەتوانامەکەی -چاپی یەکەم ٢٠٠١

٤٦-زانایانی ئیسلام کێن و چۆنن-چاپی یەکەم -٢٠٠١

٤٧-جیهاد لە ڕێی خوادا - بۆ ئەوەی بەهەڵە لە جیهاد تێنەگەین و لەسەر جەنگ کردنمان قەرزدار نەبینەوە -چاپی یەکەم -٢٠٠١

٤٨-گەڕانەوە لای خوا - بەرە و خوا وەرچەرخان و واز لە گوناح و سەرپێچی هێنان و گۆڕنکاری ریشەیی بەسەر خۆدا هێنان-چاپی یەکەم ٢٠٠١ چاپی دووەم ٢٠٠٢ چاپی سێیەم ٢٠٠٥

٤٩-شەهید کێ یە و چ پلە و پایەیەکی هەیە؟! چاپی یەکەم-٢٠٠٢

٥٠-جیهاد لە ڕێی خوا چی یەو ؟!بۆچی دەکرێ و ؟!چۆن دەکرێ و ؟! چەند قسەیەکی دڵسۆزانە بۆ حوکمڕانەکانی کوردستان-چاپی یەکەم -٢٠٠٢

٥١-چەند ڕێرووونی یەك بۆ خوشك و برایانمان لە هەندەران-چاپی یەکەم-٢٠٠٢

٥٢-کۆمەڵی ئیسلامیی ئامانج و هەڵوێستەکانی و چەند پرسیارو وەڵامێکی گرنگ لەبارەی ئیسلام و ئیسلامی یی‌کان-چاپی یەکەم٢٠٠٢

٥٣-تاقی کردنەوەی خوا بۆ بەندەکانی چی یەو چۆنە ؟!چاپی یەکەم ٢٠٠٣

٥٤-ئافرەتی مسوڵمانی کورد مافەشەرعییەکانی و ئەرکە گرنگەکانی -چاپی یەکەم ٢٠٠٣

٥٥-ئافرەت و خێزان لەسایەی شەریعەتدا بەرگی یەکەم -چاپی یەکەم ٢٠٠٣ چاپی دووەم ٢٠٠٥

٥٦-چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم سەنجێکی واقیعییانەو هەڵسەنگاندنێکی شەرعییانە -تیرۆرو تۆقاندن - سیکۆلاریزم- مافەکانی مرۆڤ- جیهانگیری - دیموکراسیی -چاپی یەکەم ٢٠٠١ چاپی دووەم ٢٠٠٢چاپی سێیەم ٢٠٠٤ چاپی چوارەم ٢٠٠٥ چاپی پێنجەم ٢٠٠٧

٥٧-کارو پرۆژەی ئیسلامیی مان -چاپی یەکەم-٢٠٠٦

٥٨-زنجیرەی بابەتە هەنووکەییەکان (ئەڵقەی یەکەم) گەنجەکانمان لەنێوان ڕەسەنایەتی لاسایی کردنەوەدا چاپیی یەکەم ٢٠٠٦ ز

٥٩ زنجیرەی بابەتە هەنووکەییەکان ( ئەڵقەی دووەم )باوریایین داڕوخانی ڕەوشت کۆمەڵگاکەمان بەرەو هەڵدێر دەبات -چاپی یەکەم ٢٠٠٢ چاپی دووەم ٢٠٠٤ چاپی سێیەم ٢٠٠٧

٦٠- زنجیرەی بابەتە هەنووکەییەکان ( ئەڵقەی سێیەم )بەدورخستنەوەی ئافرەت لە ئیسلام چ زیانێك دەکەین -چاپی یەکەم ساڵی ٢٠٠٧

٦١- زنجیرەی بابەتە هەنووکەییەکان ( ئەڵقەی چوارەم )چۆنیەتی بوونە پێشەنگ و بنیاتنانی بنکەی جەماوەری -چاپی یەکەم ساڵی ٢٠٠٧

٦٢. زنجیرەی بابەتە هەنووکەییەکان ( ئەڵقەی پێنجەم )سیاسەتی ئیسلامیی و چەند ڕونکردنەوەیەك -چاپی یەکەم ساڵی ٢٠٠٧

٦٣. زنجیرەی بابەتە هەنووکەییەکان ( ئەڵقەی شەشەم )چەند بنەمایەکی گرنگی وتار بێژیی -چاپی یەکەم ساڵی ٢٠٠٧

٦٤. زنجیرەی بابەتە هەنووکەییەکان ( ئەڵقەی حەوتەم )قوتابیانی زانیاری شەرعیی و چەند سەرنج و ڕێنماییەك -چاپی یەکەم ساڵی ٢٠٠٧

٦٥. زنجیرەی بابەتە هەنووکەییەکان ( ئەڵقەی هەشتەم ) خورەوشتی بەرزو پەسەند سەنگی مەحەکی مسوڵمانەتی یە -چاپی یەکەم ساڵی ٢٠٠٧

٦٦. زنجیرەی بابەتە هەنووکەییەکان ( ئەڵقەی نۆیەم) بانگەواز بۆلای خودا چی یەو چۆنەو بەکێ و بۆچی دەکرێ ؟چاپی یەکەم ساڵی ٢٠٠٧

٦٧. زنجیرەی بابەتە هەنووکەییەکان ( ئەڵقەی دەیەم )قوتابیان لەم هەلو مەرجەدا پێویستە چۆن بن و چی بکەن؟! چاپی یەکەم ٢٠٠٨

تێبینی: تائێستا ئەم زنجیرەیە بەردەوامە

٦٨. زنجیره دەرسیی ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی لە بەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا (بەرگی یەکەم) (ئیمان و عەقیدە ئیسلامیی چی یەو چۆنە؟!)چاپی یەکەم ٢٠٠٦

٦٩. زنجیره دەرسیی ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی لە بەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا (بەرگی دووەم) (خوا بەیەکگرتن لەبەدیهێنەرایەتی و پەروەردگاریێتی دا) .چاپی یەکەم ٢٠٠٧

٧٠. (زنجیره دەرسیی ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی لە بەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا) (بەرگی سێیەم) (خوا بەیەکگرتن لە ناو سیفەتەکان و لە پەرستراوێتی دا) .چاپی یەکەم ٢٠٠٧

٧١. زنجیره دەرسیی ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی لە بەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا (بەرگی چوارەم) (ئیمان بەفریشتەکان و کتێبەکان و پێغەمبەرانی خوا) چاپی یەکەم ٢٠٠٧

٧٢. زنجیره دەرسیی ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی لە بەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا (بەرگی پێنجەم ) (ئیمان بە ڕۆژی دوایی و قەزاو قەدەر) چاپی یەکەم ٢٠٠٨ ز

٧٣. زنجیره دەرسیی ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی لە بەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا (بەرگی شەشەم) (تایبەتمەندیی و دید و بۆچوونەکانی پەیڕەوانی ڕێبازی ڕاست) .چاپی یەکەم ٢٠٠٨ ز

٧٤. ئیسلام ومسوڵمانەتیی و کاری ئیسلامیی–چاپی یەکەم ٢٠٠٦ز

٧٥. تەوژمی ئیسلامیی و عەلمانی خاڵە هاوبەش و جیاوەزەکانیان –چاپی یەکەم ٢٠٠٨ ز

## ئەم بەرهەمانەش وەرگێردراونە سەر زمانی عەرەبی:

١– زانایانی ئیسلام کێن و چۆنن؟ (علماء الإسلام من هم وما هي صفاتهم؟)

٢– چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم (مسائل عصرية رائجة)

٣– ئەشکەنجە و زیندان (أمير وراء القضبان)

چاوپێکەوتنەکان (بە زمانی کوردی):

١- سنووره قەدەغەکان مەشکێنن! د. حسین محمد عزیز، چاپی یەکەم ٢٠٠٢ چاپی دووەم ٢٠٠٤

٢- ئەشکەنجە و زیندان، هاوژین عومەر، چاپی یەکەم ٢٠٠٥ چاپی دووەم ٢٠٠٦

٣- گەنج لە چەمکە هەنووکەییەکاندا، ناجیح حەمە فەرەج، چاپی یەکەم ٢٠٠٨

چاوپێکەوتنەکان (بە زمانی عەرەبی):

١- ضيف وحوار، قناة العربية، سعد السيلاوي، ٢٠٠٦

٢- لقاء خاص، قناة العالم، أيوب رضا، ٢٠٠٦

چاوەڕوانی ئەم بەرهەمانەش بن:

١. خوڕەوشتی ئیسلامیی.

٢. پوختەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه والسلام).

٣. چۆن باشتر لە کتێبی خوا بەهرەمەند دەبین؟!

٤. واقیعی هەرێمی کوردستان: دیدێکی ئیسلامیانە.

٥. ئافرەت و خێزان لە سایەی شەریعەتدا -بەرگی دووەم.

٦. زنجیرە دەرسیی تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز. ((زیاتر لە چەند بەرگێکە))

٧. چەند بابەتێکی هونەریی لەبەر ڕۆشنایی قورئان وسوننەتدا.

٨. (الأسلام كما يتجلّى في كتاب الله) کتێبەکەی زیندانە و شەش حەوت بەرگ دەبێت.

- ئەوەندە بەسە بۆ شەرەفی کتێب کە خوا (جل شأنه) کەلامی خۆی خستۆتە دوو توێی کتێبێکەوە.

- کەسێک هەڵە و کەموکورتییەکانی زانایەک بکاتە پەرچ و بیانوی بەهـــرە وەرنەگرتن لە خێر و بێرو چاکەکانی، نا حاڵی و لێنـــەزانە! ئایا هیچ باخەوانێک درەختێک لە بنەوە دەبڕێ هەر لەبەرئەوەی چەند دانەیەک میوەی ڕزیو و بەکەڵک نەهاتووی پێوەیە؟!

- ئەم ژیانی دونیایە بریتییە لە هۆڵی تاقیکردنەوە، تەمەنەکەیشی بریتیە لە دەفتەرێک کە دراوەتە دەستی تا وەڵامەکانی لەسەر بنوسێ

- جەوهەری ڕاوێژ بریتیە لە کۆکردنەوەی شیلەی هەموو عەقڵ و دڵەکان بۆ پێکهێنانی شانەی پوختی بڕیارەکان.

- مسوڵمان سەلبی و داخراو نیە لە بەرامبەر فیکر و کەلتوری خەڵکی دیکەدا، بەڵام لاسایی کەرەوە و خۆ بەدەستەوە دەریش نیە.